# شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی

## مێژووی میرانی خانەدانی عوسمان و پادشایانی ئێران و توورانی هاوچەرخیان

وەرگێڕانی
سەلاحەددین ئاشتی

بەرگی دووەم

# شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی

## مێژووی

میرانی خانەدانی عوسمان و پادشایانی ئێران و توورانی هاوچەرخیان

## بەرگی دووەم

وەرگێڕاوی : سەلاحەددین ئاشتی

بنکەی ژین
سلێمانی ٢٠٠٧

٩٥٣.٠٧٦٩٦

ب ٩٨٧ بدليسى، شەرەف خان

شەرەفنامەی شەرەف خانی بدلیسی/ نووسینی شەرەف خانی بدلیسی؛ وەرگێڕانی سەلاحەددین ئاشتی.- سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٧.

ب٢ (٣٧١ل): ٢٥×١٧،٥ سم، ئیندێکس.

١- دەوڵەتی عوسمانی- مێژوو.

٢- ئێران- دەوڵەتی سەفەوی- مێژوو. ٣- ناونیشان

کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتایی پۆلێن و پێرستی ئامادە کردووە

سەرپەرستی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح

زنجیرە: ٧٢

ناوی کتێب: شەرەفنامەی شەرەف خانی بدلیسی

نووسەر: شەرەف خانی بدلیسی

وەرگێڕ: سەلاحەددین ئاشتی

تایپ و مۆنتاژ: پەروین پیرەبابی

ڕووبەرگ: قادر میرخان

خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید

تیراژ: ١٠٠٠

نرخ: ٦٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ١٠٠٧ی ساڵی ٢٠٠٧

شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

لەم سەرچاوەیەوە وەرگێڕدراوە: شرف خان بن شمس الدين بدليسى، به اهتمام ولاديمير ولييامينوف زرنوف، انتشارت اساطير- تهران، ١٣٣٧ شمسى.

لە بڵاوکراوەکانی

بنکەی ژین

بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی

هەرێمی کوردستان: سلێمانی، ئەندازیاران، گەڕەکی ١٠٥، کۆڵانی ٥، خانووی ٢٣

نۆرماڵ: ٣١٢٩١٠٢ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ یا ٠٧٧٠١٤٦٤٨٣٣ سانا: ١١٢٨٣٠٩

E. Mail: bnkaizhin@yahoo.com سنووقی پۆست: ١٤

# پێرست

# سەردەق

ئەوەی ڕاستی بێ شەرەفخانی بدلیسی، شەرەفنامەی لە دوو بەرگی سەربەخۆدا نووسیوە کە یەکەمیان سەبارەتە بە مێژووی مەزن و میرانی کوردستان و ئەوی دیکەیان سەربوردەی پادشایان و خونکارانی ئێران و تووڕانی لە خۆ گرتووە. بەڵام ڕوون و ئاشکرایە کە ماکە و هەوێنی سەرەکی کتێبەکە گێڕانەوەی دیرۆکی ژیانی دەسەڵاتدارانی کورد و میرنشینەکانی وڵاتی کوردەوارییە و باسی سوڵتانەکانی ڕۆم و عەجەمی بە پاشکۆ داناوە.

شەرەفخان زۆر زیرەکانە ئامانج و مەبەستی پێکاوە و بە وریایی بیر و هەستی خۆی دەربڕیوە و لە سەرەتای کتێبەکەی‌دا دەڵێ : «جا چونکە ئەوانەی لە بازاڕی وتاردا گەوهەرفرۆش و دوڕناسن و ئەو مێژووناسانەی کە تووتی ناو شەکەرستانی چیرۆک و دەنگوباسن، تا وێستا ڕێگەی خۆیان نەخستۆتە ناو کوردستانەوە و باسوخواسی گەڕناسان و سەرناسانی کوردیان بە سەر دەمی بنووس‌دا ڕانەبردووە و ئەو مێژووە پڕ لە شانازی و خۆشەی کە لە چێژ و بەرامەدا بەرەوبەری هەنگوین و گەزۆشە بەداخەوە لەوانەوە نەدیاری بووە و کەوتۆتە بەرپێوار و بە هیچ ئاوایەک دەست و دەمیان لێ نزیک نەکردووە، منی بێتین و توان و بێدەست و زوان کەوتمە سەر ئەو خەیاڵە کە بە ئەندازەی وزە و توانای خۆم، ئەوەندەی بۆم لوا لە باسوخواسی گەورەپیاوان و خاوەن‌ناوان و

سەردارانی کورد و کوردستان کۆ بکەمەوە و ئەوی لە تاریخی عەجەماندا خۆم دیتوومە و ئەوەی لە پیاوە پیرە ژیرەکانی ڕاست و بێدرۆوە بیستوومە بینووسمەوە و ناوی لێبنێم «شەرەفنامە». هەموو نیاز و ئاواتیشم هەر ئەمەیە کە خانەدانە گەورەکانی کوردستان ناویان لە ناو ناوان بمێنێ و لە ناونەچن.»[1]

ڕاستە شەرەفخان لە کۆشک و بارەگای پادشایانی سەفەویدا پەروەردە بووە و هەر لەوێ هەڵیداوە و گەشە و نەشەی کردووە، کەچی قەت وەکوو ئەوان لە بیری نەبردۆتەوە کە کوردە و زانیویەتی نیشتمانەکەی پێویستی بە دەست و قەڵەمی نەخشینە و خۆی لەم خۆبەخشینە نەدزیوەتەوە و نەکەوتۆتە شوێن پەندی «سەرم نایەشێ، پرێسکەی لێدەبەستم» و لە بەند و داوی «ئاگرەسووری لە خۆم دووری» خەلەستووە و پێوەی نەبووە. بەڵام زۆر بە پارێزەوە هەنگاوی ناوە و چەشنی سیاسەتوانێکی بەئەزموون شێر و ڕێوی بۆ کارەکەی هێناوەتەوە و ویستوویەتی خۆی لە زمانی ناحەزانی کورد و کەسانی دووڕاز و دووزمان کلا بکا. هەر کە بەشی دووەمی داگیرساندووە دیارە ئەم مەبەستەی وەبەرچاو گرتووە نەکا سوڵتانی عوسمانی پێی تووڕە بێ و بڵێ بۆچی مێژووی ئێمەت وەدوا داوە و ناوی پاشبارت لێناوە و کوردت لە پێشدا ڕاناوە؟ بۆیە لەڕێوە دوو بەڵگەی بەپێز و پتەوی نیشان داوە و پیاوانی زێدەزان و خوێندەوانی ڕچەی فام و فرەزانی لەسەر کردوونە شاهید و گوتوویەتی ئەوان چاک لە ڕێوشوێنی مێژوونووسان دەزانن و هەموو گومانێک لەم بارەوە دەبەنەوە پاش.

شەرەفخان بە ڕاشکاوی دەڵێ هەرشتێک کەوتە بنەبان و کۆتایی و بە پاشکۆ داندرا پایەی دانابەزێ و ئەوەتا سەرتۆپی تێکڕای پێغەمبەرانی خودا لە

---

[1] - شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی، وەرگێڕاوی هەژار، لاپەڕە ١٣-١٤، چاپی دووەم، چاپخانەی جەواهێری، تاران، ساڵی ١٩٨١.

دوای هەمووانەوەیە و سووڕەی تاقانەپەرستی کە بە کاکڵ یەکێک لە گەورەترین سووڕەتەکانی قورئانە لە دامێنێ خۆی دەنوێنێ و هیچیش نەقەوماوە.

خانی بدلیس ئەگەرچی پیاوێکی پشوودرێژە و بە پوختی شانی لێ‌شل کردووە، بەڵام چما بە وردی بڕوانین بۆمان دەردەکەوێ کە بوار و بەستێنی نووسینەوەی مێژووی میرانی بنەماڵەی عوسمان و پادشایانی ئێران و تووڕانی هاوچەرخیانی تیژ بڕیوە. ئەوەندەی خۆی بە بەرگی یەکەمەوە ماندوو کردووە، قەت هێندەی گوێ نەداوەتە بەرگی دووەم. جاری وایە قەڵەمبازی هاویشتووە و بە دابی کۆن زۆر شتی نەدرکاندووە و هەر ویستوویەتی سەروبەری کاری پێکبێ و دەمی خەنیمی پێ‌بەستووە و سەری بە هەڵە و پەلانانەوە نەئێشاندووە و شەش‌تەقەڵ و مانگەشەو پێداچووە. ئەوەندەی وشەی جوان و ڕەنگینی زمانی فارسی کە باسی کوردانی پێ‌ڕازاندۆتەوە و دیمەنی دلگری پێ‌بەدی هێناوە، هێندەی بۆ گێڕانەوەی ڕابردووی دەسەڵاتدارانی هەرەزل دەکار نەکردووە. تەنانەت خۆی لە دانانی سەرباسان پاراستووە و ساڵی وەکوو سەردێڕ دیاری کردوون و... .

ڕاستە شەرەفخان بەشی دووەمی بە دڵوداو نەنووسیوە و بە دەردی زێڕنۆف دەڵێ قازانجێکی واش بە مێژووی کورد ناگەیەنێ، بەڵام خۆ لە دە سەرانەوە خێری پێوەیە:

١- کورد لەگەڵ مێژووی دراوسێکانی ئاشنا دەکا.

٢- بیر و بۆچوونی مێژوونووسێکی کورد لەسەر ئاکار و هەڵوێستی فەرمانڕەوایانی سەفەوی و عوسمانی دەردەخا، هەرچەند زۆریشی پارێز کردبێ.

٣- ڕاگرتنی پارسەنگی نێوان سەفەوی و عوسمانی بە قەڵەمی نووسەرێکی کورد نیشان دەدا، چونکە وەختایەک کتێبەکەی نووسیوە لە ژێر داڵدە و

دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانیدا بووە، کەچی بە هیچ لایەکیدا نەشکاندۆتەوە.

٤- توانایی کوردێک دەسەلمێنێ بۆ نووسینی مێژووی غەواران، بە شێوەیەکی مەند و ماقووڵ و دوور لە ناخۆشەویستی و زمانچەپرەکی.

٥- دەسەڵاتدارانی ڕاستەقینەی تەواوی هەرێمەکە بە کوردستانیشەوە زەق دەکاتەوە کە فارس و تورکن.

٦- چۆنیەتی باری سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری و کەلتووری دوو وڵاتی ئێران و ڕۆم پێشان دەدا.

٧- سەنگ و بایی دەسەڵات و دەسەڵاتپەرستی و چۆنیەتی ڕوانگەی حاکمان لەسەر حکوومەت دەخاتەڕوو.

٨- دەوری ئایین و مەزەب و ڕەگەز بۆ هەڵگیرساندنی شەڕ و کێشە و نیازی پێچەوانە و چەوساندنەوەی نەتەوەکان ڕوون دەکاتەوە.

٩- باوبوونی نووسین بە فارسی لە نێو خوێندەوارانی ناوچە و مەڵبەندەکانی نافارسیشدا دەسەلمێنێ.

١٠- شەرەفنامە بە تەواوی دەبێتە کوردی و ئەم کەلێن و کەلەبەرە پڕ دەبێتەوە.

ئەم دەقەی باسی دەکرێ هەر ئەو بەشەیە کە زانای ڕووسی ڤێلادیمیر ڤێلادیمیرۆڤیچ ناسراو بە ڤێلییامینۆف زێرنۆف (١٨٣٠-١٩٠٤)، ساڵی ١٨٦٢ لە سەن پێترێزبوورگ (لێنینگراد) چاپی کردووە و ناوی بەرگی دووەمی بە سەرەوەیە. دەبێ لە بیرمان بێ کە زێرنۆف ساڵی ١٨٦٠ بەرگی یەکەمی هەر لەم شوێنە لە چاپ داوە و خزمەتێکی بەرچاوی بە کورد و گەلانی ناوچە کردووە و خۆشی ناوی تەواو پێی درەوشاوەتەوە.

بە گوتەی دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، پاش ئەم کارە بەنرخە شەرەفنامە بۆ سەر چەند زمانێکی وەک ڕووسی، ئاڵمانی، فەرەنسی، عەرەبی و

توركی وەرگێڕدراوە و بڵاوكراوەتەوە و بەجارێک مەسەلەی كوردناسیی كەوتۆتە سەر سكەی خۆی. هەڵبەت «مەلا مەحموودی بایەزیدی» بە هاندانی «ئەلێكساندر ژابا»ی كوردناسی ڕووسی، بۆ یەكەمجار ساڵی (١٨٥٨- ١٨٥٩) بەرگی یەكەمی شەرەفنامەی كردۆتە كوردی (لەهجەی باكووری)[١] و وەكوو دیارە ساڵی ١٩٨٦ بە وێنەچاپ دەسنووسەكەی لە ڕووسیا بڵاو كراوەتەوە.

هەروەک ئاشكرایە مامۆستا هەژاری نەمر ساڵی ١٩٦٩ ـ ١٩٧٠ سەرلەنوێ بەرگی یەكەمی شەرەفنامەی لە ماكەی سەرەكی فارسیڕا كردۆتەوە كوردی و ساڵی ١٩٧٣ كۆڕی زانیاری كورد لە ئێراق چاپی كردووە و ئەمجارەشیان بەرگی دووەم هەروا بە دەقنەشكاوی ماوەتەوە. ڕاستە مام هەژار بە پێنووسی خۆی لە تەركێن باسی بەرگی دووەمی نەكردووە، بەڵام هیچ بە لامەوە سەیر نیە. چونكە ئەو ڕەپ و ڕاست هەر بیری بە لای كێشەی كوردەوە بەند بووە و خۆی بە دەربەستی مێژووی تورک و تاژیک نەزانیوە. دەنا خۆ دواتر دەیتوانی بە تان و پۆی ڕەنگینی خۆماڵی ئەویش بنەخشێنێ و بیخاتە سەر كۆمای دوانەبڕاوی بەرهەمەكانی.

ئێستا هەرچۆنێک بێ كارەكە نەكراوە و پردی قیامەتیش نەپساوە و مرۆڤیش زۆرجاران ئازاد و سەرپشكە لەسەر كاران. بەڵام ئای لەم نەهامەتییەی بە سەر شانی مندا هات. دەڵێن خودا ئەگەر غەزەبی لە مێروولە گرت باڵی لێدەروێنێ. ئەمە ڕاست لە منی ڕوودەوە. كرێک بێ و هەژار سفت و ڕێک و لەبار تەنیبێتی و لە داری كردبێتەوە، پیاوم دەوێ بڵێ تێرادەچم و وای وێنە

---

١ - شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی، وەرگێڕاوی هەژار، لاپەڕە سەت و شێست هەتا سەت و حەفتا و شەش، چاپی دووەم، چاپخانەی جەواهێری، تاران، ساڵی ١٩٨١. «بەختەوەرانە ئەم ساڵ دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی سپیرێز سەرلەنوێ چاپی كردۆتەوە.»

لێهەڵدەگرمەوە کەس نەڵێ دەستێک نەیتەنیوە! لێرەدا پۆلێک وەجواب هاتن و گوتیان جا کاکە کێ دەڵێ دەکرێ وابێ، با وا نەبێ. نیزیکەی چل ساڵ بە سەر وەرگێڕانەکەی هەژاردا تێپەڕیوە و وەچە و بەرەی تازە پێگەیون و زۆریان هەر بە حاڵەحاڵ تێیدەگەن! گوتم ئەی ماڵی وێرانم، فارسی داروسێمان بۆ ئەوەی زمانەکەی لە بیر نەچێتەوە ئێستا لە زانکۆ دەبێ دەقی ڕەقوتەقی سەدان ساڵ لێرەوبەر بخوێنن، کەچی ئێمە زەمان و زمانی شەرەفنامەی هەژارمان پێ لە خۆمان دوورە!؟ نەوەی نوێ زمانێکی تازەی کوردی دەوێ یانی چی؟ بۆ زمان کارگە بە گرمەی هەوری بەهاران سەر وەدەربنێ؟! یان نەخێر زمانی زیندوو دارێکی پڕبەر و سێبەرە و هەموو وەرزان بەپێی پێویستی سەردەم توولەی تازە دەردەکا و سەرمابردە و کرمخواردە و داتوڵاوی تەمەن بەسەرچوو دەوەرێنێ و وەسەر خۆشی ناهێنێ و هەر دەڵێ شل و شەنگە نەمامی لاویم! نازانم چۆن لەو هەرا ناخۆشە ڕزگاریم بوو، بەڵام دەزانم مامۆستا جەعفەر کارەکەی بە ڕیشەوە کردم و شانەی پێهەڵگرتم.

ئەگەرچی هێندەش بە ڕووان تەنک نیم، بەڵام چونکە زۆرم جامینی مامۆستا جەعفەر دەوێ و ڕووی ویم دێشێ و بە قسەکانیشی قایل بووم و پێویستیی ڕاپەڕاندنی ئەرکەکەی پێ سەلماندم، گوتم هەرچی دەبێ با ببێ. خوتخوتە و دڵەڕاوکەی پێناوێ. خۆ ناچمە شەڕەدندووکە و ملبەملەی مامۆستا هەژار، بەڵکوو دەڕۆم ئاواتی نەدرکاوی شەرەفخان وەدیبێنم و ئەو لینگەی بە زمانی ناخۆیی ماوەتەوە بە کوردی بینوێنم. هەر نەبێ منیش خۆم بە وەچ و بژی ئەو شەنگەدارەی موکریان دەزانم کە هەژار شالکێتی و ئەگەر شتێکی لێزیاد نەکەم، چی لێکەم ناکەم... .

*＊＊＊*

وەکوو پێشتر ئاماژەم پێکرد شەرەفخان هێندەی سەرنج نەداوە و بە هەڵەچوونی پێوەدیارە ؛ بۆیە لە هەرجێیەکی خلیسکانێک رووی دابێ و پێمزانیبێ زیاترلە رووی مێژووی عوسمانی بە قەڵەمی « چارشیلی» لە خودی دەقەکەدا راستم کردۆتەوە یان بە ناچاری جووتەکەوانەم بە نیشانە بۆ داناوە یا پەراوێزم بۆ نووسیوە. هەڵبەت تەواوی ئەو کەوانانەی تەنیا نیشانەی پرسیاریان تێدایە کاری ڤیلیامینۆف زێرنۆفە.

لەم وەرگێڕانەدا شێوازی نووسینی شەرەفخانم پاراستووە و هەوڵم نەداوە خلخلە و پلپلەی زیادی پێوەهەڵاوەسم و بە مەیلی خۆم بیڕازێنمەوە. نێوەرۆکی هۆنراوەکانیش لە جێی خۆیانن، بەڵام چۆنی بۆم هەڵسووڕاوە هەڵمبەستوونەوە و گوێم نەداوەتە کێشی ماکەی سەرەکی. هەروەها خودی کتێبەکە لیزگەی ناوەکانی تێدا نیە و ئەویشم بۆ ڕێکخستووە. بەرامبەری ساڵەکانی کۆچی، ساڵی زایینیم داناوە. بەرامبەری ساڵەکانی کۆچی، ساڵی زایینیم داناوە. لە کۆتاییدا پڕ بە دڵ سپاسی خاتوو پەروین پیرەبابی دەکەم کە زۆر بە وردی کاری پیتچنینی ئەم بەرهەمەی ڕاپەڕاند.

سەلاحەددین ئاشتی

١٣٨٦/٧/١٥ - ٢٠٠٧/١٠/٧ مەهاباد

# پێشەکی

## بە ناوی خوداوەندی دەهندە و دلۆڤان

لێرەوە دەمهەوێ سەبارەت بە ژیان و بەسەرهاتی مەزنەمیرانی خاوەنشکۆی خانەدانی عوسمان و پادشاهانی ئێران و تووڕانی هاوچەرخیان بدوێم کە شانبەشانی ئەوان بە بەستێنی ڕۆژگاردا تێپەڕیون و لە چاخ و خولێکا پشوویان داوە. دیارە کۆمەڵی هۆزان و بلیمەتان و بیرووردان و ڕێبوارانی چاوتیژی باز و ڕێبازی ڕاستەڕێگەی هەڵکشانی فام و فرەزانی، خۆیان لە ڕەوشتی نووسەران و ڕێوشوێنی مێژوونووسان دەزانن و دەکەونە هەڵوێژنینی ڕووبەندی دوودڵی و لێیانسوورە کە گێڕانەوەی سەربوردەی پۆلی میران و خونکاران دەبێ بەپێی چۆنیەتی پاش و پێش و جەنگەی تێکبەزینی ڕۆژان و شەوانی ژیانیان بخرێتە بەرچاوان.

( ئەوەی ڕاستی بۆ هەر شتێک لە جێی خۆیدا جوانە) و بەڵگەی ڕوون و پتەو لەسەر ڕووڕاستی ئەم قسانە چۆنیەتی هەل و هەڵکەوتی ژین و ئاژوانی کاروانی ڕێکوپێک و تەرز و پیرۆزی سەرتۆپی هەڵبژاردەی ئادەمیزادان، واتە پێغەمبەری بەرزەجێی تاریفکراوە کە لە سایەسەری مبارەکی ئەوڕا فەرمانی ببە و بەدیهاتنی دنیا دەرکراوە و لەبەر پێوقەدەمی بەودمی وی جیهان تاجی

شادی و شادمانی لە سەرناوە، بەلام دەبینین کە بە ئـاخرین نێـردراوی خـودا داندراوە و پاشەنگی ڕاسپێراوانی یەزدانە و لەوێی جیٚوڕیٚ بۆ کراوەتەوە.

ئەوەنـدەی دنیـا هەیـە و دەمێنـێ بـە نـاوی پـاکی لـەبار دەنوێنـێ

بەڵگە و نیشانەیەکی دیکە بۆ شیکردنەوە و لـە پـەرەدان و سـەلماندنی باسەکەمان لە بابەت بەشی کۆتایی شەرەفنامەوە، سوورەی تاقانەپەرستییە کە کەوتۆتە دامێن و بنەبانی لاپەڕەکانی کتێبی پیرۆزی یەزدانی و هەمـووی بـە شان و باڵی پەروەردگار هەڵدەڵێ و گەلی مسوڵمان سەرلەبەری پێی لێنـاوە و ئۆباڵی بۆ ئەم بۆچوونە کێشاوە کە ئاوای سەردەق شکاوە و دەڵێ: «بێژە ئـەم خودایـە تاقـە.»[1] کەوایـە ئەگـەر بێتـوو بـە پاڵپـشتی ئـەم شایـەتـانـە نـووسراویلکـەی کرچوکاڵ و ناتەرزم سەبارەت بە میرانی بەشان و شـەوکەتی ئالی عوسمان بۆ داکووژێ، دیسانیش خێروبێری پێوەیە. چونکە دەشزانم کـە پۆلێک لە شەنگەسوارانی قەڵەمنەخشین و زۆرزان و خۆشڕاوێـژ و وردەکـاری هەرێمی وتە و نـووسینی لێک و لـووس و پـاراو، کـلاوی حـەوتڕەنگیلـەی میرانەیان بە تیلاگی سەریانەوە ناوە و ئەسپی خۆیان لەم مەیدانەدا تاو داوە. ئەم ژیرانە بە نووکـەنێزەی قەڵـەمان لـە دەروازەی قـەلای وریایـی وەژوور کەوتوون و خەت و کووزیان کێشاوە و چۆن جوانە ئاوا هەڵکەوت و ڕووداوەکانی هەڕەتی فەرمانڕەوایەتی ئەو سوڵتانە دادپەروەرانەیان بێتەکولۆ خستۆتە پاڵ یەکتر و لەوپەڕی دڵگری و ناسکیدا بە هۆنراوە و پەخشان ڕازاندوویاننـەوە و دوڕ و گەوهەری نووسینیان پێ جەلـلـە کردوون، جا بۆیە چۆن باشـە خـودای گەورە ئاوایان چاکە بداتەوە.

---

١- «قُل هوالله احد»، قورئانی پیرۆز، سوورەی ئیخلاس، ئایەی یەکەم.

بەڵام لەبەروەی منی هەژاری بەستەزمان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە ڕیزی هاوڕکێفانی میری مەزنەوەجاخ و لە نێو کۆڕی یارانی تایبەت و نیزیکی خاوەنشکۆدا جێگا و ڕێگام بۆ کرابۆوە و لە ژێر تیشکەی ڕووناکیدەری دەسەڵاتیدا دەهاتم و دەچووم، ویستم ئەگەر بەخت یار بێ، هەر لە ڕۆژی یەکەمی هاتنە سەر کاری ئەم بنەماڵە پایەبەرزەوە چی قەوماوە و ڕابردووی پادشایانی ئێران و تووارانی هاوسەردەمیان دەگرێتەوە، هەتا ئەم ڕۆژگارە خۆشفەڕە بە کورتی و بە هەڵەداوان، لەسەر پێوشوێنی ڕچەی نەپساوەی مانگ و سالان بە سەرگوڵخۆری تێپەڕم و شەرەفنامەی پێ تەواو کەم.

میری ئێمە کە سوڵتان محەممەدخانە[1]، هیوادارم خودا ڕاوەستاوی کا و دەس دەبن باڵی بگرێ و سێبەری بەزیی و بەخشینی لەسەر کۆمەڵانی خەڵک کەم نەبێ. ئەم سوڵتانە بەرزەشانە پۆپەی کۆشکی دەسەڵاتی گەیوەتە پەرپەرۆچکەی گومبەزی ئاسمان و دەترووسکێتەوە و بە دابی گەردوون بەربلاو و هەراوە. بۆ شۆق و شەبەق شانی لە شانی هەسارەی بارام داوە و لە کر و نەخشی قەڵەمڕەنگینیدا تایە بۆ ئەستێرەی زاوە. قەیسەری هەرەباڵایە و تاقانەی هەموو دنیایە و میری‌میرانی سەرۆک و مەزن و شاهانی ڕۆم و عەرەب و عەجەمە. خۆرەتاوی سەر کورسی عاسمانی پادشایەتی و جیهانداری و مانگی نێو سەراپەردەی سام و شکۆیە. بە زەبری دەست و مستی دنیا دادەگرێ و دەیرازێنێتەوە. دوژمن دەخاتە بەندەوە و ڕوو بکاتە هەر قوڵێک سەری

---

[1] مەبەستی لە سوڵتان محەممەدخانی سێهەم، کوڕی سوڵتان مرادی سێهەم، سێزدەمین سوڵتانی عوسمانییە. ساڵی ١٠٠٣ تا ١٠١٢ی کۆچی (١٥٩٤-١٦٠٣ی زایینی) پادشایەتی کردووە و ٣٨ ساڵ ژیاوە.

پێدەچەمێنێ. خاوەنی دوو دەریا[1] و دوو بەژانە[2] و غولام و خزمەتکاری مەکە و مەدینانە.

میرێکە زەمان سەری وەبەرهێناوە ئاسۆ بە پەڕ و باڵی ئەوی ڕازاوە
هەرچەندی کە خۆر و مانگ دەدرەوشن واقیان لە قوبەیٚ بەرزی ئەوا ورماوە

پادشایەکە خاشەی ڕێوشوێنی بتان دەکێشێ و ڕێگا بۆ پەرەی دینی ئیسلام خۆش دەکا و برەو دەدا بە زانستی شەریعەت و شوێنگێڕانی ڕچەی پێغەمبەر سەردەخا. بۆ زانایی و ئاکارچاکی لە هەمووانی تێپەڕاندووە و دەستی داوەتە ڕێکخستنی نزا و پاڕانەوە و پەسنٚدانی یەزدانی. خاوەن شەوکەتێکی وایە کە کەس تای ناکا و شەقڵی ئەم ئایەتە مبارەکەی بە کار و کردارییەوە دیارە کە درکاندوویەتی: «بەڕاستی خودا فەرمان دەدا بە دادەوانی و چاکە و دڵاوایی.»[3]
بۆیە دەمهەوێ لە ڕووی ئەمەگ و پێزانینەوە وەبەر سایەچەوری خۆم هەڵبخوێنم و بە دۆعای بەخێر بیلاوێنمەوە. دنەی بیری کولم داوە بکەوێتە تەکوز کردن و هەڵوەژاردنی پرزەوپاڵ و پاڵاوتنی ڕووداوەکانی ڕۆژگار و قەڵەمی کۆڵی نووسینم بۆ خستنەڕووی مەبەستی تازەی نەبیستراو هەڵسووڕاندووە. هەرچەندە ئاگری سرشتی تیژ لە بەستەڵەکی سەرساردیدا ڕۆمرکابوو، دیسانیش هەڵگڕایەوە. ئەگەرچی بۆ ڕاپەڕاندنی کارێکی ئاوا قورس دەبوو بڵند

---

١- هەردک دەریای ڕۆم و فارس کە یەکتر دەگرنەوە. دەریای ڕەش و سپی. وشەدانی دێهخودا، چاپی دووەمی خولی نوێ، ب ٣ لاپەرە ٤٣٩٢، ساڵی ١٣٧٧ی هەتاوی/١٩٩٨ی زایینی، تاران).

٢ - ئەو هەرێمانەی کە لە دەورەی دەریای ڕەش و سپی هالاون. (دێهخودا، ب٣، ل٤٦٩٢. دوو ویشکانی).

٣- « ان الله یامر بالعدل و الاحسان »، قورئانی پیرۆز، سوورەی نەحل، ئایەی ٩٠.

تێراچووبام و نەرمەهەنگاوی بەبڕشتم هاویشتبا. دەبوو هەموو کەلێن و کولێنێکم ورد پشکنیبا و پەردەم لە ڕووی زانست و زانیاری ورد و باریک داماڵیبا و چی نەهێنییە هەڵمهێنابانەوە. دەبوو باس‌وخواسم وەدوا نەدابان و بە پرسیاران زۆر شتم ڕوون کردبانەوە و مەیدانی ئەزموونم بە سواری ئەسپی خۆشاژۆی پتەوی تێگەیشتن بڕیبا، چونکە دەزانم پادشایەکی پشتیوانم لە پشتە و هەمیشە چاوی بە سەرمەوەیە. جا بۆیە وەختایەک لێرەدا ئاسکی سیاخاڵی قەڵەم بە دەم ئەم خەیاڵانەوە پزووی نێوکی ترازا و بەرامەی هەموو لایەکی گرتەوە و چەشنی شەمامەی بۆنخۆش بەرلووتی ئامانجی ئەنگاوت و عەتری پێدا پژاند، بۆخۆم بە خۆم گوت وا باشە بنووس وەک خدری زیندە بە چاوەی ژینێ دانووسێ و لە ڕەشاوی مەرەکەو ئاوی هەرمان بخواتەوە و چۆنیەتی نەقڵ و نەزیلە و چیرۆکان پتر بە جلوبەرگی ساکارەوە بخاتە بەر دیدەی وردبینان. خامە ویستی کە کاکڵ و پوختەی مەبەست و سێحری حەڵاڵ بە کۆمەڵێک خوازەی سەیر و باسی سروشت و ئەوین و وێنواندنی سەمەرە نەشێوێ و لێڵ دانەگیرێ و بە تلتەوتاڵ دانەپۆشرێ.

من بە سیلەچاوی خودا دەنازم و ئومێدەوارم ئەوەی دەینووسم ڕووی مەجلیسی هەبێ و گوڵی ڕوومەت و ڕوخساری خۆش‌خەت‌وخاڵی دڵگری ئەم ڕووپەڕانە وا بدرەوشێتەوە کە وەکوو گزینگی هەتاوی دنیاداگر برووقەی بێ و لە چاوی پیسی هەموو چاوچڵێ بە دوور بێ.

⁂

## باسی بنه و بنەچەکەی میرانی خانەدانی عوسمان

بە ئاوڕێکی ئەمەگدارانە لە تۆرمەی پایەبەرزی خانەدانی عوسمان و هۆی پێچانەوەی کۆچ و باریان لە ناوچەی خوراسان و ئەوبەرڕووبارەوە بۆ خاکی ڕۆم سەری قسان دادەگیرسێنم. با کەسانی زیرەکی مەلەوانی بینەکێشی دەلیای توێژینەوە و لۆتکەوانانی بەحری بیری ترووسکەداری وردەکاری لێیان ڕوون بێتەوە کە بەپێی نووسینی نووسەران و ئەوانەی ژیان و بەسەرهاتی ڕابردووان دەگێڕنەوە و خودای گەورە بیانبەخشێ، وامان بۆ دەردەکەوێ کە ڕەچەڵاکی ڕەسەنداری ئەم بنەماڵە بەرزەشانە دەگاتەوە سوڵتان عوسمانی غازی.

پێشەنگی خۆشڕاوێژان و سەرتۆپی شیرنزمانانی زەمان قازی ئەحمەدی غەففاری قەزوێنی لە دەسنووسەکانی «جیهانئارا»دا سوڵتان عوسمان بە نەوە و نەتیژەی «ئیسرائیل»ی کوڕی سەلجووق دادەنێ و هەموو مامۆستایان وەجاخیان دەبەنەوە سەر زنجیرەی سەلجووقییەکان. تێکڕای زانایانی دنیا و تەواوی خوێندەوارانی لەزەبری بنیادەم لەسەر ئەم باوەڕەن هەتا ئەمڕۆ کە ڕۆژی چوارشەممۆی کلکەی مانگی قوربانی ساڵی ١٠٠٥ی کۆچییە، تا ساڵی ٦٨٩ بەرەودوا کە سوڵتان عوسمانی غازی لە شارۆکەی قەرەحەساری ساحێبی خودبەی بە ناوی ناوداری خۆی خوێندۆتەوە دەبێتە ٣١٦ ساڵ. یانی ماوەی ئەم قەدەر عەیامەیە کە سوورەداڵی خۆشفەڕی دەسەڵات و بازی بەرزەفڕی حوکمات لەم خانەدانە بڵیندئاواتەدا هێلانەی خۆش کردووە و باڵی ئەنگاتووە. لەو

دەمی‌ڕا ڕۆژ بە ڕۆژ و دەم بە دەم مەزنایەتی و شەوکەتی ئەم خانەدانە نەمرە بەرەو گەشە و نەشەیە و ئاواتەخوازم کە تا ڕۆژی ڕابوونەوە قافڵەی بێوێنەیان نەبڕێتەوە.

بێنەدی پاڕانەوەی هەرچی ئەویندارە خودا

زنجیرەی خانەدانی پلەبەرزی عوسمان بنج و بناوانیان دەچێتەوە سەر یافسی کوڕی نووح، دروودی بێسنووری خودای لەسەر بێ و ئەوانەی دیار و بەرچاون بریتین لە: سوڵتان محەممەدخان کوڕی سوڵتان مرادخان کوڕی سوڵتان سەلیمخان کوڕی سوڵتان سولەیمانخان کوڕی سوڵتان سەلیم کوڕی سوڵتان بایەزید کوڕی سوڵتان محەممەد کوڕی سوڵتان مراد کوڕی سوڵتان محەممەد کوڕی ئیلدروم بایەزید کوڕی سوڵتان مراد کوڕی ئوورخان کوڕی سوڵتان عوسمانی غازی کوڕی ئەرتۆغرۆڵ کوڕی شاسولەیمان کوڕی ئەلبقیا کوڕی قزڵبوغا کوڕی بای‌تەیموور کوڕی قۆتلوغ کوڕی تۆغان کوڕی قەسوون کوڕی شافوور کوڕی بۆڵغای کوڕی بایسونقور کوڕی تۆقمتوور کوڕی بایسووق کوڕی حەمدوور کوڕی باقی‌ئاغا کوڕی کووک‌ئەلب کوڕی ئۆغووزخان کوڕی قەراخان کە ئەویش بە ١٤٥ پشتان دەگاتەوە سەر یافسی کوڕی نووح، درووود و سەلام پایەندازی بێ.

مەبەست لە هێنانەگۆڕی ئەم باسە ڕوون کردنەوە و دەرخستنی چۆنیەتی لانگۆڕکە و هاتنی ئەم دەسەڵاتدارانەیە لە ناوچەی خوراسان و ئەوبەرڕووبارەوە بۆ وڵاتی ڕۆم. یانی وەختایەک ساڵی ٦١١ی کۆچی (١٢١٤ی زایینی) لەشکری سەروەشێنی زیانیدەری چەنگیزخان کەڵەشاخی دنیا خرابوونی وەتووڕە هێنا و کوڵەژەماری کەڵپنەی ئاژاوە و تێکەوڵێکە ئەوبەرڕووبار و خوراسانی تێکوەردا و چارەڕەشی و ماڵوێرانی هەموو لایەکی گرتەوە، ئەم میرەماڵەش پەرەوازە بوون.

نووسەری کتێبی «حەبیبوسسییەر» دەڵێ شاری مەروی زێدی باب و کاڵی ئەم مەزنەماڵە کوشتارێکی وای تێدا کراوە کە سەید عیززەددین‌ناوێک وێڕای چەند نووسندان سێزدە شەو و ڕۆژان کەوتوونە بژاردنی کەلاکی کوژراوان. لە خودی نێو شاری مەرودا میلیۆنێک و سێسەدهەزاری بڕێک کەم پشووبڕ کراون. سەید و یارانی لە حەژمەتان بۆچرووک و بۆسۆیان لە مێشک و هەناوی هەستاوە و ئەم چوارینەی «خەییام»یان بە زار و زمانی‌دا هاتووە:

سەرخۆش دڵی نایە پیاڵەیەک بشکێنێ،
هەر تۆزێ لەبار و ڕێکوپێک بنوێنێ.
خوا ئەو هەموو لاشە ناسک و لاوچاکە
بۆچ ڕێکی ئەخا و لە داخی کێی ئەڕزێنێ؟![1]

هەروەها قەدیمی گێڕاویانەتەوە کە شاری بەلخ ئەوەندە گەورە و ئاوەدان بووە کە بە دێهاتی دەوروبەرییەوە لە ١٢٠٠ جێ نوێژی هەینی کراوە و ١٣٠٠ گەرماوی خۆش و بەرفرەوان لەو پەڕەوپەڕی هەڵخراوە. جا لەو پێیە بڕوانی دەزانی ڕادەی جەماوەری هەر ژاوەی هاتووە، کەچی هەچی ئادەمیزادە بەرەو هەرێمی نەمان هەڵیداشتوون و بە زەبری شیری تیژی دمنەپارێز لە خۆڵی نەمانی وەرداون. خۆشەویستێک لەم بارەوە گوتوویەتی:

بەلخی تەخت کرد وەکوو لەپی دەست
کۆشک و سەرسەرای لێکردە پێپەست

---

١- خەییامی هەژارانە، چوارینە فارسی و کوردییەکانی خەییام و هەژار، لێکۆڵینەوەی سەلاحەددین ئاشتی، لاپەڕە ٢٥٥، چاپی دووەم ٢٠٠٤، سلێمانی، چاپەمەنی شڤان.

لە شاری خارەزم سەرەڕای هەڵاواردنی سەدهەزار سنعاتکار و خاوەنپیشە و بە یەخسیر بردنی ژنانی جحێڵ و منداڵان، خەڵکەکەی دیکەیان دابەشیوە و کوشتوویانن. دەڵێن بکوژانی پەنجە بە خوێن کە ژمارەیان لە سەدهەزاری تێپەڕیبوو هەرکامەی بیست و چوار سەری ئادەمیزادی پێبڕابوو.

لە شاری نەیشابووردا ماوەی دوازدە ڕۆژان تەرمی کوژراوانیان ژماردن و بێجگە لە ژن و زارۆکان، ١٧٤٧٠٠٠ کەس شەلاڵی خوێن و جوانەوی مەرگ کرابوون. شێخ عەتتاریش گۆڕی پاکی پڕ بێ لە نوور، لەوێ خۆشاوی شەهادەتی بە سەرییەوە نا و قومی لێدا.

بە کورت و کرمانجی ڕۆژایەک دەرد و مەینەتی ئەم کارەساتانە باڵی ڕەشیان بە سەر خوراسان کێشا، شاسولەیمانی کوڕی ئەلبقیا کە لە ڕیزی مەزن و بەگلەرانی سوڵتان محەممەدی خارەزمشادا دەدرەوشا و لەبری وی بە سەر ناوچەکانی ماخانی مەرو ڕادەگەیشت و دەیپاراست، هەرکە دیتی کەلەبەر و دابڕان کەوتۆتە نێو جەللەی سەرکردەکان و قۆشەنچییانی خارەزمشا، وێڕای پەنجاهەزار ماڵ و خێزانی سەرپاکی تیرە و هۆزانی تورکان لە مەرووەوە بەرەو ئازەربایجان کۆچی لێنا و بەپێی ئایەتی «ئەگەر خودا ئاوارەیی لەسەر ئەوان نەنووسیبا، هەر لە دنیا تووشی ئازاری دەکردن»،[1] جوولایەوە و هەوارەوهەوار خێڵ و خێلاتی گەیاندە خاکی ئەرمەنییان و لە شاری ئەخلاتی جەرگەی حوکماتی هەرێمەکە بنەی داکوتا. ئەو ناوچەیە کە دەتگوت باغی بەهەشتە ئاڵای سەرکەوتننیشانی لێهەڵدا و کردی بە ناوەندی دەسەلاتی. پاش ماوەیەک بە ئامانجی چوونە شەڕی پیرۆز لەگەڵ کافرانی چەپەڵکار بەرەو ئەلبۆستان جمی و

---

١- « و لولا ان کتب الله علیهم الجلاء لعذبهم فی‌الدنیا »، قورئانی پیرۆز، سوورەی حەشر، ئایەی ٣، لاپەڕە ٥٤٥، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار، چاپی یەکەم، ساڵی ١٣٧٩ی هەتاوی (٢٠٠٠ی زایینی)، تاران، چاپەمەنی «ئیحسان» و «تازەنیگا».

لە مەودای ڕێیەدا وەختایەک گەیشتە لێواری ڕووباری فورات و لە نیزیک قەڵای جەعبەری سەر بە حەلەب ڕکێفی بەرەو ئاو کوتا، هەڵدێرا و خنکا و تەرمەکەی هاتە کەنارێ و هەڵیانگرتەوە و هەر لەوێ ناشتیان.

شاسولەیمان چوار کوڕی لە پاش بەجێما: ئەرتۆغرۆڵ، سونقور، گۆندوغدی و دوندار. ئەم چوارانە لەسەر وەی ڕوو بکەنە کامەلا باشترە تووشی دمەقڕە و ناکۆکی هاتن و دەستیان لێکتر بەردا و خێڵ دابڕانی تێکەوت. ئەرتۆغرۆڵ وێڕای برایەکی و تیرە و تایفەکانی سەر بە خۆی بە نیازی چوونە خەزای کافرانی ملهوڕ بەرەو ڕۆم ڕۆیی. دوو براکەی دیکە لەگەڵ خزم و عێلان بە مەبەستی گەڕانەوە نیشتمانی خۆیان سەری ڕکێفیان وەسووڕاند و بەرەودوا بوونەوە.

لەو سەروبەندەدا سوڵتان عەلائەددین کەیقوباد (؟) کوڕی فەرامەرز... کوڕی کەیخوسرەو... کوڕی قلیج ئەرسەلان کوڕی سولەیمان کوڕی قوتلەمێش کوڕی ئیسرائیل کوڕی سەلجووق پادشای ڕۆم بوو. کاتێک لە قوونییە و بە گێڕانەوەیەک لە ئاماسییە ئەرتۆغرۆڵ گەیشتە خزمەت سوڵتان عەلائەددین و لە تەمای خۆیانی ئاگادار کردەوە، سوڵتان بە مەبەستی دامەزراندن و نیشتەجێ کردنیان لەسەر سنووری لادینانی تەکوور بەلجەک، تومانج تاغی وەک لەوەڕگە و هاوینەهەوار بۆ دیاری کردن. ماوەیەکی زۆر ئەرتۆغرۆڵ و خێڵ و حەشیمەتی بەرفەرمانی لەسەر کەوشەنی بێباوەڕانی تەکوور بەلجەک شەڕی ئەو مارزانەیان دەکرد و بە گژیاندا دەچوون و بەرەگەیان لێبڕیبوونەوە.

یەکێک لە سەرکردە مەزنەکانی ئەرتۆغرۆڵ، بۆزاقلوو بوو کە لەبەر کەسوکار و دەستوپێوەندی زۆر و زەوەند و سام و شەوکەتی لە تیرە و تایفەکانی دیکەی تێپەڕاندبوو. بۆزاقلوو حەوت کوڕی هەبوو: یوورەگیر (ئوورەگیر)، قەسوون، وەرسوق، قەرەعیسا، ئوزار، کۆندووز و قوشتەموور.

منی ڕەشکەرەوەی ئەم لاپەڕانە بە چاوی خۆم دەقی فەرمانی بە فارسی نووسراوی میرم دیتووە کە بۆ عوسمان‌بەگ نووسراوە و گەلێکی بە شان و پیلی هەڵدراوە. سوڵتان عوسمان بە یەکێک لە چاونەترسانی وڵات و سەردەم داندراوە و ئاوا گوتراوە: «هەر لە کۆنەوە بە بنەماڵە تێکەڵاوی خانەدانی بەرزەجێمان بوون و باب و باپیرانی وێڕای ئەژدادی گەورەگەورەمان لە توورانەوە هاتوونە ئێران و لە ئێرانەوە بەرەو ئەخلات و ئازەربایجان کشاون. ئێمەش لەبەر سەرڕاستی و دەروون پاکی و خوێندنەوەیان لە دۆستایەتی‌دا، ئەوە لە نێو لیزگەی نیزیکان‌دا پلەی دەسەڵاتی پێهەڵادەبەین و سەری بەرز دەکەینەوە. مەڵبەندی ئێزنیق (نیکیا) و قەرەحەسارمان خستە سەر تومانج تاغی و سوکوتجووک کە بیانخاتە ژێر ڕکێفی و چوارسەد دەستمان جلوبەرگی شەڕکەران لە بارگای مبارەکەوە باربوو کردووە کە بە سەر غەزاکەرانا دابەشیان بکا و لەگەڵ مێرخاسانی دەسکەرەوەی ڕۆئەستوور لە بەرەنگاری و شەڕی پیرۆز ڕانەوەستێ و دانەمێنێ... .» بەم شێوەیە سوڵتان عوسمان ساڵی ٦٨٨ک (١٢٨٩ی ز) سەربەخۆیی تەواوی دراوەتێ و دەسەڵاتی ناوچەی...[١] خراوەتە سەر جەغزی حوکماتی.

جا خودا پشتیوان بێ، ژینامەی بەڕێزیان و توخم و تۆرەمە و نەوە و نەتیژە گەورەکانی لە شوێنی خۆی‌دا و بەپێی تێکخرانی ساڵان دەنووسرێن و دەخرێنە بەرچاوان.

ꕥꕥꕥ

١- ئینۆنۆ و ئیسکی‌شار. (مێژووی عوسمانی، ئیسماعیل حەققی ئووزوون چارشی‌لی، وەرگێڕاوی دوکتۆر ئیرەج نەوبەخت، بەرگی یەکەم، ل١٢٧، چاپی یەکەم، ناوەندی بلاوکردنەوەی کەیهان، ساڵی ١٣٦٨ی هەتاوی (١٩٨٩ی ز)، تاران).

## باسی بەسەرهاتی میرانی خانەدانی عوسمان و پادشایانی ئێران و تووران (١٢٩٠ ـ ١٥٩٧)

### ساڵی ٦٨٩ / ١٢٩٠

لەم ساڵە موبارەکەدا کە سەرەتای چوونە سەر دەسەڵاتی ئەم وەجاغە هەمیشە ڕووناک و بەختەوەرەیە، سوڵتان عوسمانی غازی بە هێزی شان و باهۆ و بڕشتی شمشێری ئاگرینی هەورەبریسکانەی قەڵای بیلەجەک و یارحەسار (یەنیشار) و ئینەگۆل و یوندحەساری و یەنگی شاری گرت. پاشان بەرەو قەڵات و ناوچەی قەرەحەساری ساحێبی بزووت و بە دەستی زۆر و شانەچرکە کافرانی تەکووری وەدەرنان. لە ڕۆژێک لە ڕۆژانی هەینیدا مامۆستا مەلا «توورسوون»ناوێکی تورکمان خوتبەی بە ناوی بەرزەناوی سوڵتان عوسمان خوێندۆتەوە و پۆپەی میحراب و مینبەر و ڕووکاری سکەی زێڕ و زێو بە نازناوی پیرۆزی ڕازاونەوە. هەر لە کۆتایی ئەم ساڵەدا سوڵتان عوسمان کچی دەدە باڵی (ئاتە باڵی) خواست کە یەکێک بوو لە پیاوماقووڵانی سەردەمی خۆی و بەپێی یاسا و ڕێسای دینی ئیسلام مارەی کرد. یەکی دیکە لە ڕووداوە باشەکانی ئەم ساڵە پەلاماردان و گرتنی قەڵای بیلەجەک بوو. حاکمی یارحەسار «نیلووفەر» (هولووفرا)ی کچی دابوو بە تەکووری حوکمداری بیلجەک و ڕاست ئەو شەوەی

بووک گوێزابۆوە و پەردووی بۆ ڕازابۆوە، قەڵا دەستی بە سەرداگیرا و حاکم و دەستوپێوەندەکانی کوژران و نیلووفەر خاتوونیش یەخسیر کرا و بە بارگە و بنە و گیازەوە هێنایان. میر هەر لەڕێوە دای بە سوڵتان ئوورخانی کوڕی بەختیاری خۆی.

## ساڵی ٦٩٠ / ١٢٩١

لە ڕۆژی پێنجی مانگی ڕەبیعی یەکەمی ئەم ساڵەدا ئەرغوونخان کوڕی تەگوودار ئۆغلان(؟)[١] کوڕی ئەباقای‌خان کوڕی هۆلاکۆخان کوڕی توولی‌خان کوڕی چەنگیزخان کە پادشای ئێران بوو لە قەرەباغی ئەرران کۆچی‌دوایی کرد.

شەشسەد و نەوەد لە کۆچی نەبی دەڕوا بە بەردا
ڕەبیعی یەکەم لە تازەبەهار پێنجی وەبەردا
دانی بەیانی و کاتی بەرچایی لە باخچە ئەرغوون
فریشتەی مردن خەڵاتی مەرگی کێشا بە سەردا

لە مانگی ڕەجەبدا «گیخاتوو»ی برای کە حاکمی وڵاتی ڕۆم بوو وەختایەک بەم هەواڵەی زانی، بە تکای میران و بەگلەران خێرایەکی بەرەو ئازەربایجان ئەسپی لینگ دا. دەستەیەک لە سەرۆکان و سەرکردەکان بە مەیلی خۆیان سەریان وەبەرهێنا و تاقمێکیش بە نابەدڵی و ناچاری متەقیان نەکرد و کز دامان. پۆلێک لە مەزنەمیرانی گرت و چۆڵەپێچی کردن و وەبەر شووڵانی دان و پلە و پایەی لێ‌ئەستاندنەوە و بە کەسی دیکەی بەخشین. مزگێنیدەرانی ناردنە

---

١- ئەرغوونخان برای تەگووداره و هەردووکیان کوڕی ئەباقای‌خانن. (وشەدانی دێهخودا، بەرگی ٢، ل١٨٧٤).

ئەوپەڕوپەڕی وڵات و کۆمەڵانی خەڵکی دڵخۆش کرد بە چاکەکاری و دادپەروەری و لابردنی زوڵم و زۆرەملی.

لەم جەنگەدا کۆمەڵێک هەواڵی ناخۆشی لە لای ڕۆمەوە بە گوێی ئاشنا کرا و سەکتوور نۆیانی لە جێگای خۆی دانا و بەرەو ڕۆم بزووت. کە میر سەر و سۆراغی لەبەر چاوان ون بوو، دەستەیەک لە بەگلەران و شازادان خەیاڵی نالەبار لە دەروونیاندا ورووژا و ڕوویان کردە کەتن و پیلانگێڕی و نانەوەی ئاژاوە.

##ساڵی ٦٩١ / ١٢٩١ـ٩٢

گیخاتوو کە ساڵی ڕابردوو بەرەو ڕۆم فڕیبوو، سەرەتای ئەم ساڵە بە سەرکەوتوویی لەو سەفەرەی گەڕایەوە. سەرلەنوێ پرشنگی دەسەڵاتی هاویشتەوە سەر ڕاپەڕاندنی کاروبارە گرینگ و گەورەکانی فەرمانڕەوایەتی و بەپێچەوانەی چاوەڕوانکراو، تەواوی ئەوانەی ناحەزی بوون و دەیانبوغزاند دەستی بە سەری داهێنان و چاکەی لەگەڵ کردن.

ئەقبووقا (ئاقبووقا) بەهادوری کردە سەرهێزی هێزەکانی و جڵەوی کاروباری وەزارەتی دایە دەستی لێوەشاوەی خواجە سەدرەددین ئەحمەدی خالیدی لە تۆرەمەی قازییەکانی هەرێمی زەنجان و پایە و نازناوی «سەدری جیهان» (مەزنەوەزیر)ی بە باڵای بڕی. خواجە قوتبەددین ئەحمەدی براشی بردە سەر پلەی سەرۆکی قازییەکان و سەرپەرستیی وەقفەکانی قەڵەمڕەوی ژێر دەسەڵاتی خەڵات کرد.

بە قسەی تێکڕای مێژوونووسان هیچکام لە کوڕانی هۆلاکۆخان بە قەدرایە گیخاتوو سەخی نەبوون. دەستی لە بەخشین نەدەگێڕایەوە و لە ماوەیەکی کورتا تەواوی پاشەکەوت و خەزێنەکانی باب و کاڵ و براکانی بە سەر پۆلی شازادە و خاتوون و سەرکردانا دابەشی. وەختایەک چاوی بە زێڕ و جەواهێراتی میرانی پێشوو کەوت کە چەشنی گەوهەری دڵ لە گەنجخانەی سینەدا دەیانپاراستن،

هەمووی بە سەر ژنان و کچانیدا داروپەخش کرد و گوتی ئەو کۆما زێڕ و زەمەبەرانە لەوان جوانە کە خۆی پێبڕازێننەوە، ئەگینا چ لە خەزنەدا حەشار بدرێ و چ لە قووڵایی دەریا و ناخی کانگادا بێ، هەر یەکە... چۆنیەتی بەسەرهاتی لە ساڵانی داهاتوودا ڕوون دەبێتەوە.

## ساڵی ٦٩٢ / ١٢٩٢ـ٩٣

لەم ساڵەدا خواجە سەدرەددینی مەزنەوەزیری گیخاتووخان دەستی سەرۆک و سەردارانی لە کاروباری وڵاتا کورت کردەوە و بێوەبەرچاو گرتنی خێر و قازانجی ئەوان کارە قورسەکانی نیشتمان و چی لە بەرژەوەندی لەشکرچی و جەماوەری ڕەمەکییە ڕایدەپەڕاند و سەر و بەری وێکدێنا. هەر بۆیە حەسەن و تایجوو دوو کەس لە گەورەسەردارانی گیخاتوو، تاقمێک لە پیاوماقووڵانی تەورێزیان دنەدا تا بە خزمەت سوڵتانی ڕابگەیەنن کە مەزنەوەزیر داهات و پیتاکی وڵات بە کەیفی خۆی تەخشانپەخشان دەکا و گوێ ناداتە پێڕاگەیشتنی لەشکر و کارەکان چەوت و چەوێڵ دەنوێنن.

گیخاتوو گوێی نەدایە ئەو پڕوپووچانە و گەرماوگەرم فەرمانێکی پیرۆزی بۆ نووسی و لە ڕووباری «ئاموویە»ڕا هەتا هەرێمی خاکی میسر هەمووی خستە بەردەستی وەزیری ژیر و ژێهاتی و هەوساری هەڵسووڕاندنی نەیارانی ئەسپاردە چنگی بەهێز و بڕستی. مەزنەوەزیر ڕایەخی میری ڕامووسی و شاقەلی بە لادا کرد و لە کۆڕەکە وەدەرکەوت و ئەو تاقمەی خستنە نێو زنجیر و سندمەوە و پاش چەند ڕۆژێک خەنیمانی جزاند.

## ساڵی ٦٩٣ / ١٢٩٣ـ ٩٤

لە مەودای ئەم ساڵەدا دەسبڵاوی و بێروبەوێ دادان و دابەشینی دارایی بە سەر گەورەگەورە و نەجیمزادان و چاکەی بە لێشاو و بە فیڕۆدانی گیخاتووخان وای کرد کە خەزێنە هەڵتەکا و جرینگەی دینار و دردەمی تێدا نەما. گیخاتوو هەر دەستی پێوەنەدەگرت و شەشوبێش پێیدا دەدا و دەیبەخشی. مەزنەوەزیر

خەرجوبەرجی پێویستی بۆ دابین نەدەکرا و بە تێماوی بـە شـوێن چارەیـەکدا دەگەڕا و پەنای بۆ هەموو کـەس دەبـرد و زۆر کـر و نەخـشی لـە دارەتـەونی خەیاڵیدا دەتەنی.

لەو سەروبەندەدا عیززەددین موزەففەر کوڕی محەممەد کوڕی عـەمیـد کـە سەرۆکی کۆکردنەوەی ڕایەڵەی باج و پیتاک و کابرایەکی دەغەزدار بـوو، بـە خزمەت وەزیری ڕاگەیاند وا باشە و جەنگەیەتی کـە بـەپێی داب و دەسـتووری هەرێمی خەتای و وڵاتی قائان «جاو»[1] لەبری زێڕ و زێو بێتەگۆڕ و لەوەی بـەو لاوە کڕین و فرۆشتن و سەودای پێبکرێ. هەتا وای لێبێ کـە دیـسان خەزێنـە پڕبێتەوە لە زێڕ و زێو و داموودەزگای پادشا خۆی بگرێتەوە و کەسیش تووشـی زەرەد نەبێ.

چونکە لەو سەردەمیدا مەزنـەوەزیر پتـر لـە پێنـسەدتمەنی قەرزوقۆڵـە کەوتبۆوە سەرشانی و ڕۆژ بە ڕۆژیش زیادی دەکرد، ئەم قسەیەی عیـززەددین موزەففەری بە دڵەوە نووسا و لێیوەرگرت و وێڕای پۆلا چەنگسانگ کە باڵوێزی خاقان بوو لە بارگای میری ئەم خەیاڵـە خـاو و نـەگونجاوەی بـە خزمـەتی گیخاتووخان گەیاند. پادشا فەرمانی دا لێرە بەولاوە دەبێ لە قەڵەمڕەوی میریدا زێڕ و زێو سەودا و مامەڵەی پێنەکرێ و نابێ کەس پارچەی زێڕچنی جلوبەرگ بتـەنێ مـەگین بـۆ خـودی فەرمانـڕەوا. هـەروەها پێویـستە زێڕینگـەران و هەوداسازانی ئاڵتوون و وەستاکارانی قوماشی زێڕ و زێو دەس لە پیشەی خۆیان بەردەن و وازی لـێبێنـن. دەبـێ هـەموو شـارەکانی مـیری لـە هەرێمـەکانی ئازەربایجان، عێراقی عـەرەب و عەجـەم، فـارس، خووزسـتان، دیاربـەکر، عەرەبستان، خوراسان و ڕۆم چاوخانەیان لێدامەزرێ. بە مەبەستی جێبـەجێ

---

[1] ١- چاو. دراوی چەرم یان کاغەزی کە یەکەم جار لە وڵاتی چیندا داکـەوت. عـەرەب کردوویانەتە جاو. (وشەدانی دێهخودا، بەرگی ٦، ل ٨٠٣٠).

کردنی ئەم کارە بەرپرس و کاربەدەستیان دیاری کردن و لە هەر شار و ناوچەیەک پارەیەکی باش بۆ سازکردنی چاوخانە خەرج کرا. ئەم چاوە کوتەقاقەزێکی چوارگۆشەی تەسکەڵە بوو کە چەند وشەیەکی بە خەتی خەتایی لەسەر نووسرابوو. لە هەردک بەری دەستەواژەی «لائیلاهە ئیللەڵلا، محەممەد ڕەسوولەڵلا» و «ئیرەنجی دوورجی» کە نازناوێک بوو خاقانی خەتای دابووی بە میر، خۆی دەنواند و بازنەیەکی لە نێوەڕاستیدا کێشرابۆوە. کێشی لە نیودرمم هەتا دە درمم سەروخواری دەکرد. هەروەها لێینووسرابوو کە لە ساڵی ۶۹۳ڕا میری مەزن ئەم چاوە پیرۆزەی داخستووە و برەوی پێداوە. هەرکەس بێتوو گۆڕانی تێدا بەدی بێنێ یان پارەی قەڵەبی لە ڕووی ساز بکا، بە خۆی و ژن و منداڵ و کەسوکارەوە سزا دەدرێ.

وەختایەک ئەم نەقڵ و قسە و باسانە داکەوتن خەڵک لە گێژاوی سەرسوڕمان و لە بەحری بیران ڕاچوون. چەند شاعیرێک لەبەر دڵی پادشا و مەزنەوەزیر سەبارەت بەم هەل و هەڵکەوتە شێعریان هۆندەوە و ئەمەش نموونەیەکی تۆمارکراوە:

ئەگەر بێتوو چاو بە دنیا وەربێ
ولات گوڵ دەکا و دایم لەسەربێ

خولاسەی کەلام لە مانگی نێوجێژنانی ئەم ساڵەدا چاو لە تەورێز خرایە گەڕ و بەناچاری جەماوەری بازاڕ دووسێ ڕۆژان وەریانگرت و سەودایان پێکرد. بەڵام کۆمەڵێک کڕیار و فرۆشەر وەختایەک حاڵ و ڕۆژەکەیان ئاوا بینی، وەڕەز بوون و تابشتیان نەهێنا و لەگەڵ ئەو زەرەدانە دەرنەچوون و بارگە و بنەیان پێچایەوە و ڕۆیشتن. ئەگەرچی تاقمێک لە ترسان دووکانیان دەکردەوە، بەڵام کووتاڵ و خواردەمەنی و کەلوپەلیان دەشاردەوە. خەڵک ئەوەندەی تین بۆ هات کە ڕۆژی هەینی کردیانە هەرا و هەڵلا و قیرە و هاوار و هەزار جار لەعنەتیان

نارد بۆ عیززەددین موزەففەر و لە حەیفان یەخەیان لێدادڕی و بەڕەڵا و ئاژاوەگێڕ پەلاماری ئەو ناجسنەیان دا و وەک هێندێکان گێڕاویانەتەوە گۆڕەهوویان کرد.

پۆلی سەرۆک و سەرکردان لەگەڵ مەزنەوەزیر بە خزمەتی پادشایان ڕاگەیاند کە بلاوبوونەوەی چاو باروذۆخی وڵات دەشێوێنێ و دووبەرەکی دەنێتەوە و باج و پیتاک تێدا دەبا و خەڵک پێی ماڵوێران دەبێ و چما چەند ڕۆژێکی دیکەی پێبچێ پەشێوی تەواوی کەلێن و قوژبنی وڵات و دەسەڵات دەتەنێتەوە.

وەختایەک گیخاتووخان ئەو قسانەی بیست، خێرایەکی فەرمانی دەرچوونی «چاو»ی هەڵوەشاندەوە و ئەوانەی پەڕەوازە ببوون گەڕانەوە سەر ماڵوحاڵی خۆیان و تەورێز هاتەوە سەر دۆخی جارانی.

هەر لەم ساڵەدا میسری، مەلیک قاهیری تۆرەمەی مەزنەوەجاخی سوڵتانەکانی خانەدانی ئەییووبییان (لە جێی مەلیک ئەشرەفی برای دانا). قاهیر کە جێنشینی مەلیک ئەشرەف بوو، لە سەردەمی دەسەڵاتا خۆی بە جێگری مەلیک ناسری کوڕی سەیفەددین قەلاوون دادەنا، هەتا ڕۆژایەکی کە «کەیبووقا»ناوێک هەر لەم ساڵەدا کوشتی.

## ساڵی ٦٩٤ / ١٢٩٤ ـ ٩٥

لە سەرەتای ئەم ساڵەدا بایدووخان کوڕی توغرای کوڕی هۆلاکۆخان کوڕی توولیخان کوڕی چەنگیزخان لە گیخاتووخان ڕاپەڕی و متەقی لێبڕی و لە جێگای وی پاڵی لە تەختی پادشایەتی دایەوە. پاش تێپەڕینی هەشت مانگان، غازانخانی کوڕی ئەرغوونخان لەگەڵ میر حاجی نەورۆز کاکەوبرالەیان کرد و لێیهەڵگەڕانەوە و لە خوێنی خۆیان گەوزاند. غازانخان لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی باپیرانی دانیشت.

هەر لە مانگی شابانی ئەم ساڵەدا بە خێر و بەرەکەتی پشتیوانیی خـودای مەزن و پەرجۆکانی پێغەمبەری سەرکاروانی بڕواهێنان، غازانخان بـە دنـە و دڵخۆشیدانەوەی حاجی نەورۆز لەسەر دەستی شـێخ برایمـی حەمـەوی، لـە فیرووزکۆ بە خۆی و بە هەشتاهەزار پیاوماقووڵ و مەزن و کەیخودای مەغوولان، هاتە سەر دینی ئیسلام و تاجی شانازی و بڕوای ڕاست و پتەوی نایـە سـەری. زمانی کە لە تەواوی تەمەنیدا بە ڕەوت و ڕێبازی مووسـایی و عیـسایی گـۆچ کرابوو و دەیگوت بەڕاستی یەزدان سیانـەی بـاوک و کـوڕ و ڕووحی پـیرۆزە، شادەوئیمانی هێنا و درکاندنی کە خودا یەکە و نابێ بە دوو. پاشان ئۆباڵی کێشا بۆ ئەم ئایەتە کە دەڵێ: «محەممەد بابی هیچ پیاوێک لە پیاوانی ئێوە نیە، بەڵام ڕاسپاردەی خوایە و ئاخری پێغەمبەرانە.»[1]

وشەی مبارەکی تاقانەپەرستی بوو بە خورمای نۆبـەرەی سـەر زمـانی و کەوتە نێو کۆڕ و ئاپۆرای بەختەوەران کە خوا مزگێنی پێداون: «ئێوە چـاکترین کۆمەڵن لە نێو مەردمی دنیادا سەروو هەڵدا.»[2]

دواتر ناوی پیرۆزی گـۆڕا بـە سولـتان مـەحموودخان و «ئولجـایتوو»ی براشیان بە سوڵتان محەممەد ناودێر کرد. لەو ڕۆژەوە مێژووی خانی داندراوە و دەس پێدەکا.

## ساڵی ٦٩٥ / ١٢٩٥ ـ ٩٦

لە سەرەتای مانگی محەڕڕەمی ئەم ساڵەدا سوڵتان مەحموودخان غازان کە هێشتا بیست ڕۆژ بە سەر حوکماتیدا تێنەپەڕیبوو، مۆری میری کە چوارگۆشە

---

١- « ما كان محمد ابا احد من رجالكم و لكن رسول‌الله و خاتم‌النبين »، قورئـانی پـیرۆز، سوورەی ئەحزاب، ئایەی ٤٠، لاپەڕە ٤٢٣، وەرگێڕاوی. مامۆستا هەژار...

٢- « كنتم امة اخرجت للناس »، قورئانی پیرۆز، سوورەی ئالی عیمران، ئایەی ١١٠، ل٦٤، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار...

بوو، بۆ موبارەکی گۆڕی بە بازنـەیی کـە لـە هـەموو شێوان سـەرترە. لـە نێوەڕاستیدا نەخشی «لائیلاهە ئیللەللا، محەممەد ڕەسوولەللا» هەڵـکەندرا و ئاماژەی فەرموو کە تێکڕای نووسین و فەرمانێک بە ناوی یەزدانی مـەزن دەس پێبکا و بڕازێتەوە و دەبێ حوکمی مووچە و مانگانـە و بەخـشینی زەویوزاری کەڵەبڕ بۆ مسوڵمانان لە تەواوی هەرێمەکاندا واژۆی پیرۆزی پێوەبێ.

پاشان حاجی نەورۆزی کردە میریمیران و بریکار و تەیار و تەکووز کردنی لەشکری شێرگەوزێنی خستە سەر شانی. ئەمجار خواجە سەدرەددین ئەحمەدی زەنجانی بۆ مەزنەوەزیر تاعین فەرموو.

## ساڵی ٦٩٦ / ١٢٩٦ ـ ٩٧

لەم ساڵەدا حاجی نەورۆز تاوانی دۆستایەتی سوڵتانی میسری بە ئەستۆی دابڕا و لە خوراسان بە حوکمی غازان کوژرا و شەکراوی شەهادەتی نۆشی.

هەر ئەم ساڵە مەلیک سەیفەددین بەرەو میسر بزووت و حیسامەددین لاچین کە غولامی میر مەلیک ئەشرەف سەلاحەددین خەلیل کوڕی سـەیفەددین بـوو، کوشتی و بەم کارەی کردی تـۆقی و لەگـەڵ چـوار میرغـولامی دیکـە ڕایکـردە دەمیشق(؟).

## ساڵی ٦٩٧ / ١٢٩٧ ـ ٩٨

لەم ساڵە سوڵتان مەحموود غازان لە شانشینی تەورێز گەڵاڵـەی دانـان و سازکردنی مزگەوتی گەورە و خوێندنگا و تەکیـە و خانـەقای لـە دەوروبـەری گومبەزی نێژگەی خۆی داڕشت کە بەڕاستی لە ژێر خێوەتەشینەی ئاسماندا هیچ قوبەیەک تای ناکا و تاق دەدرەوشێتەوە. تیرە و بەرزایی گومبەزی هەرکامەیان ٢٧ گەز و دیواری سەری گەیوەتە شەش گەز. وەک زۆربەی مێژووەکـان باسـی دەکەن بێجگە لە کەوانەی گومبەزی، ئەوی تری بە پێنج سـاڵان تـەواو بـووە. خواجە عالیشای وەزیری خونتەلانی لە تەورێز مزگەفتێکی وای ساز کردووە کە تاقی بەرهەیوانی ٤٠ گەز تێهەڵچووە، بەڵام خۆی بـۆ ڕانـەگیراوە و دوای دوو

ساڵان دارماوە. قوبەی غازانیش لە تۆقی سەریڕا ١١ گەز قەڵشی تێکەوت و گەز و نیوێک زاری کردەوە و هەتاو و مانگ و ئەستێرە لێوەی دیار بوون، بەڵام تێکنەقرما و قازی محەممەدی قازی موسافیری تەورێزی کە لەبری شاتۆماسب بە سەر تەورێز ڕادەگەیشت و وەقفەکانی غازانی لەبەر دەستیدا بوو، درزی گۆیەکەی کەڵتە کردەوە.

## ساڵی ٦٩٨ / ١٢٩٨ ـ ٩٩

سەرەتای ئەم ساڵە حیسامەددین لاچین لە میسر بارگەی نەمانی بەرەو دنیای دیکە پێچایەوە و مەلیک مەنسووری کوڕی ڕۆنیشتە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی. دەستی گەیاندە مەلیک عادل و لەسەر کایەی شەترەنج بە خۆی و حەوت غولامەوە کتوپڕ کوشتی(؟).[1]

## ساڵی ٦٩٩ / ١٢٩٩ ـ ١٣٠٠

دوای داگیرسانی ئەم ساڵە مەلیک ناسری کوڕی مەلیک مەنسوور کە حوکمرانی دەمیشق(؟) بوو، لە دەورانپشتی حەمەس و حەما کەوتە شەڕی سوڵتان مەحموود غازان و شکا و غازانخان گەڕایەوە تەورێز. لە ڕۆژی سێشەممۆی ٢٢ی مانگی ڕەجەبدا فەرمانی شەهید کردنی مەزنەوەزیری دا و بناغەی تێگەیشتن و چازانی و وریایی هەڵتەکاند و تێکیوەردا و سەرچاوەی چاکە و بەخشینی وە تراویلکە گێڕا.

---

١- حیسامەددین لاچین خودی مەلیک مەنسوورە. ئەویش یازدەهەمین شای زنجیرەی میرغولامانی تورکە لە میسر کە دوای مەلیک ناسر کوڕی محەممەد کوڕی قەلاوون بۆتە پادشا. مەلیک عادل زەینەددین کەنبوغا پاش دوو ساڵ فەرمانڕەوایی دەستی لە تاج و تەخت هەڵگرت و ساڵی ٦٩٥ شاحیسامەددین دووبارە هاتەوە سەر دەسەڵات و نیزیکەی سێ ساڵ حوکماتی کرد و سەرلەنوێ لادرا. خواندەمیر دەڵێ بە دەستی حەوت کەس لە غولامان کوژرا و دیسانەوە مەلیک ناسر هاتەوە سەر حوکم... (وشەدانی دێهخودا، بەرگی ٦، لاپەڕە ٨٩٣٦).

دوای چەند ڕۆژێک پلەی بریکاری و جیهانداری و پایەی وەزارەت و سەرۆکایەتی دیوانی دایە دەست دوو کەسی بەوەج و لێوەشاوەی سەردەمی خۆی. یەکیان خواجە ڕەشید کە پیاوی دین و دنیا بوو و لە زانستەکانی ژیری و حەدیس و بلیمەتی و پزیشکیدا ڕەسەر هەموو پیتۆلانی زەمانی دابوو. ئەوی دی خواجە سەعدەددین ساوجی کە بۆ حیسابگەری و خۆشڕاوێژی دەستی بالای ڕوون دەترووسکا.

بە هەوڵ و هەڵسووڕانی ئەم دوو وەزیرە بیرورد و بێگرێ و بەرچاوڕوونە، پیرەمێردی کەلەلای جیهان، تەمەنی لە نوێ نووسرایەوە و داخواز و نیاز کەوتنە بەر سێبەری جێبەجێ بوون و پیاوانی زانا و خوێندەوارانی مەزن کاروانیان بە ڕێکی بزووت، کەچی لەنەکاو چاووزاری شوم کەوتە کەلووی قرژاڵ کە بەختی پێوەیە و ڕێژنەی هەورەبارانی سۆز و سیلەچاوی یەزدانی بۆ ماوەیەک بنە و وشکاویان هات. ڕووباری دیجلە و جەیحوون و نیل ئەوەندەیان کەم کرد کە تین و بڵێسەی قاتیوقڕی ناخی سینە و کۆشکی مێشکی پیر و لاوی ئاگر دا.

## ساڵی ٧٠٠ / ١٣٠٠ ـ ١

لە نێوەڕاست مانگی جیمادی دووەمی ئەم ساڵەدا، ئەمیر موبارزەددین محەممەد کوڕی ئەمیر موزەففەرەددین کوڕی محەممەد کوڕی ئەمیر موزەففەر(؟) کوڕی میر غەیاسەددینی سەجاوەندی پێیناپە جەغزی ژیان. باوک و باپیرانی بە ڕەگەز عەرەبن کە لە ڕۆژگاری گیرانی خوراساندا وێڕای سپای ئیسلام هاتوون و لە گوندی سەجاوەندی خەوافی سەر بە خوراسان خۆیان گرتۆتەوە و بنەیان داکوتاوە.[1] لە سەردەمە تاڵ و ناخۆش و کارەساتبارەکانی هرووژمی لەشکری

---

١- موبارزەددین محەممەد کوڕی موزەففەر بەردی بناغەی میرایەتی خانەدانی موزەففەری لە فارس و کرمان و کوردستان دا داناوە. موبارزەددین یەکێکە لە←

چەنگیزخاندا میر غەیاسەددین لەوێوە چۆتە یەزد و لە چاخی دەسەڵاتی ئەرغووخاندا کراوەتە کارگێڕێکی دیوانی میری(؟). میر موزەففەری کوڕی لە دەورانی غازانخاندا بۆتە سەرۆکی «هەزارە» و ئاڵا و سێتەپڵەی سەرکردایەتی خەڵات کراوە.

میر موبارزەددین لە جەنگەی کەمدەسەڵاتی و لاوازی فەرمانڕەوایەتی مەغوولاندا بنچینەی پادشایەتی دانا و ڕۆژ بە ڕۆژ ئەستێرەی بەختی بەرز درەوشایەوە. ئەو دەمەی کە بە مەبەستی دەمکوتی «ئەخیجوق»ی جێگری جانیبەگ هەڵیکردە تەورێز، لە گەرمڕوود پەلاماری دا و تێکوپێکی شکاند و بەرەو فارس بۆوە و کرمانیشی گرت و خستییە سەر هەرێمی یەزد و عێراق و لە ئازەربایجان خودبەی بە ناوی خوێندرایەوە. لەبەروەی پیاوێکی توند و تیژ و بەزەبروزەنگ بوو هەر کەس تۆزێک لە ڕێبازی دینی لادابا دەیچزاند و بەربینگی پێدەگرت. باریکبینان و ناسک خەیاڵانی سەردەمی بە داروغە و کێشکچی شوبهاندوویانە و خواجە حافز لە پرێسکەدا درکاندوویەتی:

به نالەی چەنگ مەخۆ مەی چونکە زۆر وریایە داروغە

---

←توخمەکانی غەیاسەددین حاجی حوکمڕانی مەیبود و... دەچێتەوە سەر ئێلخانان. موبارزەددین ساڵی ٧١٣ دوای غەیاسەددین جێی باوکی دەگرێتەوە. دوای سوڵتان ئەبووسەعیدخان کاری گەورەی دیکەشی بۆ هەڵدەسووڕێ. ساڵی ٧٤١ کرمان دەگرێ و دوای چەند شەڕێک لەگەڵ شێخ ئیسحاقی ئینجوو، ساڵی٧٥٤ شیراز و تێکڕای هەرێمی فارس دەخاتە ژێر ڕکێفی و ساڵی ٧٥٨ ئیسفەهان دەگرێ. پاشان هێرش دەباتە سەر ئازەربایجان و هەتا باکووری تەورێز بڕ دەکا. کوڕەکانی ساڵی ٧٥٩ی ک (١٣٥٧ ی ز) لێیدەخەن و چاوی داغ دەکەن و دوای ماوەیەکی کورت لە زینداندا دەمرێ... (وشەدانی دێهخودا، بەرگی ١٣، ل٢٠٠٩١).

مێژوونووسان ئەم بنەماڵەیان بە خانەدانی موزەففەر ناودێر کردووە و حەوتیان گەیشتوونە سەر دەسەڵات و لە درێژەی باسەکان بەسەرهاتیان ڕوون دەکرێتەوە.

## ساڵی ٧٠١ / ١٣٠١ ـ ٢

لەم ساڵەدا دیسان غازانخان ئاڵای شەنگی سەرکەوتنی هەڵدا و بە ئامانجی ڕزگاری خاکی شام لەشکری کێشا و دوای ئەوەی لە ڕووکاری حەلەب ئاسۆگی دا، بۆی دەرکەوت کە سوڵتانی میسر سەر لە کۆشکی شکۆداری دەسەڵاتی وەدەرنانێ و چورتەی لە خۆی بڕیوە. بۆیە بە گوێی سەرکردەکانی کرد بگەڕێتەوە کە وایان بە چاک و بەرژەوەند زانی.

## ساڵی ٧٠٢ / ١٣٠٢ ـ ٣

لە بەهاری ئەم ساڵەدا غازانخان، قازی نەسیرەددینی تەورێزی و قازی قوتبەددین(؟) مووسڵی وەکوو باڵوێز و نەسپی ناردنی بۆ لای مەلیک ناسر لە میسر. پوختەی ڕاسپاردەی ئەوە بوو ئەگەر بێتوو لەو وڵاتە خوتبە و سکە بە ناوی بەرزی ئێمە برازێتەوە و هەموو ساڵێ باج و خەراجمان بۆ بنێرن، ئەوە دەستیان لێ نادەین و لایان لێلا دەدەین و نایانخەینە بەر شاڵاوی قۆشەنی وەک دەریای بێئامانی خۆمان کە وەختایەکی هەڵدەستێ دەڵێی قیامەت ڕابووە؛ دەنا ئەو پەندەیان بە سەر دێنین کە لەشکری چەنگیز دانیشتووانی وڵاتی خارەزمشاهییانیان پێتەزاندن.

پاش ئەوەی کەیخوداکان گەیشتنە لای مەلیک ناسر و چۆنیەتی چوونەکەیان لێ ڕوون کردەوە، فەرمووی ڕیشسپی و باوەڕپێکراوانی خۆمان وەڵامی ئەو داوایە دەبەنەوە لای غازانخان. قازییەکانی بە کۆڵێک دیاری و خەڵاتەوە ناردەوە و کاتێک گەیشتنەوە خزمەت میر، ئەوەی دیبوویان و بیستبوویان لە نووکوبەد بۆیان گێڕایەوە.

## ساڵی ٧٠٣ / ١٣٠٣ ـ ٤

لە ڕۆژی یەکشەممەی پازدەی مانگی شەشەکانی ئەم ساڵەدا غازانخان لە «پشکەڵدەرە»ی قەزوێن بارگە و بنەی ژیانی تێکەوەپێچا و بـەرەو هەوارگـەی نەمان هەنگاوی نا.

ڕۆژی یـەکشـەممـۆ دەمــەو ئێـوارە
یازدەی شەشەکان لــە حــەوسەد وسێ
لە ناوچەی قەزوێن شای جیهان غازان
بەرەو بەهەشت چوو، ئەوێی چاتر بێ

سی و سێ ساڵ تەمەنی بۆ بە دارێ کرا و نۆ ساڵ و حەوت مانگی پادشایەتی کرد. مەیتەکەیان هێنایەوە تەورێز و لەو گۆڕخانەی کە بۆ ناشتنی خۆی سازی کردبوو تەسلیم بە خاکیان کرد.

سوڵتان محەممەدی خەربەندە [کەرەوان] کە دواتر کراوەتە خودابەندە لــە تەمەنی ٢٣ ساڵیدا جێی کاکی گرتەوە. لەسەر ڕێوشوێنی غازانخـــان خواجــە ڕەشیدەددین فەزلوڵڵای هەمەدانی و خواجە سـەعدەددینی سـاوجی لــە جێــی نەبزاوتن. بۆیەش پێیان گوتووە خەربەندە چونکە دوای نەمانی باوکی لە ترسی غازانخان(؟) لە ناوچەی شیراز و کرمان خۆی شاردۆتەوە و لەگـەڵ کـەردار و کەرەوانان هەتا هۆرمز ڕۆیشتووە و ناوی بە خەربەندە زڕاوە.[1]

---

1- سوڵتان محەممەد ئولجایتووی سێهەم کوڕی ئەرغوونخان بووە و غازانخـانی برای بە زیندیسەر کردوویەتە جێنشینیمیری... لەبـەروەی ڕێبـازی شـیعەی خـۆش ویستووە، شیعە نازناوی خودابەنـدەیان داوەتــێ، بـەڵام سـوننی بـە دوژمنایـەتی و ڕقەوەنی کردوویانەتە خەربەندە... (وشەدانی دێهخودا، ب ٦، ل ٩٥٥٨- ٩٥٦٣).

## سالّی ٧٠٤ / ١٣٠٤ ـ ٥

لەم ساڵەدا پەروەردگاری گەورە لە پێدەشتی تاروم کوڕێکی کردە دیاری بۆ سوڵتان محەممەدی خودابەندە کە بە ئەبووسەعید ناودێر کرا.

## سالّی ٧٠٥ / ١٣٠٥ ـ ٦

سەرەتای ئەم ساڵە سوڵتان محەممەد لە ئۆلەنگ (مێرگۆلان)ی قۆنقوری، شار و حەسارێکی هەڵخست و ناوی نا سوڵتانییە. شووره و قــەڵا و دیــواری بەرز و قایم و پتەوی بە دەورەیدا کێشا و چاکی پێراگەیشت و جوان ڕازاندییەوە و کردی بە پێتەختی دەسەڵاتی.

## سالّی ٧٠٦ / ١٣٠٦ ـ ٧

لەم ساڵەدا سوڵتان محەممەدی خودابەندە بە نیازی گرتنی گیلان هێرشــی برد و میر قۆتلغشا کە میریمیرانی بوو لەو شەڕ و هەڵلایەدا کــوژرا و ئــەمیر چووپان تەواو جێی گرتەوە.

## سالّی ٧٠٧ / ١٣٠٧ ـ ٨

سوڵتان عوسمانی غازی لەم ساڵەدا هەلی بۆ ڕەخسا و توانی دەست بگرێ بە سەر ناوچەی مەرمەرەدا و قەڵای کوستەل و کۆتی و لفکە و ئاغچەحەســار و قۆچحەساری خستە ژێر ڕکێفی. حاکمی ئێزنیق پیاوی نارده خزمەت حوکمڕانی قوستەنتەنییە و سەبارەت بە کار و کردەوەکانی سوڵتان عوسمان کەوتە سکاڵا و گلە و گازاندن و داوای لێکرد دە فریای بێ و یارمەتی بدا. ئەویش قــۆشەنێکی فرت و فراوانی بە هانایەوە نارد. کاتێک قۆشەن خەریکی پەڕینەوە بــوون لــە گۆلی دل کە هەر بە چاو دووهەزار گەزێک بەرینی نواندووە، سوڵتان عوسمان پێیزانیوە و کــۆمەڵێک لە دلێرانی مسوڵمانی لێدەنگ داون و زۆربــەی ئــەو بێدینانە لە لۆتکاندا وەبەر شیری تیژی غەزاکەران هاتوون و لەتوپەت کراون.

هەر لەم ساڵەدا سوڵتان محەممەدی خودابەندە بە مەبەستی چوونە ئارانێ بەرەو بەغدا بزووت و لە مەودای ڕێگادا... مەزنەوەزیر بوخــاری حەنــەفی کــە

دەچوو بۆ حەج لەگەڵ خواجە عەبدولمەلیکی شافعی، مەزنی قازییەکانی قەڵەمڕەوی میری، لەسەر مەزهەب بوو بە دەمەتەقەیان و دەبەر یەکتر ڕاچوون و قسەی تاڵ و سوێر پارسەنگی هەردک لای گرتەوە. سوڵتان ڕێبازی ئیمامی شافعی هەڵبژارد. دواتر بە هەوڵ و تێکۆشانی شێخ جەماڵەددین حەسەن کوڕی سەدیدەددین یۆسف کوڕی زەینەددین عەلی کوڕی موتەههەر ناسراو بە حللی فرەزان، ڕێبازی ئیمامییە (شیعە)ی پەسند کرد. حوکم و فەرمانی نووسین بۆ هەموو هەرێم و مەڵبەند و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی کە دەبێ لە خوتپاندا ناوی هەر دوازدە ئیمامان بێتەگۆڕ و ڕووکاری دراویان پێبنەخشێ. شێخ جەماڵەددین کتێبی «مینهاجولکیرامە»ی بۆ میری خودابەندە نووسی.

## ساڵی ٧٠٨ / ١٣٠٨ ـ ٩

لەم ساڵەدا قەڵای... قەڵاتی لۆبلووجی (لۆبلووجە) و گیوە و تورقلی یەکیجەسی و تەکوور بیکاری کەوتە چنگ دەستەوبەستەی پیاوانی ڕەشیدی سوڵتان عوسمانی غازی. هەر لەم ساڵەدا سالاری بریکاری سوڵتانەکانی میسر لەگەڵ تاقمێک ڕێککەوت و دەستی تێکەڵ کرد و ویستی مەلیک ناسری کوڕی مەلیک مەنسوور تێدابەرێ. مەلیک ناسر بە فێڵ و دەهۆیانی زانی و پەنای بردە بەر قەڵای کۆرەک. سالار، جەشنگیری کردە فەرمانڕەوا و بە مەلیک موزەففەر ناودێر کرا.[١]

---

١- سالار یەکێک بوو لە گەورە سەردارانی مەلیک ناسر کە ساڵی ٧٠٧ لە بنەوە دەستی لەگەڵ حیسامەددین بەدری چاشنیگیر تێکەڵ کرد و لە میر هەڵگەڕایەوە و یارانی لەسەر میرایەتی چاشنیگیر ساخ بوونەوە و کاروباری هەرەگرینگی وڵاتیان دایە دەست سالاری ژێهاتی. پاش ماوەیەک مەلیک ناسر لە ڕاپەڕیوان وەدەس هات و بە ژێی کەوان چاشنیگیریان تێدابرد. سالاریشیان دوور خستەوە بۆ قەڵای شەریک تا هەتا ئاخری تەمەنی لەوێبێ. (وشەدانی دێهخودا، ب ٩، ل ١٣٣٣٧ – ١٣٣٣٨).

## ساڵی ٧٠٩ / ١٣٠٩ ـ ١٠

لەم ساڵەدا خەڵکی میسر لە مەلیک موزەففەر راپەڕین و لەسەر دەسەڵات تلیان پێدا و مەلیک ناسریان لە قەڵای کۆرەکەوە هێنایەوە و کردیانەوە میر.

هەر لەم ساڵەدا سوڵتان محەممەدی خودابەندە حوکماتی ناوچەی ئەبەرقوو و پاراستنی ڕێگاوبانی نێوان خوراسان و لوڕستانی خستە سەر دەسەڵاتی ئەمیر موزەففەرەددین محەممەد کە لە شاڵاوی گیلاندا زۆر ئازا و پیاوانەی هاتبووە بەرچاوی.

## ساڵی ٧١٠ / ١٣١٠ـ ١١

لەم ساڵەدا سوڵتان ئەبووسەعید گەلێکی نەخۆشی پێوەنووسا و خولێرەکەی لێهات و باوکی و گەورەگەورانی حکوومەت دەستیان لێشۆرد و گوتیان ناژی. بەڵام ئاخرییەکەی بینای چاوان و خودای بانیسەر یەکجێ خۆشی کردەوە و گەلێکیان خێر و خێرات بۆ بەخشییەوە.

لە ڕۆژی حەڤدەی مانگی ڕۆژواندا مەولانا قوتبەددین مەحموود کوڕی مەولانا مەسعوود کوڕی مەولانا موسلیحەددین کە سەرگەورە و هەوێن و هەڵبژاردەی زانایانی سەردەمی سوڵتان محەممەد بوو لە شانشینی تەورێز ماڵی گوێستەوە بۆ دنیای پاشین. لێکدانەوە و شیکردنەوەی کتێبی «ئوسوول»ی ئیبنووحاجب و «حیکمەتی ئیشراق» و «میفتاح» بە قەڵەمی بەڕێزیان نووسراون.

## ساڵی ٧١١ / ١٣١١ ـ ١٢

لەم ساڵەدا سوڵتان محەممەدی خودابەندە، خواجە سەعدەددین محەممەد ساوجی وەزیری کوشت. حەمدوڵڵا مستەوفی سەبارەت بە ڕێکەوتی مەرگی نووسیویەتی:

حەوسەد و یازدە لە ساڵی کۆچی ڕۆژی شەممە بوو دەی شەشەکانێ
بە فەرمانی شا سەعدەددین وەزیر مانگی تەمەنی هاتە گرانێ

پاشان خواجە عەلیشای خوتتەلانی بە دەستووری سولتان جێی گرتەوە و دایاننا هەتا لەگەڵ خواجە ڕەشید بە هاوبەشی کاروباری وەزارەت هەڵسووڕێنن. کە ساڵ گەیبوویە سەر سۆگەی ئاوابوون سولتان ڕووی کردە بەغدا.

## ساڵی ٧١٢ / ١٣١٢ ـ ١٣

لەم ساڵـەدا فەرمانـڕەوای دەمیـشق قەراسـونقور و حوکمـڕانی حەلـەب جەماڵەددین ئەفروم کە دوو کـەس بـوون لـە مـەزنەمیرانی میسر و شـام لـە هەڵوێست و سزادانی مەلیک ناسر تۆقین و وێـڕای پێنـسەد سـواری ئـازا بـە سەرڕەو چوونە خزمەت سولتان محەممەدی خودابەندە. لە نیزیک سولـتانییە گەیشتنە ڕامووسانی ڕایەخی میرانەی و چۆن چاکە ئاوایان بە دەورەدا هاتن و لاوێندرانەوە و شەڕەفی چوونە نێو ڕیزی یارانی سولتانیان پێبڕا. میر محەممەد بە دنەی ئەوان سەرلەنوێ ئاگری پەلاماردانی شامی لـە کوانـووی دەروونـیدا بووژایەوە و ئالای هێرشی هەڵدا. ڕۆژی ٢٤ی مانگی ڕەمەزانی ئـەم ساڵـە دوای پێکهاتن و ئاشتبوونەوە گەڕایەوە.

## ساڵی ٧١٣ / ١٣١٣ ـ ١٤

سەرەتای ئەم ساڵە سولـتان عوسمـانی غـازی ئووینـاشحـەســاری و قەلاتی... و ئینەگۆل و قەلای ئەترنووسی گرت.

هەر لەم ساڵەدا سولتان محەممەدی خودابەندە فەرمانڕەوایەتی خوراسانی دایە دەس سولتان ئەبووسەعیدخانی مەزنەوەجاخی کوڕی و بەرەو ئەو باڵەی بەڕێکرد و میر سـۆونجی کـردە جـلەودار و دەمڕاسـتی. هــەروەها کۆمەڵـێک کوڕوکاڵی هاوتەمەنی گەورەمیرانیشی لە ڕکێفیدا نارد.

سێ ڕۆژ لە مانگی نێوجێژنان تێپەڕیبوو کە میر موزەففەرەددین محەممــەد کۆچیدوایی کرد و لەو خوێندنگایەی بۆخۆی لە مەیبود سازی کردبوو ناشتیان.

## ساڵی ٧١٤ / ١٣١٤ ـ ١٥

لەم ساڵەدا کۆبەکخان و شازادە ییسووری برای کە بە ڕەگەز دەچوونەوە سەر چوغتایخان و حوکمڕانی هەرێمی ئەوبەررووبار بوون، نێوانیان شێوا. ییسوور وای بە بەرژەوەند زانی کە لە ڕووباری ئاموویە تێپەڕێ و لە شوێنێکی خۆش و دڵگری مەڵبەندی خوراسان لەنگەر بگرێ و دامەزرێ. بەم بۆنەوە یەکێک لە پیاوانی زۆر نیزیکی خۆی بە کۆمەڵێک دیاری و خەڵاتەوە ناردە دەرگانەی سوڵتان محەممەدی خودابەندە و داواکەی بە خزمەت ڕاگەیاند.

سوڵتان محەممەد ڕاسپاردەکەی زۆر بە گەرموگوڕی وەرگرت و گەلێک متفەڕک و باربووی شایانی بۆ نارد و گوتی با سەرپشک بێ و لە هەر جێیەکی پێیخۆشە و دڵی لێیدەحەسێتەوە بنەی بخا. ییسوور بەرەو بادغەیس و هیرات چمی و لە دەشتی قادێس بەیداخی بنەگربوونی چەقاند.

## ساڵی ٧١٥ / ١٣١٥ ـ ١٦

لەم ساڵەدا توغا تەیمووری کوڕی سووری کوڕی بابا بەهادور کوڕی ئەبووبکا کوڕی ئەمکان کوڕی تووری بەهادور کوڕی جووجی قەساری برای چەنگیزخان لە ئەستەراباد سەری هەڵدا. قەسار لە سەردەمی سوڵتان محەممەدی خارەزمشادا وێڕای دەهەزار خێزان بە خێڵ و بار و حەشامەتەوە بەرەو ئێران هاتبوو. سوڵتان محەممەد پەلاماری دا و کوشتی و هۆز و تیرە و نەوە و نەتیژەکانی لە ناوچەی جورجان دەژیان.

## ساڵی ٧١٦ / ١٣١٦ ـ ١٧

شەوی جێژنی ڕەمەزانی ئەم ساڵە سوڵتان محەممەدی خودابەندە دەستی لەم دنیا ڕووخەکە بەردا و ڕووی کردە هەرێمی هەرمان. حەمدوڵڵا مستەوفی سەبارەت بە ڕێکەوتی مردنی گوتوویەتی:

حەوسـەد و شـازدە کـە نـۆ مانگـە بـوو
شـا دەسـی هەڵـگرت لـە تـاج و تـەختی
دنیـای بـێ‌وەفـای وەپـشت سـەری دا
بـە خـۆی نـەزانی هەڵـگلی بـەختی

ماوەی دوازدە ساڵ و نۆ مانگی فەرمانڕەوایەتی کرد و سی و سێ ساڵ ژیا. لە نێو گومبەزی سوڵتانییە کە خۆی بناغەی دانابوو نێژرا.

شار و قەڵاتی سوڵتانییە یەکێک لـە شـوێنەوارە بەنرخـەکانی ئـەو مـیر محەممەدەیە کە بۆ هێز و دەسەڵات بارتەقای جەمشیدشا دەهاتەوە. ئەو شارەیان چوار قولینچک هەڵخستووە و هەر کام لە دیوارەکـانی پێنـسەد گـەز درێـژن. دەروازەیەک و شازدە کلاوقووچەی هەیە و ئێـستا وێرانـە و تـەنیا هەرەسـی شوورەی دیارە.

## ساڵی ٧١٧ / ١٣١٧ ـ ١٨

سەرەتای مانگی سەفەری ئەم ساڵە گەورە و بچووک لـە قـۆرغ و چیمەنی سوڵتانییە قۆڵیان لەسەر کێشا کە سوڵتان ئەبووسەعیدخانی کوڕی سوڵـتان محەممەدی خودابەندە دانیشێتە سەر تەختی پادشایەتی. میر ئەبووسەعید لـە تەمەنی دوازدە ساڵی‌دا بوو بە فەرمانڕەوای ئێران و هەوساری کاروباری گرینگی وڵاتی دایە دەست ئەمیر چووپانی سڵدووز (سندووس) و لەسەر پێ‌شوێنی باوکی خواجە ڕەشید و خواجە عەلیشای لە جێی خۆی نەبزاوتن.

## ساڵی ٧١٨ / ١٣١٨ ـ ١٩

ڕۆژی حەڤدەی جیمادی یەکـەمی ئـەم ساڵـە ئەبووسـەعیدخان، خواجـە ڕەشیدەددین محەممەدی وەزیری لە نیزیک ئەبهەر کوشت. مەولانا جەماڵەددینی عەتیقی(؟) لەم بابەتەوە گوتوویەتی:

رەشـیدی دەوڵـەت و دیـن کـە بـاری کـردە ئـەولا
نووسەری چارەنووسـی، نووسـی کـە « ـاب ڎ اە»[1]

هەر لەم ساڵەدا سوڵتان ئەبووسەعید، ئەمیر موبارزەددین محەممەد کوڕی موزەففەری خوێندەوە و حکوومەتی یەزدی باربوو کرد.

## ساڵی ٧١٩ / ١٣١٩ ـ ٢٠

لە ماوەی ئەم ساڵەدا دەستەیەک لە سەرکردەکان و بەگلەرانی ئەبووسەعید شان بە شانی قورمیشی لەسەر بە دەستەوە گرتنی پلەی میریمیران لەگەڵ ئەمیر چووپان کردیانە دوژمنایەتی و نێوانگرژی و دەمەقرە و شـەڕ و لێکـدان باڵـی ئەنگاوت. سوڵتان ئەبووسەعید ئەگەرچی هێشتا مێـرمنـاڵ بـوو بـەڵام لـــەو هەڵڵایەدا زۆری ئازایەتی و مەردایەتی نواند و بوو بە پێشەنگی کوشتار و یەکەم کەسە لە شاهانی مەغوول کە نازناوی بەهادور (پاڵەوان)ی بە باڵای بڕاوە.

## ساڵی ٧٢٠ / ١٣٢٠ ـ ٢١

شازادە ییسوور و هێزەکانی کە ناوچەی خوراسانیان کردبوو بە مەیـدانی شەقشەقێن و ئاژاوە و تەنگیان بە خەڵک هەڵچنیبوو، بە چنگ لەشـکردارانی کۆبەکخان کوژرا. شازادە جووکی و شازادە غازان و خانم و خاتوونانی شازادە ییسوور بە دیل گیران و کۆبەکخان بە ترینگوهـۆڕ و سـاغ و سـلامەت و بـە دەسکەوتەوە گەڕایەوە ئەوبەرڕووبار.

## ساڵی ٧٢١ / ١٣٢١ ـ ٢٢

لەم ساڵەدا دولندی خاتوونی کچی سولـتان محەممـەدی خودابەنـدە کـە خێزانی ئەمیر چووپان بوو مرد. لەبەر نـۆکـەرچـاکـی و خزمەتکاری سوڵتان ئەبووسەعید خوشکێکی دیکەی دایە کە ساتی خاتوون بێ.

---

١- بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە ٧١٨.

هەر لەم ساڵەدا كۆبەكخانی فەرمانڕەوای ئەوبەرڕووبار بە مردنی خۆی مرد. گۆڕی ئەو پادشا خوابەخشیوە لە شاری قەرشی كەوتۆتە پەنا مزگەوتی گەورە.

## ساڵی ٧٢٢ / ١٣٢٢ ـ ٢٣

لەم ساڵەدا سوڵتان عوسمانی غازی توانی دەس بگرێ بە سەر قەڵای بوورسادا كە یەكێكە لە گەورەشارەكانی خاكی ڕۆم. شاری بوورسا شوورەی بەرز و دیواری پتەو دەورەیان داوە. خودی سوڵتان عوسمان خۆی لە گرتنی هەڵكردووە و گەمارۆی داوە و لە سێ لاوە سەنگەر و لەمپەری لێتەنیوە. كاتێک مەودای ئابلۆقە پێیچووە، دەورەدراو كەوتوونە تەنگەتاوی و چۆڵەپێچكراوی. شازادە ئوورخان لە قۆڵی قەپلووجەوە كە بریتییە لە گەڕەكی گراوان و گەلێک خانووبەرە و سەرسەرای خۆش و دڵگری لێسازكراوە و گەڕیدەكانی سەر دەریا و ویشكانی جێگای دیكەی ئاوایان پێشک نایا، هرووژمی هێنا و جەماوەر بەرگەیان نەگرت و دەستیان بەردایەوە. ئەم شارەش كە دەتگوت بەهەشتە كەوتە نێو جەغزی قەڵەمڕەوی سوڵتانەكانی خاوەنشكۆی خانەدانی عوسمان.

هەر لەم ساڵەدا شێخی عارفان دەدە باڵی قەرامانی كۆچیدوایی كرد و هەروەها میر حوسێنی ئێلخانی كە باوكی[1] لە سەردەمی چەنگیزخاندا(؟) و خۆشی لە ڕۆژگاری سوڵتان ئەبووسەعیدخانا سەرداری تەواوی هێزەكانی بوو، دەستی لە دنیا بەردا. میر حوسێن كچی ئەرغوونخانی دە باڵدا بوو.

## ساڵی ٧٢٣ / ١٣٢٣

یەكێک لە پاڵەوانانی سوڵتان عوسمانی غازی بە ناوی قۆكرئەلب سەرەتای ئەم ساڵە لە خاكی ڕۆمئێلیدا دەستی بە سەر شوورە و حەسارێک داگرت كە ئێستا بە قەڵای قۆكرئەلب ناودێر كراوە.

---

١- ڕەنگە نووسەر لێرەدا مەبەستی لە باوک، باب و كاڵ بێ، واتە باپیرەگەورە.

## ساڵی ٧٢٤ / ١٣٢٣ ـ ٢٤

خواجە عەلیشای وەزیری سوڵتان ئەبووسەعیدخان نەخۆش کەوت. میر ئەوەندەی خۆش دەویست کە چووە سەردانی و پزیشک و حەکیمی چازانی لێکۆ کردەوە کە بە دەورەیدا بێن و هەر چۆنی دەکرێ خۆشی بکەنەوە. بەڵام دەردەکەی هێندە ئەستەم و بێدەرمان بوو کە بەرگەی نەگرت و چۆوە بەر دەرگای ڕەحمەتی خودا. تەرمەکەیان لە کوێستانی ئۆجانەوە گواستەوە تەورێز و لە پەنا ئەو مزگەوتەی سازی کردبوو ناشتیان. یەکێک لەو وەزیرانەی سەردەمی سوڵتانانی مەغوول کە بە مردنی خۆی مردووە، خواجە عەلیشایە.

دوای نەمانی عەلیشا، ڕوکنەددین سایین کە پێشتر جێگری ئەمیر چووپان بوو، کرایە وەزیر. لە ڕاستیدا ئەو شیرازییە، بەڵام لە نەخجەوان هەڵیداوە و گەشە و نەشەی کردووە. میر زیائولمولکی باپیری کارگێڕ و بەرپرسی ڕاپەڕاندنی هەموو کاروبارێکی قۆشەنی سوڵتان محەممەدی خارەزمشا بوو کە لە نەخجەوان نێژراوە و حوجرە و مزگەوتی گەورە و گومبەزی بەرزیان لەسەر دروست کردووە.

## ساڵی ٧٢٥ / ١٣٢٤ ـ ٢٥

لەم ساڵەدا ئەمیر موبارزەددین محەممەد، شاشەرەفەددین موزەففەری کوڕی پێینایە بازنەی ژیان. لە ماوەی چوار ساڵاندا ٢١ جار چۆتە شەڕی نکوودەریان (نکووداریان) و چارەڕەش و خاشەکێشی کردوون و شان و شەوکەتی دەسەڵاتی بەرز درەوشاوەتەوە.

## ساڵی ٧٢٦ / ١٣٢٥ ـ ٢٦

لەم ساڵەدا سوڵتان عوسمانی غازی ماڵاوایی کرد لە دنیای نەمێن و خۆنەگر و بە شەنگەشەنگ بەرەو سەرای نەمری ڕۆیی. ٦٩ ساڵ ژیا و ٣٦ ساڵی حکوومەت کرد. لە سوکوتجووک چاوی لێکنا و تەرمی پیرۆزیان بردەوە بوورسا و لەوێ ناشتیان.

سوڵتان عوسمان مرۆیەکی دڵکراوەی دەس ئاوەڵەی دووربین بوو. هەر بە سێ ڕۆژان جارێک شێوێکی زۆریان لە مدبقی وی لێدەنا و دەرگای بۆ حەشامەت دەخستە سەرپشت. هەموو ساڵێک هەژار و مسکێنی بە سەر دەکردنەوە و زمهەڕ و پێخۆر و جلوبەرگی بە خەڵات دەدانێ و دەستی بەخشینی لێنەدەگێڕانەوە.

ئەو ڕۆژەی کە مرد تەنیا شمشێر و جبە و چەند سەر ئەسپ و دوو کەرکە مەڕی لە پاش بەجێما. ئەوان پەز و بەران و بەرخ و کاوڕ و شەک و بزن و نێری و کاریلکە و کوور و کوێشتیرانەی میری کە لە دەورانپشتی بوورسان لەو ئاژەڵانە کەوتوونەوە. مزگەوتی گەورەی لە قەرەحەساری ساحێبی دروست کردووە. پیاوی زانا و مەزنەمامۆستای وەک شێخ سەدرەددینی قوونەوی، مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی، سوڵتان وەلەدی کوڕی سەید بورهانەددینی تەورێزی(؟)[1]، شەمسولحەقی تەورێزی، بەهائەددین وەلەد، شێخ موخلیسپاشا و ئاشقپاشا هاوچەرخی بوون.

دوای نەمانی سوڵتان عوسمان ئوورخانی ڕەسەنزادەی کوڕی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی پاڵی داوە. ئوورخان پێچ و کڵاوی لمەدی سپی لە نێو قۆشەنی عوسمانیدا کردە باو. وەزیری دانا بۆ کاروباری وڵات و خێرەددینپاشا و مەولانا جەلالەددینی کوردی(؟) بۆ پلەی بەرزی وەزارەت پێهەڵابرد.

یەکێک لە سەرکردەکانی کە «ئەقجە قۆجە»ناو بێ ناوچە و مەڵبەندەکانی هەرێمی ئاناتۆلی داگیر کرد. ئێستا ئەو شوێنە بە قۆجەئیلی ناوبانگی ڕۆیشتووە. «قەرەمورسەل»یش دەستی داگرت بە سەر قەڵایەکی ئەو کەوشەنەدا و بە ناوی خۆی ناودێر کرا. قەڵاتی «سەماندەرێ»ش هەر لەم ساڵەدا گیرا.

---

١- دەبێ تەرمەزی بێ. تەرمەز شارێک بووە لە هەرێمی خوراسان کە کەوتۆتە سەر لێواری ڕووباری جەیحوون. وشەدانی (دێهخودا، ب ٣، ل٤٦٧٠ و ب ٥، ل٦٦٦٨).

لە کاتی گەمارۆدرانی قەڵای «ئیدووس»دا کچی حاکمی ئەویٚ خەونی دیت کە کەوتۆتە نێو پیسایی. کابرایەکی مسوڵمانان پیلی گرت و دەریهێناوە و پۆشاکی پاک و خاوێنی کردەبەری. بەیانی«ئاورەحمان بەهادور»ناوێکی کە لە خەودا دیتبووی، وەبەرچاوی هات و کاخەزێکی لیٚنووسی و پرێسکەی دڵی لە لای کردەوە. وەختایەک شەو داهات ئاورەحمان خۆی هاویشتە حەساریٚ و کچە قەڵای بەیدەست کرد. دوای ئەوەی کیژی حاکم ئیمانی هێنا و مسوڵمان بوو ئاورەحمان مارەی لە خۆی بڕی.

لە ئاخروئۆخری ئەم ساڵەدا نیلووفەر خاتوونی خێزانی بەڕێزی ئوورخان لەسەر چۆمێکی بوورسا پردێکی لێدا کە بە ئاوی نیلووفەر ناوی دەرکردووە.

## ساڵی ٧٢٧ / ١٣٢٦ ـ ٢٧

لەم ساڵەدا سوڵتان ئەبووسەعید دڵی بە بەغدا خاتوونی کچی ئەمیر چووپانەوە نووسا کە زۆر جوان و شۆخ و شەنگ بوو. سوڵتان وا گیرۆدە ببوو کە شەو و ڕۆژ حەجمین و ئاراوقارای لێهەڵگیرابوو. ئەم شێعرە بنبەندی غەزەلێکە کە ئەو دەمی هۆندراوەتەوە:

وەرە بۆ میسری دڵم تاکوو دەمیشقی گیانم

تۆ ببینی، کە دڵم مەیلی بەرەو بەغدایە

بەڵام دوو ساڵ پێشتر ئەمیر چووپان کچەی خۆی دابوو بە میر حەسەنی کوڕی میر حوسێنی ئاقبووغا (ئاقبووقا). بەپێی ڕیٚوشوێن و دابونەریتی مەغوولی و چەنگیزخانی پادشا مەیلی بۆ هەر ژنێک بزووتبا و چاوی گرتبای دەبوو شووەکەی بە دڵی خۆی تەڵاقی دابا و ناردبایە حەرەمخانەی میر. هەر بۆیە سوڵتان کەسێکی خۆیی نارده لای ئەمیر چووپان و باسی ئەوینداربوونی لیٚڕاسپارد. وەختایەک میر چووپان ئەو گوتانەی بە گوێی ئاشنا

کرا، سەری لێشێوا و قسەی سارد و سووک و نابەخێری بۆ ناردەوە. سولتان دڵی لێی ڕەش هەڵگەڕا و ڕووی لێوەرسووڕاند. سەرەڕای مەزنایەتی و شەوکەتی ئەمیر چووپان و کوڕەکانی و دەسەڵاتی بێبەرگێڕەوەی کە ماوەی دوازدە ساڵ میری‌میران و تەوەرەی دامودەزگای ئەو خانەدانە بوو، لێی‌خست و ئەمیر دەمیشق‌خواجە و ئەمیر مەحموودی لە سولتانییە کوشتن کە جگەرگۆشەی بوون.

## ساڵی ٧٢٨ / ١٣٢٧ ـ ٢٨

لە دەسپێکی ئەم ساڵەدا میر چووپان دوای بیستنی کوژرانی کوڕانی بە خۆی و هەشتا هەزار چەکداری ژێر بەیداخی لە خوراسانەوە ڕووی کردە عێراق. سولتان ئەبووسەعیدیش لەشکرێکی بێئامانی کۆ کردەوە و هەتا قەزوێن تێکشا و بۆ بەرەنگاربوونەوەی مامزەی کوتا. سەرۆکان و سەرداران لە ڕەی بەرەبەرە ڕوویان لە ئەمیر چووپان وەرگێڕا و بەرەو سێبەری شەوکەتی خاوەنشکۆ بزووتن. هەر بۆیە بێئەوەی ئاگری شەڕ و کوشتار هەڵگیرسێ ئەمیر چووپان گەڕایەوە خوراسان و پەنای بردەبەر مەلیک غەیاسەددینی کرێت حاکمی هیرات. بەپێی فەرمانی سولتان، مەلیک غەیاسەددین، میر چووپان و جەلاوخانی کوڕی کە خوشکەزای ئەبووسەعیدخان بوو، کوشتنی.

میر تەیموورتاشی کوڕێکی دیکەی ئەمیر چووپان کە حوکمداری هەرێمی ڕۆم بوو، کاتێک بە چارەنووسی باوک و برای زانی، لە ترسی زەبروزەنگ و ژاوەی قۆشەنی سولتان، ڕایکرد و خۆی هاویشتە پەنای مەلیک ناسری حوکمڕانی میسر. مەلیک لەبەر دڵی سولتان فزەی لێبڕی و سەری ناردە بن ڕێسمەی بارگای میر.

هەر لەم ساڵەدا سولتان ئەبووسەعید ویستی وەزیرێکی ورد و وریای لێوەشاوەی مەزن کە بتوانێ هەموو گرێ و کۆسپان وەلابدا و کاروباری دیوانی و دامودەزگای سولتانی ڕێکبخا، هەڵبژێرێ. دوای قووڵبوونەوە و تیژتێڕاچوون،

خواجه غەیاسەددین محەممەد کوڕی خواجه ڕەشید، پشکی بە نــاوی دەرچــوو. میران و پیاوماقوولانی وڵات کە سوڵتان ڕاوێژی پێدەکردن، بە تێکــڕای دەنــگ قۆڵیان لەســەر ژیــری و تێگەیــشتنی دەکێــشا و دەیــانگوت بەڕاســتی شــانی هەڵیدەگرێ و لە هیچ جێیەک تێنامێنــێ و دەتوانــێ پارسەنگــی کــاری وڵات ڕابگرێ و بە هەنگاوی پتەوی بەختیارانەی هــەوڵ بــدا بــۆ ڕاپەڕانــدنی ئیــشی خەڵکانی بژاردە و ڕەمەکی و کەس بە کەمتەرخەمی وەپشت گوێ نادا. ڕێوشوێنی پێشینییان کوێر ناکاتەوە و بۆ زانینی زانستەکانی سەردەمی خۆی گرەوی لــە هەمووان بردۆتەوە و بار و بواری وەزارەت بــاش دەزانــێ و دەســت و قــەڵەم ڕەنگین و دەموپل شیرینە. جا لەسەر ئەم ڕووداوانە سوڵتان کردی بــە وەزیــر و خواجه عەلائەددین محەممەدی خەڵکی خوراسانی لە پاڵ دەستییەوە دانا و کردی بە هاوبەشی کارانی.

پاشان فەرمووی دەبێ بۆ هێنانــەگۆڕی بــڕی داهــات و دەرکــەوت و ڕوون کردنەوەی چۆنیەتی سەودا و مامەڵان توێژینەوەی باریک بکرێ و پاکردە حیساب بە جوانی بێنە بەر چرا و خڵتەوخاڵ و پرزەوپاڵ داماڵدرێن و بکرێنــە هێلکــەی پاککراو.

خواجه عەلائەددین محەممەد دوای هەشت مانگان جڵەوی کاروباری دیوانی دارایی بە دەستەوە گرت و بە تەنیا و سەربەخۆ لەسەر کورسی ئەم ئەرکە پاڵی داوە. هەرچی فەرمانە بە واژۆی محەممەدی ڕەشیدی کــە شــیاوترین ئــەولادی ئادەمە، ڕازانەوە. ئەوانەی کە پێشتر ناحەز و نالەبار لەگەڵ بنەماڵەی ڕەشیدی جووڵابوونەوە لە خۆیان دەترسان؛ بەڵام ئەم گەورەپیاوە قەت وەڕووی کەسیانی نەهێنایەوە و تێکڕای بە دیاری و خەڵات بە سەر کردنەوە.

بــۆ وەزیــری وا هــەزار ئافــەرین　　　بە خۆشەویــستی دەشــواتەوە قــین

لەسەر ناوی ئەو وەزیرە ئاخرخێرە زانایـانی زەمـان وەکـوو سـەرتۆپی بیـروردان قـازی عـەبـدورڕەحمـانـی ئـەلایجـی شیـکەرەوەی «موختەسەر»ی ئیبنوولحاجب «فەوایدی غەیاسییە»ی نووسـیووە و مـەولانا قوتبـەددین ڕازی لێکدانەوەی «مەتالِع»ی داناوە و شێخ ئەوحەدی ئیسفەهانی – ڕەحمەتی خودای لێبێ – مەسنەوی «جامی جەم»ی هـۆنـدۆتـەوە و خواجە سەلمانی ساوجی بە قەسیدەی پاراو و پتەوی بە شان و باڵی هەڵداوە.

## ساڵی ٧٢٩ / ١٣٢٨ ـ ٢٩

ساڵ تازە سەری دە سوێیە نابوو کە مەلیک غەیاسەددین محەممەد کـوڕی ئەبووبەکری کرێت کە وەختی خۆی خوێندنگای غەیاسییەی لـە لای بـاکووری مزگەوتی گەورەی هیرات سـازکردبوو، دوایـین هەناسـەی ژیـانی دا. بـەپێی وەسییەتی خۆی مەلیک شەمسەددینی کوڕی لە جێی دانیشت.

هەر لەم ساڵەدا موبـارزەددین محەممـەدی حوکمـداری یـەزد و مـەیبود، مەخدوومشا خاتوونی کچی شاجیهان کوڕی جەلالەددین سـیورغتەمێش کـوڕی سوڵتان قوتبەددین محەممەد کوڕی مـیر حیـسامەددین حەمیـدی قەراخـەتایی کرمانی لەسەر پێوشوێنی یاسا و ڕێسای دینی محەممەدی لە خۆی مارە کرد.

## ساڵی ٧٣٠ / ١٣٢٩ ـ ٣٠

لەم ساڵەدا ناری توغای کە ماوەیەکی درێژ بوو لە خوراسان ئالای دژایەتی دژی میرانی کرێت بەرز کردبۆوە و سەرێشە و ئاژاوەیەکی زۆری بۆ جـەماوەری مەڵبەندی هیرات نابۆوە، هەدای نـەدا و شـووی لێهەکێشا و بەرەو دەرگانەی سوڵتان ئەبووسەعید بزووت هەتا خواجـە غەیاسـەددین محەممـەدی وەزیـر بکووژێ. ناری توغای لـەبـەر خـۆ بەزلزانی و لووتبەرزی دەیهەویست سەری گەورەی پێوەنێن و ببێتە سپاسالاری تێکڕای وڵات. سوڵتان ئەبووسـەعید بـەم خەیاڵە پووچەی ئەوی زانی و ویستی بیگرێ. ئەویش بە بڕیار و تەمای زانی و لەگەڵ پۆلەچەکدارێک بەرەو ڕەی ڕەوی. سوڵتان خواجە لۆءلۆئی بە شوێنیدا

نارد و ئەویش کەوتەسەری و لە شاخستانی ڕەی گرتی و هێنایە بارگای میری و لەڕێوە سزادرا.

## ساڵی ٧٣١ / ١٣٣٠ ـ ٣١

سوڵتان ئوورخانی کوڕی سوڵتان عوسمانی غازی لەم ساڵەدا دەستی بە سەر قۆیوونحەسار و قەڵای ئێزنێکمید و شاری ئێزنیق داگرت.

هەر ئەم ساڵە لە هیرات مەلیک حافزی کوڕی مەلیک غەیاسەددین کە دوای نەمانی مەلیک شەمسەددینی برای لەسەر کورسی دەسەڵات پاڵی دابۆوە، لە زارکی حەساری قەڵای ئیختیارەددین بە دەست غوورییەکان کوژرا. پاشان کەیخودا و ڕیشسپی و پیاوماقووڵان وێڕای سالار کە ئەو کاتی حاکمی ئختیارەددین بوو، مەلیک موعیززەددین حوسێن کوڕی مەلیک غەیاسەددین کە هێشتا بە تەمەن کاڵ و منداڵ بوو، کردیانە حوکمڕان و لە لای سوڵتان ئەبووسەعیدەوە فەرمانی حکوومەت و خەڵاتیان بۆ هێنا.

## ساڵی ٧٣٢ / ١٣٣١ ـ ٣٢

سوڵتان ئوورخان قەڵای تۆرقلی یەکیجەسی (تۆراقلی یەنیجەسی) و قەڵاتی «گوینک» (گۆینق)ی گرت.

هەر لەم ساڵەدا کۆمەڵێک تۆماتیان بە شێخ حەسەنی کوڕی ئەمیر حوسێنی کوڕی ئاقبووغاوە بەست کە لە ژێرەوە خەریکی نامە گۆڕینەوەیە لەگەڵ بەغدا خاتوون و پیاویان لە بەینیدا دێ و دەچێ و دەیانهەوێ سوڵتان بکووژن. وەختایەک سوڵتان ئەو کوتانەی بە گوێی ئاشنا کرا، بڕوای کرد و ویستی بیکوژێ. دایکی شێخ کە پلکی سوڵتان بوو کەوتە نێوانێ و تکای لێکرد خوێنی نەڕێژێ و ئەویش جامینی گرت و بەخشی و دووری خستەوە بۆ قەڵای کۆماخ کە لەوێ بنەگر بێ. سوڵتان بەغدا خاتوونی لە پێش چاوی کەوت هەتا ڕۆژایەکی کە دوای لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە دەرکەوت لە خۆوە تۆماتیان پێوەبەستووە. ئەو

دەمی دیسان خاتوون شیرن بۆوە و چۆوە سەر پلە و شەوکەتی جارانی و دەسەڵاتی کەم هەتا زۆری کەوتە بەردەستی.

## ساڵی ٧٣٣ / ١٣٣٢ ـ ٣٣

لەم ساڵەدا سوڵتان ئەبووسەعید لوتفی بزووت و میر شێخی لە قەڵای کۆماخ دەرکێشا و حوکمی فەرمانڕەوایەتی ڕۆمی بۆ نووسی و هەتا ئەو دەمەی مرد و چاوی لێکنا هەر لەسەر تەختی دەسەڵاتی وێندەرێ پاڵی دابۆوە.

لەم ساڵەدا شاشوجاعی کوڕی ئەمیر موبارزەددین محەممەد پێی پیرۆزی نایە هەرێمی ژینەوە.

## ساڵی ٧٣٤ / ١٣٣٣ ـ ٣٤

لەم ساڵە سوڵتان ئەبووسەعید حکوومەتی فارسی باربووی ئەمیر موسافیر کرد. ئەمیر شامەحموودی ئینجوو کە بە حەولودەولی میر چووپان ببوو بە حوکمڕانی ئەو هەرێمە، ملک و ماڵێکی یەکجار زۆر و زەوەندی وەسەریەک نابوو. لەگەڵ ئەمەشدا زۆرجاران لە خزمەت سوڵتانا پڕکێشی دەکرد، بۆیە لە دڵی گران هات و تەمای گرت یەکی دیکە حوکمداری فارس بێ. دوا بە دوای ئەم بڕیارە میر مەحموود، ئیسن قۆتلوغ، میر سوڵتانشای کوڕی میر بیکرووز، میر محەممەدبەگ و میر محەممەدی پیلەتەنی ڕەگەڵ خۆی خستن و شاڵاوی بردە سەر موسافیر بۆ کوشتنی. موسافیر بە دەهۆکەیانی زانی و هەڵات و خۆی هاویشتە نێو بارەگای میری و ئەو تاقمە هەڵیانبڕی و هەتا بەردەرکی دەوڵەتخانە چوون و چەند تیرێکیان بە دار و دیواری ئەوێشەوە نا و داوایان کرد موسافیریان بدەنە دەستی.

لە گەرمەی ئەم بەزم و هەرایەدا میر سیورغان و خواجە لۆءلۆء بە هێز و دەستوبردی تەواوە گەیشتنێ و سوڵتان پێیانگەشایەوە. ئەو تاقمە کشانەوە و سوڵتان دانەدانەی گرتن و فەرمانی کوشتنی دان، بەڵام بە کەیخودایەتی و

نێوبژیوانی خواجە غەیاسەددین محەممەدی وەزیر نەیکوشتن و هەتا زەمانی نەمانی سولتان لە قەلایەکدا بەندیان کردن.

## سالی ٧٣٥ / ١٣٣٤ ـ ٣٥

سولتان ئوورخان لەم سالەدا قەلای بالی کەسرا، بەرغەمە، ئایدینجق، ئیدرمید، کرماستی، ئەلووباد و هەرێمی قەرەسی گرت. هەر لەم سالەدا پۆلاخان لە نێو خێل و هۆبە و هەواری چوغاتایدا لە ئەوبەرڕووبار کۆچیدوایی کرد و پادشا غازانی کوڕی ییسوور دانیشتە سەر تەختی دەسەلات.

لە بنەبانی ئەم سالەدا پادشای ئۆزبەک لە تۆرەمەی توشتیخان لە دەشتی «باخەرز»ەوە بەرەو ئەرران و ئازەربایجان ئەسپی لینگ دا. وەک قەدیمی گوتوویانە هەتا زۆلەچەرمەکە ئاو نەیبردووە، سولتان ویستی دەستی ڕەپێش بخا و بەرلەوەی دوژمن هرووژم بێنێ و زال بێ، چەکوچۆل و لەشکری ڕێکخست و بە تێر و تەیاری وێڕای میران و هێزەکانی بەرەو ئەرران بزووت و هەرچەند وەختی خێلبەز دانەهاتبوو، بەلام سەرەوخوار جمی.

## سالی ٧٣٦ / ١٣٣٥ ـ ٣٦

لەبەر تەشەنەی هەوالی هرووژمی پادشای ئۆزبەک، هێشتا بلێسە و تینی گەرما لەوپەڕی خۆیدا بوو کە قۆشەنی گەیاندنە سنووری ئەرران و شیروان. کەشێکی ئەوەندە ناخۆش و ناساز بالی ئەنگاوتبوو کە زۆربەی لەشکر کراسی ژیان لە بەریان داماڵدرا و دوای چەند ڕۆژێک سولتانیش نەخۆش کەوت و تێکهەلگلا. پاش دوو حەوتووان تۆزێک هاتبۆوە سەرخۆ کە سولتانی بەرزەجێ بە مەبەستی وسل کردن چووە گەرماو، بەلام بەرگەی نەگرت و ناساغییەکەی تێهەلچۆوە و لێی پیس کرد. دەستەیەک لە پزیشکان هەستیان بە چەشنێک ژار کرد لە لەشیدا و سەرەنجام ڕۆژی یەکشەممۆ، سێزدەی ڕەبیعی دووەمی ئەم سالە چووە بەر دلۆڤانی خودا. خواجە سەلمانی ساوجی بۆ شینگێڕی سولتان شێعری داناوە و دەلێ:

کوا ناڕەوایە ئەگەر تاج بگری و هەڵچۆقێ تەختی
لەبۆ نەمانی مەزن بووسەعید کە سووڕا بەختـی

سەرۆک و سەرکردەکانی حکوومەت بردیانە سەر تاتەشـوار و شـردیان و جوان و لەبار لە کفنیانەوە پێچـا و ڕایانگواسـت بـۆ سولـتانییە و لـە پـەنا مزگەوتی گەورە، لەو شوێنەی بۆ ناشتنی دیاری کرابوو، سێبەردەیان بە سەر ڕایەڵ کرد. لەبەروەی منداڵی نێرینەی نەبوو، بە هەوڵ و هەڵسووڕانی خواجە غەیاسەددین محەممەدی وەزیر، ئارپاخان (ئەرپای کاون) کوڕی سووسە کوڕی سۆنگقان (سۆفیان) کوڕی مەلیک تەیموور کوڕی ئەریق (ئەزیق) بووکای کوڕی توولیخان کوڕی چەنگیزخان ڕۆنیشتە سەر تەختی میرایەتی. بەڵام دوای چوار مانگان عەلیپاتشای خاڵی سوڵتان ئەبووسەعید، مووساخانی کـوڕی عـەلی کوڕی بایدووخانی لە بەغدا کردە فـەرمـانــڕەوا و دژی ئارپاخـــان ڕاپـــەڕی. عەلیپادشا وێڕای مەزن و بەگلەرانی عەرەب و کورد لە لای جەغەتووی[1] مەراغە بەرەورووی ئەرپاخان بۆوە.

ڕۆژی حەڤدەی ڕەمەزان بوو کە تەندووری ئاوری شەڕ نێڵ درا و گرەمشقاڵی دەستەچیلەی کوشت و کوشتار گرفەی هات. لە گەرمەی تێکهەڵچوونْدا زۆربەی

---

١- چۆمی جەغەتوو لە کوێستانەکانی ناوچەی سەقزی کوردسـتانی ڕۆژهەڵاتـەوە لووزەو دەبەستێ و بە ناوچەی بۆکان و میاندواودا تێدەپەڕێ و دەڕژێتە گـۆلی ورمـێ و ئێستا بەنداوێکی گەورەی بە ناوی نـەورۆزلوو لەسـەر هەڵبەستراوە. نووسـەر بۆیـە گوتوویەتی جەغەتووی مەراغە، چونکە ئەودەم ناوەندی دەسەڵاتی هەرێمەکـە مەراغـە بووە. دەنا جەغەتوو لە مەراغەوە دوورە و تـەواوی ئـەو بەسـتێنەی پێـیدا تێپـەڕیوە کوردستان بووە. پایتەختی دەسەڵاتی میرانی موکری لە گاودۆڵی مەراغە دامەزراوە کـە زۆر کەوتۆتە ئەولاتری ڕووبارەکە. لە ڕووی دەقەکەشەوە دەردەکەوێ کە ئەوکاتی کـورد

میران و مەزنەپیاوان ڕوویان لە ئارپاخـان وەرگێـڕا و دایانـە پـاڵ قۆشـەنی مووساخان. لەبەر تەنینەوەی توخمی خەیانەتی بەگلەران، ئارپاخان خۆی بۆ نەگیرا و پێی‌نایە ئاوزەنگی ڕەوین و بەرەو دەشتی ڕاکردن تێی‌تەقاند. خواجـە غەیاسەددین محەممەدیش هەڵات، بەڵام لە سێ گومبەزانی مەراغـە گرتیـان و ڕۆژی بیست و یەکەمی ئەو مانگە لێویان بە شەکراوی شەهیدبوون تـەڕ کـرد و پاشان ئارپاخانیش کەوتە چنگ دوژمنان و ڕۆژی سی شەشـەکان لـە ئۆجـان کەوتە شوێن پێی کاروانی وەزیر.

وەختایەک حوکم و دەسەڵاتی عەلی‌پادشا و مووساخان و خێڵی ئـویرات ئەو سەرەوسەری ناوچەکەی تەنییەوە، ئەمیر حاجی توغای لە دیاربـەکرەوە بەرەو ڕۆم بزووت و خۆی گەیاندە خزمەت میر شێخ حەسەن کوڕی میر حوسێن کوڕی ئاقبووغای کـوڕە پـووری سولـتان ئەبووسـەعید و دنـەی دا کـە دژی مووساخان و عەلی‌پادشا ڕاوەستێ. میر شێخ حەسـەن، محەممـەدخان کـوڕی یۆلقۆتلوغ کوڕی ئێلتەیموور کوڕی هۆلاکۆخانی بە فەرمانڕەوا دانا و خۆی لـە گرتنی ئێران خۆش کرد و ئاڵای کشان بەرەو ئازەربایجانی هەڵدا.

مووساخان و عەلی‌پادشا بەرەو پیری تێڕاچوون و ڕۆژی چـاردەی مـانگی قوربان لە ناوچەی ئەلەتاق (ئاڵەداغ؟) دوو لەشـکری ڕقئەسـتوور گەیـشتنە یەکتر. عەلی‌پادشا فێڵێکی بە بیری‌دا هات و قاسـیدێکی نـاردە لای مـیر شـێخ حەسەن و لێی ڕاسپارد کە دوو پاتشا لەسەر خاک و ملک پێکەوە شەڕیانە و چ پێویستە من و تۆ ببینە هاودەستی ئەم خوێنڕشتنە؟ وا باشە هەرکام لـە ئێمـە وێڕای هێزەکانمان بڕۆینە سەر گردێک و لێیان‌گەڕێین بۆخۆیان لێکی‌دەرکـەن. پاشان هەرکەس سەرکەوت وێکڕا سەری وەبەر دێنین.

میر شێخ حەسەن ئەو پێشنیارەی سەلماند و لەگەڵ دووهـەزار مێرخاسـێ ڕووی کردە سەر باسک و بەندەنێک و چەقی. پاڵەوانان گـڕی ئـاورگی شـەڕ و کوشتاریان بە گڤەی بای پەلامار خۆش کرد و محەممەدخان بەرەو ڕەوین مامزەی

کوتا. عەلیپادشا پێی وابوو تازە کار تەواوە و دوژمن بەزیوە و نەماوە و سەرکەوتنی ڕێکی وەدەس هێناوە. لە گوێی ڕووبار بە دڵێکی ئاسوودەوە ڕکێفی بەتاڵ کرد و خەریک بوو بە نوێکردنەوەی دەسنوێژ. لەم هەلەدا میر شێخ حەسەن وێڕای دووهەزار پیاوی شیروەشێن بەپڕتاو داوەری و تەپی دایە سەر عەلیپادشا و بە لەپەشیر و نووکەنێزان لەتوپەت و ئەنجنئەنجنی کرد. وەختایەک مووساخان بەو ڕووداوەی زانی لاقی لێبوونە باڵ و فڕی. محەممەدخان سەری ڕکێفی بادایەوە و بەرەو شێخ حەسەن گەڕایەوە.

میر شێخ حەسەن دەستی بە سەر بارگە و بنە و پاشەواری سوڵتان داگرت و لە تۆڵەی بەغدا خاتوون کە میر ئەبووسەعید بە کەڵەزەڕی پێی تەڵاق دابوو، دڵشاد خاتوونی هاوسەری لە خۆی مارە کرد.

لەو سەریساڵدا سوڵتان ئوورخان لە هەرێمی ڕۆم دەستی بە سەر قەڵای قزڵجە توززلە داگرت.

## ساڵی ٧٣٧ / ١٣٣٦ ـ ٣٧

لەم ساڵەدا میر عەبدوڕڕەزاقی کوڕی فەزلوڵڵا پاشتینی لە تۆرمەی چەنگیز کە بە میرانی سەربەدار مەنشوورن، لە سەبزەواری خوراسان ڕاپەڕی. پاشتین گوندێکە لە گوندەکانی «بەیهەق»ی سەر بە سەبزەوار و خواجە فەزلوڵڵا دارا و دەسڕۆیشتووی ئەو ناوچەیە و خاوەنی پێنج کوڕ بوو: ئەمینەددین، عەبدوڕڕەزاق، وەجیهەددین مەسعوود، نەسروڵڵا و شەمسەددین. ئەمینەددین لە خزمەت سوڵتان ئەبووسەعیدا ڕکێفی دەکوتا. لەو زەمانیدا عەلییەسووری خەوافی کە بە ئەبوومسلیم دەناسرا و لە زۆرانبازی و تیرەندازیدا هەڵکەوتە بوو، لە ڕیزەی پیاوانی نیزیکی سوڵتان ئەبووسەعید دادەندرا. ڕۆژێکی سوڵتان گوتی ئەرێ بڵێی لە قەڵەمڕەوی ئێمەدا کەسی وا هەبێ بە زۆرەبانی و تیراوێژی دەروەستی ئەبوومسلیم بێ؟ ئەمینەددین بە خزمەتی گەیاند کە من برایەکم هەیە لە خوراسان ناوی عەبدوڕڕەزاقە و دەرەقەتی ئەبوومسلیم دێ. سوڵتان

دەستبەجێ تەتەرێکی تیژاژۆی بەڕێکردە خوراسان هەتا بچێ و بیهێنێ. کابرای تەتەر لە ماوەی چەند ڕۆژاندا هێنایە ژێر پێچکەی تـەختی فەرمانڕەوایـەتی. سوڵتان فەرمووی دەبێ لەگەڵ ئەبوومو‌سلیم بکەویە ڕقەی تیرهاویشتن. هەردک پاڵەوان چوونە دەشتێ و لەبەر چاوی پادشا تیریان هاویشت. لەبەروەی تیری عەبدوڕڕەزاق دە هەنگاو پتر لە تیری ئەبوومو‌سلیم ڕۆیی، سوڵتان فەرمووی بە دوای کارێکی گرینگدا بینێرن هەتا قازانجێکی پێبگا. دیوانـداران وەرگرتنـی نەغدینە و شتومەکی کرمانیان پێئەسپارد کە بڕی ١٢٠ هـەزار کـەپێکی[1] بـوو. دایاننا ٢٠ هەزاری بۆ خۆی بێ و ١٠٠ هەزاری بێنێتەوە خەزێنەی ئاوەدانی میری. عەبدوڕڕەزاق دوای وەرگرتنی ئەوەی سپێرابوو، سەرلەبەری خەرج کرد و دای بە شەراب و مەستەچاوانی خۆشداکەنە. کاتێک بەرەو سـەبزەوار بـزووت هـەتا بگاتەوە و دەس بکا بە کۆکردنەوە و فرۆشتنی بەشە میراتی خۆی و لە جیـاتی ماڵی پادشا بیدا بە خەزێنە، لە ڕێیەدا هەواڵی مردنی سوڵتان ئەبووسـەعیدی بیست. بۆیە لەڕێوە دەستەیەک سەربزێو و لات و شەلاتی سەبزەواری لە خۆی هالاند و دارێکی چەقاند و گوتی هەرکەس لەگەڵمانە دەبێ مێزەرەکەی لە سەری بکاتەوە و بەم دارەوەی هەلاوەسێ هەتا یەکڕەنگی و ڕووڕاستی وی لـە هـەموو کەس ڕوون بێتەوە. وا هەڵکەوت کە ئەوێ ڕۆژێ حەوسەد کەس بـە دەنگییـەوە چوون و پاڵیان وەپاڵی دا و بە سەربەداران ناودێر کران. هەر ئەو ڕۆژە چوونە دەستەی خواجە عەلائەددین محەممەدی وەزیر کە لە مێرگ و چیمـەنی دامغـان لەنگەری گرتبوو و هەڵبڕدابڕیان وێخست و خواجە بـەرەو ئەسـتەراباد ڕەوی. وەجیهەددینی بـرای عەبـدوڕڕەزاق گەیـشتە سـەری و لـە ئـاوایی والایـادی

---

[1] ١- چەشـنێک دینـار و تمـەن کـە لـە سـەردەمی مـەغوولان و تەیمووریيـان و سەفەوییاندا برەوی بووە. جۆرێک سکە. (وشەدانی دێهخودا، ب ١٢، ل ١٨١٥٨).

ئەستەراباد شەهیدی کرد. لەو دەمەیڕا سەربەداران تەواو گەشەیان کرد و پێهەڵاچوون.

## ساڵی ٧٣٨ / ١٣٣٧ ـ ٣٨

شێخ حەسەنی کوڕی تەیموورتاش کوڕی میر چووپان کە بە شێخ حەسەنی گچکە ناسراوە، ساتیبەگی کچی سوڵتان محەممەدی خودابەندەی کردە فەرمانڕەوا و لە نێو خوتبە و لەسەر سکان‌دا ناوی درکاند. خۆی لە شەڕی شێخ حەسەنی گەورە خۆش کرد. میر شێخ حەسەن کە ئەو کاتی لە تەورێزەوە بەرەو سوڵتانییە کشابوو، بە بیستنی ئەم خەبەرە ڕووی کردە قەزوێن. ساتیبەگ و شێخ حەسەنی گچکە سوڵتانییە و ئازەربایجانیان خستە ژێر ڕکێف و ئالای بزووتن بەرەو قەزوێنیان هەڵدا. میر شێخ حەسەنی گەورەش لە قەزوێن دەرکەوت و بەرلەوەی شەڕ بقەومێ، نیمچە پێکهاتنێک سەری گرت. ساتیبەگ و شێخ حەسەنی گچکە چوون بەرەو ئەرران و ئازەربایجان و میر شێخ حەسەنی گەورە گەڕایەوە سوڵتانییە.

## ساڵی ٧٣٩ / ١٣٣٨ ـ ٣٩

لەم ساڵەدا شێخ حەسەنی گچکە ساتیبەگی لە حوکمڕانێتی خست و سولەیمان‌خانی لە جێی دانا کە بە ڕەگەز دەچۆوە سەر یەشمۆتی کوڕی هۆلاکۆخان. پاشان ساتیبەگ چ پێیخۆش بووبێ و چ پێینا‌خۆش لە سولەیمان‌خانی مارە کرد.

## ساڵی ٧٤٠ / ١٣٣٩ ـ ٤٠

سەرەتای ئەم ساڵە جیهان تەیمووری کوڕی ئەفرەنگ کوڕی گیخاتووخان بە هەوڵ و تێکۆشانی شێخ حەسەنی گەورە لە بەغدا چووە سەر تەختی دەسەڵات. ڕۆژی چوارشەممۆی مانگی قوربان لە ناوچەی تەقتەوی(؟) مەراغە بەرەورووی سولەیمان‌خان و شێخ حەسەنی گچکە بۆوە و شکستی هێنا. میر شێخ حەسەنی گچکە باڵادەست و سەرکەوتە بەرەو تەورێز ئەسپی لینگ دا و میر

سیورغانی کوڕی میر چووپانی لەگەڵ میر ئەشرەفی کوڕی تەیموورتاشی برای خۆی، پێکەوە کردنی بە فەرمانڕەوای عێراقی عەجەم.ئامۆزای خۆی میر پیرحوسێنی کوڕی میر شێخ مەحموود کوڕی میر چووپانی دانا بە حوکمڕانی فارس. وەختایەک میر شێخ حەسەنی گەورە توانی لەو شەڕ و گەڕە دەرباز بێ و بگاتە بەغدا، جیهان تەیمووری لەبەر لێنەوەشاوەیی لێخست. خواجە سەلمان ساوجی کە ئەو دەمی پیاوی شێخ حەسەنی گەورە بووە، سەبارەت بە پاساودانەوە و داپۆشینی ئەو ڕاکردنە قەسیدەیەکی هۆنیوەتەوە و ئاوا دەڵێ:

سپای سەربەرزی ئێمە گەر کشاوە خەم مەخۆ میرم

لە شان و شەوکەتی شاهی بە تۆز و گەردێ کەم نابێ

ئەگەر وەردێ نەدا گەردوون و هەڵنەخولێ لە ڕێبازی

گەلاڕێزانی ئەستێران دەبێ وەرزی تەزووی دابێ

لە نێو مەیدانی شەترەنجا وەکوو ڕۆژ دیار و بەرچاوە

کە هیچی چەشنی شا ناشێ بەهێز و پێز و دارا بێ

گەلێ جار دیوتە وەک لەمپەر قەڵا پارێزەری شایە

بەڵام پیادە بەبێ سامە، لە جێگەی خۆشی گەر ڕابێ

لە سایەی بەرژەوەندیڕا چەلی وایە دەسووڕێ شا

دەڵێ با پیادە ڕاببرێ، چیە بابێت و تێڕابێ

پلەی پیادە بەرز ناچێ کە ڕابرد وا بە بەر شادا

پەڵەی سەر شانی شا نابێ، دەبێ بەم بەزمە خارابێ

بەڵام خۆ دەوڵەتی میران بە زەبرن با بە سەبریش بن

بە ئەسپ و فیل دەهاڕن ئەو کەسەی وا دوژمنی شابێ

## ساڵی ٧٤١ /١٣٤٠ـ ٤١

سەرەتای ئەم ساڵە سوڵتان ئیلدروم بایەزید کە بەڕاستی تۆرەمەی ڕەسەنی سوڵتان مرادخانی باوکی بوو لە مەغنیسا (مەغنیسیە) پێی نایە مەیدانی ژیان. لە وەرزی بەهاردا شێخ حەسەنی گەورە جارێکی دی لەشکرێکی زۆر و زەوەندی تورک و عەرەبی کۆکردنەوە و پەلاماری ئازەربایجانی دا. لە مانگی قوربانی ئەم ساڵەدا سولەیمانخان وێڕای میران و بەگلەران بە مەبەستی هەسدانەوە و دەمکوتی خەنیمان چووبووە ئۆجان. لەو جەنگەدا میری یاغی باستی کوڕی میر چووپان لە ترس و سامی شێخ حەسەنی گچکە ڕووی لە هۆردووی سولەیمانخان وەرگێڕا و ئەو شەشهەزار یەکسمەی بۆ لەوەڕ لە کوێستانی سەهەند ڕایانگرتبوون، وەپێش خۆی دان و خوداوڕاستان بە قۆڵێکدا ڕۆیی کە نیزیک بوو لە هۆردووبەزی شێخ حەسەنی گەورە. بەغدایی کە ئەو تەپوتۆزەیان چاوپێکەوت وایانزانی سپای دوژمن پەلاماری داون و لە ترسان گەڕانەوە بنکەکانی خۆیان.

## ساڵی ٧٤٢ / ١٣٤١ ـ ٤٢

میر موبارزەددین محەممەد کۆتایی ساڵی پار و سەرەتای ئەم ساڵ بناغەی حکوومەتی دانا و بەرەو کرمان بزووت. مەلیک ناسرەددین بورهان(؟) کە حوکمڕانی ئەوێ بوو، خۆی پێڕانەگیرا و شاری چۆل کرد و بەرەو خوراسان تێیتەقاند.

هەر ئەم ساڵە شێخ حەسەنی گچکە لە خزمەت سولەیمانخاندا قۆشەنی بەرەو دیاربەکر گاڵ دا و وڵاتێکی زۆری خاپوور کرد.

## ساڵی ٧٤٣ / ١٣٤٢ ـ ٤٣

میر وەجیهەددینی سەربەدار کە دوای کوژرانی براکەی لەسەر کورسی فەرمانڕەوایەتی پاڵی دابۆوە لەگەڵ پیری خۆی کە شێخ حەسەنی جەوزی [گوێزی] بێ بە ئامانجی گرتنی هیرات هرووژمی برد و بەرەوڕووی مەلیک

موعیززەددین حوسێنی کرێت بۆوە و شکا. پیاوێک لە لەشکرچییانی میر وەجیهەددین شیرێکی لە قەبرغەی شێخ حەسەنی گوێزی دا کە لەوبەری خالیگەی سەری کرد. خەڵک خوێنەکەیان خستە ئەستۆی میر وەجیهەددین.

هەر لەم ساڵەدا مەلیک ئەشرەفی برای شێخ حەسەنی گچکە لەشکری بەرەو شیراز دەنگ دا، بەڵام بێئەوەی هیچی وای بۆ بکرێ گەڕایەوە سوڵتانییە.

### ساڵی ٧٤٤ / ١٣٤٣ ـ ٤٤

لەم ساڵەدا بەخت و دەسەڵاتی میر شێخ ئەبوو ئیسحاق کوڕی میر شامەحموودی ئینجوو درەوشایەوە و گەشەی کرد و گۆی حکوومەتی بە قەفی چەوگانی بڕشت و بڕستی وەبەر خۆی دا و لە پلەی حوکمداری ترازا و گەیشتە پەڕپەڕۆچکەی فەرمانڕەوایەتی. ناوچەی فارس زێدی بنە و بنەچەکەیەتی و بە ڕەگەز دەچنەوە سەر خواجە عەبدوڵلای ئەنساری مەزن. ئینجوو لە زاراوەی مەغوولیدا یانی سەرپەرست و سەرکاری ماڵ و دارایی میر.

میر شێخ ئەبوو ئیسحاق لە شیراز سەردەمی حکوومەتی سوڵتانەکانی مەغوولی سامان و دەسەڵاتی پەرەی گرت و ماڵێکی زۆری وەسەریەکنا. میر مەحموودی باوکی لە گێژاوی ئاژاوەی ئارپاخاندا کوژرا. شەوی شەممەی ٢٧ی مانگی ڕەجەب، عیززەت مەلەکەی خێزانی میر شێخ حەسەنی گچکە کە لە ژێرەوە حەزی لە «یاقووبشا»ناوێک دەکرد، لە ترسی وەی ڕەنگە مێردەکەی بەو کارە دزێو و نالەبارەی زانیبێ، دوو سێ کەس ژن و جارییەی کردە هاودەستی و سواری سەری شێخ حەسەن بوون و ئەوەندەیان باتوو کوشی هەتا دڵی توقی.

خواجە سەلمان دەڵێ:

حەوسەد کە چل و چواری لەسەر بوو پەڕی هەڵدا

کلکەی ڕەجەبێ بوو هەل و هەلکەوتی وەها چاک

هەی لەو ژنە شێرەی کە وەکوو خێری خودا بوو

دەست و مەچەکی ئاسن و پۆلا گەلێ بێباک

گرتی گونی شێخ ڕێککـوشی تـا دڵـی تـۆقـی
ئەی لەو کەڵە گونداره دەخا پیـاو دڕ و چالاک

## ساڵی ٧٤٥ / ١٣٤٤ ـ ٤٥

لەم ساڵەدا مەلیک ئەشرەف خاکی ژێر دەسەڵاتی برای خۆی داگیر کرد و لە دەشتی ئەغناباد کەوتە شەڕی میری یاغی باستی و میر سیورغان کوڕانی مـیر چووپان و تەقوڕەوی تێخستن. پاشان نۆشیروانێکی قەپچاقی کرده میر و ناوی نا نۆشیروانی عادڵ و لە ئازەربایجان و ئەرران ئالای سەربەخۆیی هەڵدا.

## ساڵی ٧٤٦ / ١٣٤٥ ـ ٤٦

لـەم سـاڵەدا مەلیک ئەشرف، مەلیک میسری بـرای لـە ڕکـەی ئاسـنین پەستاوت. یەحیا جاندار و خواجە عەلی و ئیلتەکیز بەهادوری لە تەورێز کوشت. ئۆرتۆقی کوڕی خواجە مەجدەددین ڕەشیدی(؟) گـرت و لـە قـەڵای بەرکۆڵـەدا زیندانی کـرد. وەرزی زسـتـان چـووه قەرەباغ و محەممـەدی ڕۆمـی غـولامی باوەڕپێکراوی خـۆی لـەگـەڵ دووهـەزار پیاوی تـۆکمـە و تەیار لە تـەورێز بەجێهێشت. محەممەدی ڕۆمی ڕاپەڕی و ئۆرتۆق ڕەشیدی و چەند کەسێکی دیکەی لە بەند دەرباز کرد و بە هەموو هێز و توانایەوه بـەرەو شیراز ڕکێفـی کوتـا. وەختایەک مەلیک ئەشرەف ئەم هەواڵە تاڵەی بیست، ئەگەرچی زسـتـان بـوو بەڵام دیسانیش گەڕایەوه تەورێز و پاشماوەی وەرزەکەی لەوێ تێپەڕ کرد.

## ساڵی ٧٤٧ / ١٣٤٦ ـ ٤٧

لەم ساڵەدا چاوقوڵکە سێبەری بە سەر تەورێز کێـشا و ئـەویش بـوو بـە سەرباری زۆرەملییەکانی مـەلیک ئـەشرەف. بـۆیـە هـەرکـەس تـوانی لـە ئازەربایجانەوه ڕووی کرده پەنا و پەسیوێکی ئارام و هێور.

هەر لەم ساڵەدا ئاغامحەممەدی ئایتەمووری نۆکەری میر وەجیهـەددینی سەربەدار، دوای کوژرانی میری خۆی ببوو بە سەرۆکی سەربەداران و بە دەست خواجە عەلی شەمسەددینی سەربەدار لە خوێن گەوزا و نەما.

## ساڵی ٧٤٨ / ١٣٤٧ ـ ٤٨

لەم ساڵەدا مەلیک ئەشرەف لەگەڵ لەشکری شکۆمەندی بە مەبەستی گرتنی بەغدا کەوتەڕێ. میر شێخ حەسەنی گەورە لە نێو وارش و شوورەی شارا خۆی مەڵاس و پەنا دا. مەلیک ئەشرەف ماوەی دوو مانگان باوەشی لە دەورەی وەراند، بەڵام وەختایەک بڵێسەی گەرما مەچەکەی لە بەژنی گەوهەرینی کەش و هەوا ئەنگاوت، زانی چی پێناکرێ، بۆیە بەرەو تەورێز کشاوە. جڵەوی ملک و ماڵی دایە دەس پەنجەی لێوەشاوەی خواجە عەبدولحەیی و لە ئازەربایجان و عێراقی عەجەم و ئەرران و موغان کەوتە هەڵپێچانی ژێردەستان و هەژاران و مسکێنان و ئەوەندەی بۆی کرا دایکرووساندن و دوولکی لەسەر ملی دانان.

## ساڵی ٧٤٩ / ١٣٤٨ ـ ٤٩

ئەم ساڵەیان مەلیک ئەشرەف خواجە عەبدولحەیی وەزیری گرت و گاڵی دا بۆ قەڵای ئەلەمووت(هەڵەمووت). کاتێک بیستییەوە کە سەرۆکی قەڵا بە چاکی لەگەڵی دەجووڵێتەوە و زۆری ڕێز دەگرێ، کابرایەکی بە ناوی میتەری بەحری بەڕێکردە قەڵای هەڵەمووت و مزگێنی بۆ نارد کە دیسان کردوومەتەوە وەزیر و دەبێ بەرەو تەورێز بێ. بەحری خواجەی وەرگرت و یەکسەر بردی بۆ قەڵای ئەلەنجەق هەتا لەوێ بەند بکرێ.

خواجە مەسعوودی دامغانی کە نووسەرێکی خەتخۆشی قەڵەمڕەنگین بوو داینا بە وەزیر.

## ساڵی ٧٥٠ / ١٣٤٩ ـ ٥٠

لەم ساڵەدا مەلیک ئەشرەف بە پەنجاهەزار سوارەی دڕ و ئاژاوە بزووت و خۆی لە گرتنی ئیسفەهان خۆش کرد. میر نەجیبەددینی برای میر زەکەریای وەزیر و خواجە عیمادەددین مەحموودی کرمانی کە ئەو کاتی لە سایەسەری میر شێخ ئەبووئیسحاقەوە حوکمڕانی شار بوون، دەورەی دیوار و حەساری ئیسفەهانیان تەنی و بەرەنگار وێستان. مەلیک ئەشرەف پەنجا ڕۆژ شەڕی

تێهاڵاندن و ئاڵقەی لە دەورەی دان. پاشان شەڕ وەستا و کەیخودا و نێوبژیوان تەساڵحەیان پێکردن و ئیسفەهانی خوتبەیان بە ناوی نۆشیروانەوە خوێندەوە. بڕی دووهەزار دینار زێڕی سوور و بایی سەدهەزار دیناریان شمەک و کەلوپەل بۆ ناردە دەرەوە. مەلیک هەر بەو هێندە قنیاتی کرد و ڕەزامەندی دەربڕی و گەڕایەوە ئازەربایجان.

## ساڵی ٧٥١ / ١٣٥٠ ـ ٥١

میر شێخ ئەبووئیسحاقی ئینجوو بۆ دووەم جار لەشکری بردە سەر دارولعیبادەی یەزد. سەرکردەکانی تێداچوون و بە سەرشۆڕی و ناهومێدی گەڕایەوە شیراز.

هەر لەم ساڵەدا مەلیک ئەشرەف مەیل و هەوای جیهانگیری لە کەللەی دەرکرد و شوورە و دیواری قایمی بە دەورەی ڕوبعی ڕەشیدیدا گێڕا و بنەی لێداکوتا و داینا کە تازە نەبزوێ و جووڵە نەکا. لەبەر ناجسنی و ئاکاری نالەباری سەبارەت بە سەرۆک و سەرکردان بڕوای بە کەس نەمابوو. هێندەی پێنەچوو کە کچی حاکمی ماردینی خواست و گواستییەوە بۆ تەورێز و قەڵا و سەرسەرای ڕەشیدی ڕازاندەوە و داوەتێکی گەورەی کرد و جەماوەرێکی زۆری نان دا. بەڵام دوای ئەوەی چاوی بە کچە کەوت، پەشیمان بۆوە و بە دڵییەوە نەنووسا و شەوێک زیاتری ڕانەگرت.

## ساڵی ٧٥٢ / ١٣٥١ ـ ٥٢

لەم ساڵەدا شێخ زاهیدی برای سوڵتان وەیسەی کوڕی شێخ حەسەنی گەورە پێی نایە بازنەی ژیان. خواجە سەلمان ئاوای پیرۆزبایی لەدایکبوونی کردووە:

لە دەرگانەی کەلووی بەرزی شەرەف مانگێ درەوشاوە

وەکوو تیشکی هەتاو شۆقی لەسەر دوندی جیهان داوە

بە فەرمانی خودا شین بوو پەل و پنجی گوڵی جوانی
هەوارگەی شینی ئاسمانێ بــە وی ڕوخســاری ڕازاوە
ئــەوێستا حــەوسەد و پــەنجا و دوو ساڵە بە کۆچیدا
جیمادی دوو دەڕوا و ڕۆژ هەینییە و بیستویەکی ماوە
کە شێخ زاهیدی پێ پیرۆز سەری هەڵدا لە جەغزی ژین
هەموو دنیا بە تیشک و بەختی ئەو باڵی ترووسکـاوە

## ساڵی ٧٥٣ / ١٣٥٢ ـ ٥٣

لەم ساڵەدا مـیر شـێخ ئەبووئیـسحاق لەشـکرێکی قـورس و گرانــی بــە سەرکردایەتی کەیقوبادی برازای لــە شـیرازەوە بــەرەو کرمــان گــاڵ دا. مـیر موبارزەددین محەممەد لەگەڵ شاشوجاعی کوڕی ســەرەڕێیان پێگرتــن و لـــە «پێنج ئەنگوست» هێزەکانیان تێکهەڵــەنگووتن. چەنــد کــەس لــە ســەرۆک و سەردارانی شیراز لەو هەڵلایەدا گیران. میر کەیقوباد سەرکردەی پــــەلامارەکە تێیقووچاند و ڕەوی. میر موبارزەددین محەممەد سەربەرز و باڵادەست تەشریفی گەڕایەوە ناوەندی دەسەلاتی خۆی.

## ساڵی ٧٥٤ / ١٣٥٣ ـ ٥٤

سەرەتای ئەم ساڵە میر موبارزەددین محەممەد گەمارۆی شیرازی دا و تەنگی بە شێخ ئەبووئیسحاق هەڵچنی. موبارزەددین و شەرەفەددین موزەففەری کوڕی لەبەر تەنینەوەی هەوایەکی ناپاک و ناخۆش لە شیراز گیرۆدەی نەخۆشییەکی سەخت بوون. شاشەرەفەددین موزەففەر بەرگەی نەگرت و پێیچوو، کەچی باوکی چاک بۆوە. ئەگەرچی موبارزەددین هەر وەرەنگاز بوو بەڵام شلەی نــەدایـــە و بێوچان ڕیزەکانی پتەوتر تەنی و هەتا شاری نەگرت هەدای نــەدا. مـیر شـێخ ئەبووئیسحاق بە هەزار دەرد و کوێرەوەری خۆی لەو گێژاوی نەمانە دەربـــاز کرد و بەرەو شووڵستان و قەڵای سپی ڕەوی.

## ساڵی ٧٥٥ / ١٣٥٤ ـ ٥٥

لەم ساڵەدا میر موبارزەددین محەممەد بە تەمای گرتنی ئێراق ڕووی کردە ئیسفەهان و بە هەوڵ و هەڵسووڕانی شاشوجاعی کوڕی گرتی.

هەر لەم ساڵەدا بریکاری موعتەزیدوبیللای عەبباسی کە لە میسر بوو، بە شێوەیەکی سەربەخۆ جڵەوی خەلافەت و پێشەوایەتی دەکێشا و بە مەبەستی وەرگرتنی بەڵێنی پێمل بوون هاتە هەرێمی فارس. موبارزەددین محەممەد بە پەیڕەوی لە زانایان و گەورەمامۆستایانی فارس پەیمانی بەرفەرمان بوونی لەگەڵ بەست و سەری وەبەرهێنا و سەکۆبەرزەی میحرابی مزگەوتان و سکەی سەردەم کە لە زەمانی کێشەی بەغدا و کوژرانی خەلیفە موستەعسەمەوە شوێنەواری ئەوانی لێبڕابوو، سەرلەنوێ ژیانەوە.

## ساڵی ٧٥٦ / ١٣٥٥ ـ ٥٦

ئەمیر موبارزەددین محەممەد لەم ساڵەدا، قوتبەددین شامەحموودی کامڕەوای کوڕی ناردە سەر قەڵای شوانکارە. حاکمی وێندەرێ خۆی لەبەر نەگرت و لە دەروازەی دواوەی قەڵا کە بەرەو سەحرا دەکرایەوە، ڕایکرد. قوتبەددین مەحموود لەسەر کورسی دەسەڵاتی ئەو حوکمدارە پاڵی دایەوە و کاروباری گرینگ و پێویستی ڕێکخستن و پاشان ئاڵای سەرکەوتنی بەرەو ناوەندی مەزنایەتی کە شیراز بێ هەڵدا.

هەر لەم ساڵەدا مەولانای بەرزەجێ و سەرجەلەی بیروردانی گەلان و قسەڕۆیشتووی بواری زمانپاراوی کە دوڕ و گەوهەری لە لێوی دەباری و دین و شەریعەت پێیدەنازی، واتە مەسعوودی تەفتازانی لەسەر ناوی جانیبەگخان کتێبی «موختەسەری تەلخیس»ی نووسی. جانیبەگ کە پادشای خوجەند بوو بە ڕەگەز دەگەڕاوە سەر ئۆزبەکخان کوڕی تۆغرۆڵ کوڕی بووقیا کوڕی قەرالووتویست. ئەم بنەماڵەیە بە سوڵتانەکانی کۆکئۆدە بەناوبانگن و هەر لە

کۆنەوە هەرێمەکانی باڵی ڕاست وەک ئاراس و کەیقوباد و پاحی و قۆرران بە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیان دادەندرا(؟).

## ساڵی ٧٥٧ / ١٣٥٦

وەک دیارە قەراڵ لە زاراوەی کافراندا بە مانای پادشایە و لەم ساڵەدا قەراڵی ئەنکرووس شان بە شانی بەگلەرانی لاز و هۆزی سێرف(سێرب) بە مەبەستی شەڕ و لێکدان و بەرەنگاربوونەوەی سوڵتان ئوورخان بەرەو ئاناتۆلی بزووت. وەختایەک سوڵتان ئوورخان بە هاوپشتی و یەکانگیری کافرانی زانی، سولەیمانپاشای وەزیری ڕاسپارد کە بەرەو خاکی ڕۆم بکشێ و بەرپەرچی قۆشەنی دوژمنان بداتەوە. پاشا بەپێی فەرمان کەوتە خۆ ساز کردن و دابینی چەکوچۆڵ و ئامرازی پێویست.

هەر لەم ساڵەدا شێخ حەسەنی گەورە دوای حەڤدە ساڵ حکوومەت لە بەغدا ڕووی کردە بارگای ڕەحمەتباری یەزدانی و سوڵتان وەیسەی کوڕی کەوڵی پادشایەتی خستە سەر شانی و لە جێی باوکی دانیشت. خواجە سەلمان ئاوای مبارەکبادی کردووە:

لەسەر پۆپەی بڵیندی گومبەزی ئەم ئاسمانە
قریوەی شادمانی پۆلی مزگێنیدەرانە
کەوا مانگی ڕەجەب، ساڵ حەوسەد و پەنجا و حەوتە
خەڵک قۆڵی لەسەر کێشاوە خواوەند پشتیوانە
لە پێتەختی عێراق تەختی ئەمیران شیاوی شانی
لە کۆڕی گەورەپیاوان تاقە تاقانەی جیهانە
هەموو سوڵتان لە دواوەی ڕادەوەستن شێخە وەیسە
پەنا و پشت و جڵەوداری گەڕی چەرخی زەمانە
درشت و وردی گەوهەرباری ئەستێران کە دیارن
هەموویان پایەناز و ڕایەخن بۆو میرە خانە

## سالی ٧٥٨ / ١٣٥٦ ـ ٥٧

سولەیمانپاشای وەزیری سولتان ئوورخان وێڕای فازلبەگ و ئۆجە یاقووب و بەگلەران و کۆمەلێک پالەوانی بەئەزموون ڕوویان کردە مێشەی «کەمەر» و گاوگۆلێکی زۆری کافرانیان قڕ تێخست و بە مەشکەیان دەرهێنان و فوویان تێکردن و کەلەکیان پێهەلبەستن و سواریان بوون و پێیان لە دەریا پەڕینەوە و ڕوویان کردە ڕۆمئیلی و قەلای چەمەنی و ئەیاستە ئوورکەلەک(؟) و قۆکرحەساری و قەلاتی... و «ئۆجە ئواسی»یان گرت کە ئێستە بە ئۆجە یاقووب ناوبانگی دەرکردووە.

میر شێخ ئەبووئیسحاق هەر لەم سالەدا کەوتە دەست هێزەکانی میر موبارزەددین محەممەد و لە مەیدانی سەعادەتی شیراز کە بە قەلەمی خۆی ڕەنگابوو کوژرا. دەلێن لە کاتی کوژرانیدا ئەم چوارینەی داناوە:

داخم کە لەبۆ مەلی تەمەن دانە نەما
هیوا بە کەسوکار و بە بێگانە نەما
سەد حەیفێ کە لەو ماوە کەمەی کورتی ژیان
هەرچی گوتمان، بێجگە لە ئەفسانە نەما

هەر لەم سالەدا جانیبەگخان کە چۆنیەتی زولم و زۆرەملی بەربلاوی مەلیک ئەشرەفی لە زمان قازی محێدینی بەردەعی بیستبوو، لە ڕێی دەربەندی شیروانەوە بەرەو ئازەربایجان کشا. وەختایەک مەلیک ئەشرەف ئەو هەوالەی لێڕوون بۆوە، دوای چەند سال بنەگر بوون لە ڕوبعی ڕەشیدیدا، هاتەدەر و لە شەنبیغازان ڕکێفی بەتال کرد. چوارسەد سەر یەستر و هەزار سەر وشتری لە زێڕ و گەوهەر و کالای گرانبایی بار کرد و لەگەل لەشکرێکی بە لێشاو ناردی بەرەو ئۆجان. وەختایەک جانیبەگخان نیزیکتر بۆوە شەمزا و بە خواجە

لۆءلۆئی فەرموو کە وێڕای خەزێنە و خاتوونان لە گریوەی مەرەند لەسەر چاوەی خواجە ڕەشید چاوەڕێ بن. چما بارەکە بە لای کامەرانیدا سووڕا بگەڕێنەوە تەورێز و ئەگەر بەپێچەوانە کەوت بچنە مەرەند.

مەلیک ئەشرەف بەرەو ئۆجان بزووت و لەسەر گردێک چاوی لە ڕێگا بڕیبوو کە جانیبەگ هەڵقوڵی و لە باڵی «سەراب»ەوە دەرکەوت. فەرمووی کە هێزەکانی دەورەی بدەن. کاتێک مەلیک ئەشرەف وای بینی زانی ئەو حاڵە بەو حاڵە ناشێ و لەڕێوە بایدایەوە شەنبیغازان. لەوێ شەوەری کرد و بۆ بەیانی بە دوای خەزێنە و خاتووناندا جاڵە بۆوە. ئەوانەی لەگەڵی بوون لێیهەڵبڕان و تەنیا لەگەڵ دوو غولامی گورجی لە مەرەند گەیشتە کۆچ و باری. خەڵکی وێندەرێ وەختایەک بە شکانی ئەو غەیانەیان زانی هەڵیانکردە سەر ماڵ و خەزنە و داڕووتاندنی و ژنەکانیشی هاوار و زیرەی پرشوبڵاوبوونیان لێهەستا. مەلیک ئەشرەف بەرەو خۆیە تێیتەقاند و لە هۆبە و ڕەشماڵی شێخ محەممەدی باڵغچی دابەزی کە لە دەشتێ هەڵیدابوو. شێخ محەممەد بە دەورەیدا هات و کەوتە خزمەت کردنی، بەڵام خێرایەکیش سوارێکی تیژباڵی وەک بای شەماڵی بە مەبەستی ڕاگەیاندنی چۆنیەتی حاڵوباڵەکە بەرەو هۆردووی جانیبەگخان گاڵ دا. میر بەیاز ڕاسپێردرا کە بچێ و ئەشرەف بێنێتە خزمەت خان. میر بەیاز ئەشرەفی هێنایە تەورێز و حەشیمەت لە سەر بانانەوە خۆڵەمێشیان بە سەری ئەو چارەڕەشەدا دەکرد.

وەختایەک جانیبەگ چاوی پێیکەوت لێیپرسی باشە بۆچی ئەو مەڵبەندەت خاپوور کرد؟ گوتی نۆکەر بەپێچەوانەی ویستی من جووڵاونەوە و دەستیان وەشاندووە. جانیبەگخان لە ئۆجانەوە چووە هەشتەرۆ و لەوێ مەلیک ئەشرەفی کوشت. سەرەکەی نێردرایەوە تەورێز و لە سەر دەرگای مزگەوتی مەراغەیانیان هەڵاوەسی. پاشان جانیبەگخان تیژ بەرەو تەورێز خوشی و لە کۆشکی میری دابەزی و حکوومەتی ئەو ناوچەیەی دا بە بەردیبەگی

کوڕی و خۆی گەڕایەوە ئوورگەنج. چەند ڕۆژێکی کە پێچوو بەردیبەگ بیستی باوکی ناساخە و ڕووی کردە ئوورگەنج. کە بەردیبەگ ئاوا بوو، ئەخیجوقی وەزیر دەسەڵاتی بە سەر مەڵبەندی ئازەربایجاندا شکایەوە.

## ساڵی ٧٥٩ / ١٣٥٧ ـ ٥٨

لە هەڕەتی بەهاریدا سوڵتان وەیسە بە تەمای گرتنی ئازەربایجان لەشکری بۆ لای تەورێز ئاژاوت. ئەخیجوق کە لەبری جانیبەگخان و کوڕەکەی حکوومەتی هەڵدەسووڕاند، تابشتی نەهێنا و شکا و تەورێزی لە چنگ دەرکشا.

هەر لەم ساڵەدا میر موبارزەددین محەممەد لە شیرازەوە بە مەبەستی گرتنی ئازەربایجان و تەورێز هێرشی بردە سەر ئەخیجوق کە پاش ڕەوین لەبەر سوڵتان وەیسە لە نەخجەوان ئاڵای زۆرەملی هەڵدابوو. ئەخیجوق هەتا لای «میانە» بە پیرییەوە چوو. لەوێ قۆشەنیان تێکهەڵەنگووتن و لێکیان دا و ئەخیجوق شکا و میر موبارزەددین ڕووی کردە تەورێز. کەیخودا و ڕیشسپی و مەزن و ماقووڵ و بازرگان و کاسپکار و سنعەتکاران چوونە پێشوازی و گەلێک پێشکێشی و دیارییان بردە خزمەتی. خۆی ڕۆژی هەینی بوو بە پێشنوێژ و خوتبەیەکی جوان و پاراوی خوێندەوە و دۆعای بۆ خەلیفەی عەبباسی کرد. دوای چەند ڕۆژان خەبەر هات کە سوڵتان وەیسە لە بەغداوە بە مەبەستی مەیدانداری بەرەو تەورێز کشاوە. موبارزەددین محەممەد کە بەو باسوخواسەی زانی لەڕێوە گەڕایەوە شیراز.

## ساڵی ٧٦٠ / ١٣٥٨ ـ ٥٩

لەم ساڵەدا شاشوجاع چاوی باوکی لەبەر ئاکاری نالەباری هەتەر لێبڕی و تۆڵەی کوڕان و میرانی لێکردەوە و لە قەڵایەکی فارسدا خستییە سیاچاڵەوە. پاشان خۆی دانیشتە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی و جێی گرتەوە. زانایانی زەمان لەم بارەوە گوتوویانە:

ڕۆژگارێ شکۆی بۆ سەر هەر بۆ سەر چوو
لەشکری هیندی بڕی تاکوو لە نیلێ دەرچوو
پەیمانەیی بەخت و حوکمی کاتێ پڕ بوو
سۆمایی لە چاوی ڕۆڕژا، چوو هەر چوو

## سالێ ٧٦١ / ١٣٥٩ ـ ٦٠

میر ئوورخان کۆچیدوایی کرد و بەرەو دنیای هەرمان هەنگاوی نا[١]. سولتان مرادخانی کوڕی کە بەڕاستی بۆ کار و کرداری مووی لە بابی وەرنەگێڕابوو لە بوورسا چووە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی.

سولتانی خوابەخشیو مەودای هەشتا و سێ سالی تەمەن هەلبوارد و سی و پێنج سالی پادشایەتی کرد و لە بوورسا نێژراوە. سێ کوڕی لێکەوتۆتەوە: سولتان مراد، سولەیمان پاتشا و سولتان قاسم کە لە سەردەمی ژیانی باوکیدا دەستی لە دنیا بەرداوە[٢].

هەر لەم سالەدا سولتان مرادخان لە کەلیبوولی تێپەڕی و گەیشتە تووربنێس(؟) و قەلای چوورلی داگیر کرد و شەڕێکی قورس و گرانی لە قەلای... هالاند و تێکوپێکی دا و قەلای «بەرغووز» (بەرقاز)ی سەر لێواری ڕووباری «مەریچ»ی کێشایە ژێر حوکمی.

## سالی ٧٦٢ / ١٣٦٠ ـ ٦١

لەم سالەدا سولتان مرادخان، ئۆرنووسبەگی نارده سەر مەلبەندی «ئەبسالە» و گرتی و دیل و دەسکەوتێکی زۆری هێنا.

---

١- نیسانی ١٣٦٢ی مردووە. (مێژووی عوسمانی، ب ١، ل ١٩١.

٢- شەش کوڕی بووە: ١- سولەیمانپاشا ٢- سولتان ٣- مراد ٤- برایم ٥- خەلیل ٦- قاسم. کە مرد مراد و خەلیل و برایم مابوون. (مێژووی عوسمانی، ب،١، ل ١٨٦).

## ساڵی ٧٦٣ / ١٣٦١ ـ ٦٢

سوڵتان مراد لەم ساڵەدا لالا شاهینی بە مەبەستی گرتنی ئەدرنە بەڕێکرد و کافرانی تەکوور بەرەنگاری وێستان و شەڕێکی بەگەرمە قەوما و سەرەنجام خەنیمان بەزین و پەنایان بردە بەر قەڵای ئەدرنە. سوڵتان مرادخان دوابەدوای لەلە(لالا) شاهین‌دا[1] گەیشتێ و دەورەی ئەدرنەی دا. سەرداری تەکوور (ڕۆمی) بە سواری لۆتکەی سەندەڵ بە ڕووباری هەستاوی مەریچ‌دا ڕایکرد. خودی ئەدرنە کە یەکێکە لە باژێرە گەورەکانی خاکی ڕۆم کەوتە بەرچنگی پیاوانی خانەدانی عوسمان. لالا شاهین بەرەو زەغرە (زاقرە) ڕۆیی و قەڵای «ئەبساڵە» و «ماڵغەرە»ی گرتن.

## ساڵی ٧٦٤ / ١٣٦٢ ـ ٦٣

سوڵتان مرادی غازی مزگەوتێکی گەورەی لە شانشینی بوورسا ساز کرد.

## ساڵی ٧٦٥ / ١٣٦٣ ـ ٦٤

سوڵتان وەیسە بە ئامانجی گرتنی شیروان بزووت کە لەو دەمەدا خەبەر هات خواجە مەرجانی بریکاری سوڵتان لە بەغدای داروسسەلام سەری هەڵداوە. سوڵتان دەمکوتی وی بە گرینگ زانی و ڕووی کردە بەغدا. لەبەرەوەی وەختی هەستانی ئاو و هەڕەتی لافاو بوو، خواجە مەرجان بەنداوی «قۆرج»ی شکاند و هەتا مەودای چوار فرسەخان دەورەی بەغدا سێلاوی تێکەڕا و ڕێگای هاتوچۆ هەڵبڕا. دەستەیەک لە هێزەکانی سوڵتان بە سواری لۆتکان لە نوعمانییەوە تێپەڕین. سەرەتا قۆشەنی خواجە مەرجان بەرەگەیان لە سپای سوڵتان گرت،

---

١ - لەلە، لالا، لالە، بە کەسێک دەگوترێ کە مناڵی پیاوماقووڵان و میران بحاوێنێتەوە و ڕایانبێنێ. ئەم وشەیە تورکییە و لە ڕاستی‌دا پلەی لەلەیەتی میرزادان دراوە بە پیاوی گەورە. لەلە دەمڕاست و بریکارە و لەگەڵ مانا کوردییەکەی کە تەنیا خزمەتکاری زارۆکانە و کارێکی سووکە جیاوازە.

بەڵام وەختایەک خودی فەرمانڕەوا لە دواوە گەیشتێ و خواجە کەژاوەی سوڵتانی بە چاو ئەنگاوت، حەجمینی نەما و باڵی لێڕوا و ڕەوی و پردی هەڵبڕی و خۆی وە پەنای قەڵای بەغدا دا و کەوتە لالانەوە و پاڕانەوە و دەربڕینی پەشیمانی. سوڵتان چاوی لە تاوانی پۆشی و چی دی سەری نەکوتایەوە و گەڕایەوە.

هەر لەم ساڵەدا موبارزەددین محەممەدی گردەنشینی زیندانیکراوی قەڵای سپی، لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵکی قەڵاتێ دەستی تێکگرت و قەڵاداری لێخست و تەپڵی سەرهەڵدان و دژایەتی کوتا. لەبەروەی شاشوجاع لە کردەی خۆی خەجاڵەتبار و پەشیمان بوو، دەرگای قەڵای بە ڕوودا کردەوە و سەرلەنوێ تاجی فەرمانڕەوایەتی نایەوە سەری. دیسانیش دەستەیەک پیلانگێڕ هەدایان نەدا و بە دژی لەگەڵ باوکی گەلاڵەی کوشتنی شاشوجاعیان داڕشت. شاشوجاع بەم کەتنە ڕەشەی زانی و باوکی دوور خستەوە بۆ قەڵایەکی گەرمەسێراتی شیراز. پاش چوار ساڵ کە تووشی گەلێک نەخۆشی سەخت و کوشندە ببۆوە، بە مەبەستی هەواگۆڕکێ نێردرایە قەڵاتی بەم و لەوێ چۆوە بەر دلۆڤانی خودا.

## ساڵی ٧٦٦ / ١٣٦٤ ـ ٦٥

لەم ساڵەدا سوڵتان وەیسە بە سەر مووسڵی دادا و بەیرام خواجەی تورکمان خۆی نەگرت و هەڵات. خواجە سەلمانی ساوجی لەم بارەوە گوتوویەتی:

تەتەر هەواڵی هێنا گراوە شاری مووسڵ

موبارەک بێ لە میری بەڕیزی مەزنی عادڵ

سوڵتان وەیسە شوێنی لە دووی بەیرام خواجە گێڕا و دمم لەسەر پشت کەوتە سەری و بە خۆی و خێڵ و بار و خێزانی هەتا دەشتی مووش هەڵیبڕی و

لەوێ دەستی گەیاندێیە و تالانی کرد و دایڕووتاند. خواجە سەلمان ئاوای باس کردووە:

مارێکە دوژمنی تۆ، خوشی بەرەو دەشتی مووش

مێرووولەی شیری تیژت زۆری گرتوون ماری وا

هەر لەم ساڵەدا سوڵتان مرادخان بە فەرمانی قەرەڕۆستەمی قەرامانی پێنج‌یەکی لە ڕێگران ئەستاند و بەپێی فتوای خەلیل‌پاشای مەشهوور بە جەندرلوو، ئەو غولامانەی کە لە ڕیزی چەتان دەیانگرتن و دایاندەبڕین، دەیانخستنە ژێر ڕکێفی پیرۆزی میر و کڵاوی لمەدی چەرمگیان دەنانە سەری. پاشان ئەو کۆمەڵەیان بە یەنگیچەری(یەنی‌چەری) ناودێر کرد و لەوێ ڕۆژێوە داکەوتوون.

لە درێژەی ساڵدا سوڵتان مرادخانی حوکمڕانی ڕۆم بە کەلیبوولی‌دا لە ئاوی دەریا پەڕییەوە و بەرەو ئاناتۆلی کشا و قەڵای «بیغا»ی گرت. لەشکری «سێرف» (سێرب) پاڵیان ڕێکدا و هەڵیانکردە سەر مسوڵمانان. لالا شاهین لە «چەرمن» پەلاماری دان و کافری پرش‌وبڵاو کردن و یەخسیر و خەنیمەتێکی زۆری وەچنگ هێنا.

## ساڵی ٧٦٧ / ١٣٦٥ ـ ٦٦

سوڵتان مرادخان دەستی بزاوت و قەڵای کووتاهییە و سیما و ئاگری یووز و تووشانلووی گرت.

هەر لەم ساڵەدا(؟) سوڵتان خەلیلی کوڕی شێخ برامی حاکمی شیروان مرد. ڕەگەزی میرانی شیروان ئاوا بە چەند پشتان دەچۆوە سەر نۆشیروانی عادڵ: سوڵتان خەلیل کوڕی شێخ برایم کوڕی سوڵتان محەممەد کوڕی کەیقوباد کوڕی فەڕوخزاد کوڕی فەرامەرز کوڕی گوشتاسب – کە ناوچەی گوشتاسبی شیروان بە دەستی وی ئاوەدان کراوەتەوە – کوڕی فەڕوخزاد کوڕی مەنووچێهر – ناسراو بە

خاقان کە خاقانی شاعیر نازناوی خۆی لە ناوی ئەو وەرگرتووە- کوڕی کەسران (خوسرەوان) کوڕی کاوس کوڕی شەهریار کوڕی گرشاسف (گرشاسب) کوڕی ئەفرەیدوون (فەرەیدوون) کوڕی فەرامەرز کوڕی سالار کوڕی یەزید کوڕی جوون کوڕی مەرزۆبان کوڕی هۆرمز کوڕی نۆشیروان.[1]

## ساڵی ٧٦٨ / ١٣٦٦ ـ ٦٧

شاشوجاع زانی کە تەورێزی لە ڕقی شیرازییان پشتی شامەحموودی برای دەگرن، بۆیە لێبڕا پێش ئەوەی تەورێزی بگەنە هانای برای، تۆزی لێ بە با کا. بۆ وەدیهاتنی ئامانجی شیرازی بەرەو ئیسفەهان بەجێهێشت.

بەم چەشنە ڕۆیی هەتا کۆشکی زەرد
بە تۆزی سپای، جیهان لاژوەرد

شامەحموود بەرەی شەڕی تەنی و دوای تێکهەڵچوون کشاوە و سەری بردەوە بەر قاپێلکی شار. شاشوجاع لە ڕووکاری ئیسفەهان خێوەت و ڕەشماڵی هەڵدا و ئابلۆقەی شاری دا. پاش ئەوەی جەماوەری شار کەوتنە تەنگەتاوی، سەید و مەلا و پیاوماقووڵان وەدرکەوتن و وایان دانا کە شامەحموود بێتە لای شاشوجاعی برای و پێک بێن. وەختایەک کەیخودا گەڕانەوە، شامەحموودیش ڕەزامەندی لەسەر بڕیاری ئەوان دەربڕی و بە خۆی و پەنجا سوارەوە چووە دەست ماچ کردنی برای. پاشان میوانییەکی گەورە ڕێکخرا و گەلێک دیاری و خەلاتی میرانە دابەشکرا و شاشوجاع بە کامڕەوایی بایدایەوە شیراز.

---

١- ئەم ڕەگەزنامەیە تێکەولێکەیە و بە سەرچاوەیەکی تەواو هەڵە دادەندرێ. بۆ وێنە هۆرمزی چوارەم کوڕی نۆشیروان باوکی خوسرەو پەروێزی دووەم و قوبادە. بنەماڵەی ساسانی کەسێکیان نەبووە بە ناوی مەرزۆبان.

## ساڵی ٧٦٩ / ١٣٦٧ ـ ٦٨

لەم ساڵەدا میر قاسمی برای سوڵتان وەیسە ڕووی کردە بەر بارەگای ڕەحمەتی یەزدانی و تەرمەکەیان بردەوە نەجەف و لە پەنا نێژگە و مەرقەدی پاک وترووسکەداری شەهید و پێشەوای مسوڵمانان حەزرەتی عەلی - خودای مەزنی لێ ڕازی بێ- ناشتیان. قەبری میر قاسم کەوتە داوێنی گۆڕی میر شێخ حەسەنی باوکی. خواجە سەلمانی ساوجی شینێکی ئاوای بۆ گێڕاوە:

| | |
|---|---|
| حەیفێ کە خۆری ڕۆژی جەوانی | خۆی بۆ نەگیرا وەک دوابەیانی |
| مخابن خونچێک بەر لە پشکووتن | خەزەڵوەری دی بە بای زریانی |
| بگری ئەی فەلەک بۆو خۆرەتاوە | سەرەونخوون بوو بە خۆی نەزانی |
| تێکڕا دەزانین دەمرین و دەڕۆین | بەلام هەموو کەس نیە گومانی |
| کە میر قاسمی لاوژەی مێرمناڵ | هەواری بردە سەرای هەرمانی |

هەر لەم ساڵەدا بەیرامبەگی خۆشەویستی سوڵتان وەیسە لەبەر شووهەڵکێشان لە شەراب خواردنەوەدا، نوقمی دەریای نەمان بوو. سوڵتان وەیسە وای تازیە بۆ داگرت کە هیچ کەس وێنەی نەدیبوو. کەپەنکی ڕەشی بە سەر باڵای سپی خۆی هەڵکێشا. کوێنی کردە بەر خاتوونان و هیزاری خستە ملی سەرۆک و سەرداران. کاری ئاوا نالەبار و دزێو و قورپێوانی، هەتا ئێستا کەس نەیدیبوو بە چاوانی. خواجە سەلمان ئاوای شین بۆ گێڕاوە:

| | |
|---|---|
| شکاوە پشتی گەردوون گەر چ ناڵێ | لە تاوی مەرگی بەیرەمشا دەناڵێ |
| لەشی وەک ئاوی ژین ڕۆچوو بە خاکا | خودایە نووری خۆتی تێبهاڵێ |

## سالّی ٧٧٠ / ١٣٦٨ ـ ٦٩

لەم ساڵەدا شاشوجاع ویستی کە خاتوونێکی داوێنپاک لە بنەماڵەی سوڵتان وەیسە بخوازێ هەتا لەوەی بەو لاوە شەڕ و گەڕ و ئاژاوە ببڕێتەوە و سوڵتان وەیسە دەس لە یارمەتیدانی شامەحموودی برای هەڵبگرێ. کەیخوایەتی ئەم ژنخواستنە کەوتە ئەستۆی میر ئیختیارەددین حەسەنی قۆرچی و ئەویش خۆی هەڵپێچا و بە تەیاری بەرەو ئازەربایجان کەوتەڕێ. وەختایەک شامەحموود بەو کارە زانی، خێرایەکی خواجە تاجەددینی ورد و وریا و فێڵەبازی بێهاوتای وەزیری نارده خوازبێنی کچی سوڵتان. کاتێک نێردراوی هەردک لا لە شوێنێک بە خزمەت سوڵتان گەیشتن، گەلێکیان قسە و باس لە نێوانیدا هات و چوو. سەرەنجام لەبەروەی شاشوجاع لە کاغەزی خۆیدا فیز و دەماری وەلا نەنابوو، بەڵکوو قەڵەم لە داب و نەریتی خۆبەکەمزانیدا زمانی کورتی هێنابوو، داواکەی دۆڕاند. شامەحموود لە نامەکەیدا نووسیبووی: کۆیلەم و سەروماڵم ئی مەزنی خۆمە.

سوڵتان ڕاسپاردەی شاشوجاعی جواب کرد و کچەی کردە دەسگیرانی شامەحموود. خواجە تاجەددین، خاتوونی بەرزەوەجاخی سەراپەردەی پاکی سواری کەژاوەی جوان و ڕازاوەی شایان کرد و بە شان و شەوکەتەوە بەرەو ئیسفەهان گەڕایەوە. خواجە سەلمان دیمەنی ئەم زەماوەندەی ئاوا نەخشاندووە:

گەردوون گۆوەندی گێڕا، هەی هەی لەو زەماوەندە

وڵاتی پێ گەشاوە، دڵ بۆیە لێرە بەندە

هەتاو پەڕی هەڵداوە، مانگیش گۆشەی کێشاوە

جووتبوونی حۆری و مەلیک، چەن دیمەنێکی مەندە

## ساڵی ٧٧١ / ١٣٦٩ ـ ٧٠

لەم ساڵەدا کە ساڵی سەگە، میر تەیمووری کوورەگان لە مەڵبەندی «کەش» کە ئێستا بە شاری سەوز ناسراوە تاجی پادشایەتی لە سەر نا. تۆرەمەی بەرزەوەجاخی ئاوا دەگەڕێتەوە سەر چەنگیزخان: میر تەیموور کوڕی میر توغرای کوڕی میر بەرکەل کوڕی میر ئیلتەکیز کوڕی میر ئیجل(؟) کوڕی قەراجار نۆیان - کە لە سەردەمی چەنگیزخان‌دا سپاسالاری هەرەمەزن و هەمەکارەی سەردارانی جوغتای‌خانی کوڕی چەنگیزخان بوو - ئەویش کوڕی سیورغان(؟) کوڕی «ئیردەمجی»یە ناسراو بە بەرلاس - کە خێڵی بەرلاس دەچێتەوە سەر وی- ئەو کوڕی قاجوولی بەهادورە کە کاکی قەبەل‌خانی کوڕی تۆمنەخانە و بە سێ پشتان براکەی و چەنگیزخان دەگەنەوە یەکتر.

لەبەرەوەی بۆتە زاوای میر حوسێن بە کوورەگانی ناودێر کراوە. میر تەیموور ڕۆژی ٢٧ی مانگی شابانی ساڵی ٧٣٦ی کۆچی لە خودی «کەش» پێی ناوەتە بازنەی ژین و ساڵی ٨٠٧ کۆچی کردووە. ماوەی سی و شەش ساڵ لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی بنەی داناوە و هەرگیز نەوەستاوە و پەلی کوتاوە بۆ زۆربەی هەرێم و مەڵبەندە خۆش و ئاوەدانەکانی جیهان. لەشکری دەنگ داوە و ئەم ناوچانەی گرتوون و بەیدەستی کردوون: ئەوبەرڕووبار، تورکستان، خارەزم، بەدەخشان، هیندووستان، خوراسان، سیستان، کیچ، مەکران، عێراقی عەرەب و عەجەم، فارس، ئازەربایجان، مازندەران، گیلان، شیروان، ئەرران، کوردستان، گورجستان، دیاربەکر، ڕۆم و شام.

میر تەیموور چوار کوڕی بووە: ١- میرزا جانگیر کە لە سەردەمی ژیانی باوکی‌دا بەرەو دنیای خامۆشان فڕی. ٢- میرزا شێخ عومەر کە حکوومەتی هەرێمی فارس خرابوویە بەردەستی و لە زەمانی باوکی‌دا کە دەورەی قەڵای «خورماتوو»یان دابوو بە تیری کوردێک ئەنگوا و کوژرا. ٣- میرزا میرانشا کە فەرمانڕەوای هەرێمی ئازەربایجان و عێراقان و دیاربەکر بوو هەتا سنووری ڕۆم

و شام. دوای نەمانی باوکی لە تەورێز بە دەستی هێزەکانی قەرەیۆسف تەمەنی بڕایەوە. ٤- میرزا شاروخ کە لە ڕۆژگاری بابیدا حوکمڕانی مەڵبەندی خوراسان بوو. پاش کۆچیدوایی میر تەیموور بوو بە پادشای ئێران و تووران.

## ساڵی ٧٧٢ / ١٣٧٠ ـ ٧١

میر وەلی حاکمی مازندەران کە پشتاوپشت دەگاتەوە سەر جووجی فشاری(؟) برای چەنگیزخان، لەشکری سازکرد و بەرەو ڕەی بزووت. سولتان وەیسە لە ئازەربایجانەوە خۆی لە بەرپەرچدانەوە و لووت شکاندنی خۆش کرد و هێزی دەنگ دا و پێشەنگی سوارەکانی لە ڕەی شەڕیان هەڵگیرساند و شکان، بەڵام چونکە قۆشەنی سولتان وەیسە لە دواوە بە هەموو توانست و تواناوە دەهات، میر وەلی تابشتی بەرەنگاری و دەسکردنەوەی نەهێنا و سەری جڵەوی وەرگێڕا و دەرپەڕی. کۆمەڵێکی بەرچاو لە چەکدارانی کوژران و بە دیل گیران و سولتان هەتا سمنان کەوتە پەیکەردەی میر وەلی و لەوێوە بە ڕاوێژی میران و سەرکردان گەڕایەوە.

## ساڵی ٧٧٣ / ١٣٧١ ـ ٧٢

لەم ساڵەدا سولتان وەیسە بە تەمای پەلاماردانی میر وەلی لە تەورێزەوە سپای بۆ لای ئۆجان جڵەوکێش کرد هەتا ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ڕزگار بکا، کەچی لەناکاو سولتان میر زاهیدی برای بە مەستی لەسەر بانی کۆشکی ئۆجانەوە هەڵدێرا و پسا و چارەنووسی دیاریکراوی کە مەرگ بێ پاش و پێشی نەکرد و فزەی لێبڕا. سولتان لەبەر پەژارەی نەمانی برای، چوونەکەی هەڵوەشاندەوە و ڕووی کردە تەورێز. لەم دەرفەتەدا شاشوجاع کاغەزێکی لە میر وەلی نووسی و دنەی دا بۆ دژایەتی لەگەڵ سولتان.

## ساڵی ٧٧٤ / ١٣٧٢ ـ ٧٣

میر وەلی بە لەشکرێکی گەورە و گرانەوە لە مازندەرانەوە هاتە دەڤەری ڕەی و لەوێوە چووە ساوە. موبارەکشای حوکمدار و کەیخودا و پیاوماقووڵان و

کۆمەڵێکی مسکێنان، ڕایانسپاردە لای میر وەلی کە چۆنە زەحمەتت وەبەر خۆت ناوە و بۆ ئەم باڵە کشاوی، خۆ ئێرە لە ژێر حوکمی سوڵـتان وەیـسە دایـە؟! سوڵتان فەرمانڕەوایەکی بەهێز و سپادارە و چمـا مـیر وەلــی لــەم زسـتانەدا دەستمان لێهەڵگرێ و قۆشەنی نەخاتە داوی دەرد و کوێرەوەری باشترە.

میر وەلی گوتی باج و پیتاکی چەنـد ساڵــەمـــان دەوێ و ڕیـش‌سپـــی و گەورەپیاوان بێنەدەر، ئەودەم دەگەڕێینەوە. خەڵکی ساوە شـانیان بـۆ نـەوی نەکرد و لێی‌وەدەست هاتن و بەرامبەری چەقین. میــر وەلیش سـەری لــە گێرە و کێشە دەخورا و پەلاماری دان و لە ماوەی دوو حەوتوودا بە زۆرداری شاری گرت. موبارەکشا سەرەتا خۆی شاردبۆوە، بەڵام دواتر لە کەلێنێ هاتەدەر و چـووە خزمەت میر وەلی و کچی خۆی دایە. پاش ئەم هەڵمەت و سەرکەوتنە میر وەلی گەڕاوە مازندەران.

## ساڵی ٧٧٥ / ١٣٧٣ ـ ٧٤

میر تەیموور لەم ساڵەدا کیژی ئاق‌سۆفی(؟) حوکمڕانی «قۆنقـورات»ی بـۆ میرزا جانگیری کوڕە گەورەی خواست و گواستییەوە بۆ سەمەرقەند.

هەر لەم ساڵەدا ڕووباری دیجلە هەستا و شاری بەغدای داگرت و جگە لــە چەند کۆشکەڵ و خانووی بەرز و قایم نەبێ هەمووی تێکتەپاند و بردی. نیزیکەی چل هەزار کەس تێداچوون. مەولانا ناسری بوخاری لەو کاتی‌دا ئەم دوو لینگـە شێعرەی داناوە.

دیجلە ئەم ساڵ وا دەڕۆیی کارەکەی مەستانە بوو

کەف‌چەرێن و پێ بە زنجیر، بۆ چما دێوانە بوو؟!

## سالی ٧٧٦ / ١٣٧٤ ـ ٧٥

سولتان وەیسە بە مەبەستی بە گژداچوونی میر وەلی لە تەوریز بنەی گویستەوە بۆ قەلاچکەی ڕەشیدی. لەوێ تووشی نەخۆشی پێمردن بۆوە. مەزنەمیرانی دەسەلات بە ئیزنی قازی شێخ عەلی و خواجە شێخ محەممەدی کەجەجانی چوونە سەرینی میری بناغەدانەری ڕێوشوێنی جیهانپاریزی و فەرمانڕەوایەتی و داوایان لێکرد وەسێت بکا. سولتان گوتی حکوومەت و دەسەلات هی حوسێنە و شێخ حەسەن حوکمڕانی بەغدایە. گەورەپیاوەکان جوابیان داوە کە ئەو برا گەورەیە و شتی وا ناسەلمێنێ. فەرمووی جا بۆخۆتان دەزانن. سەرۆک و سەرداران ئەم قسەیان بە ئیزن دان لە قەلەم دا و شێخ حەسەنیان گرت. شەوی شەممۆی دووەمی مانگی جیمادی یەکەم، ئەم سولتانە بەرەو باغی بەهەشت بالی گرت. هەر لەو شەوەش‌دا شێخ حوسێن بە شەربەتی شەهادەت تامی زاری درا. خواجە سەلمان لە تازیەی‌دا فەرموویەتی:

ئەی فەلەک باژۆ نەرم، دەردت بە ئێران کردووە

خاکی ئێرانت بە مەرگی شاهی وێران کردووە

ئاسمانێکت لە جێی خۆی ئاوەژوو کردۆتەوە

کەوتووە پشتەوقەفار، دەشتێکی گێران کردووە

سولتان حوسێن دوای باوکی لە تەوریز کلاوی پادشایەتی لە سەر نا. خواجە سەلمان ئاوای پیرۆزبایی لێکردووە:

ورد و درشتی دنیا لە ژێر فەرمانی تۆیە

هەتاوی پادشاهی وەکوو خەرمانی تۆیە

ولات هەمووی ئەمینە بە سێبەری سەری تۆ

دەرەی بەهەشتە گشتی، مەکۆی هەرمانی تۆیە

هەر لەم ساڵەدا میر شامەحموودی کوڕی میـر موبارزەددیـن محـەممـەد کۆچیدوایی کرد. شاشوجاع وەختایەک پێیزانی ئەم چوارینەیەی دانا:

نەمـا مەحموودی بـرام شێری لـەبـەر دەلـەرزی
شـەڕی لـە مـن دەهـاڵانـد بـۆ دەسـەڵات و بـەرزی
دنیامان کـردە دووبەش تا خەڵک ئـاسوودە بـێ
ئەو بوو بە میری ژێرخاک، منیش میری سـەر عەرزی

شاشوجاع هەر کە بیستی برای نەماوە، لەڕێوە بەرەو ئیسفەهان بزووت و هەرێمی عێراقی داگیر کرد.

## ساڵی ٧٧٧ / ١٣٧٥ ـ ٧٦

لەم ساڵەدا شاشوجاع بە مەبەستی شەڕ لەگەڵ سوڵتان حوسـێنی کـوڕی مەلیک وەیسە ڕووی کردە ئازەربایجان. لە دەوروپشتی هەمـەدان هێزەکانیـان تووشی یەک هاتن و دوای هەڵگیرسانی ئـاگری کوشـت و کوشـتار، سوڵـتان حوسێن ڕەوی و لەشکری پەخش و پەرێشان کەوتەوە. شاشـوجاع سـەربەرز و سەرکەوتوو چـووە تـەورێـز. سەید و مـەلا و قـازی و مـەزن و مـاقـووڵ و گەورەگەورەی ئازەربایجان چوونە پێشوازی کەژاوەی شاهانەی و بە ڕامووسانی سەرپەنجەی بەخشەندەی گەشانەوە. شاشوجاع لە سـەر تـەختی پادشـایەتی ئۆقرەی گرت و خواجە سەلمان قەسیدەیەکی دانا کە ئاوا دەست پێدەکا:

لـە سـایـەی بازی باڵپیرۆزی سوڵتانی
وڵات ئـاسـوودە بـوو، نایمێنێ وێرانی

شاشوجاع دەنگ و ئاوازەی حافز یۆسفشای بیستبوو، بۆیە ناردی بە دوای‌دا و هێنایە کۆڕی خۆی و ئەویش گەلێک چاکی گوت. شاشوجاع گوتی ئێمە ناوبانگی سێ کەسی مەنشووری تەورێزمان بە گوێ ئاشنا ببوو کە هەر یەکەی چەشنێکن. سەلمان لە سەرروویە، یۆسفشا کەوتۆتە نێوەندێ و شێخ محەممەدی کەجەجانی دژاودژە. گۆیا شاشوجاع کەیفی بەو دەستە شێعرەی سەلمان نەبزووتووە کە شێوەی داگیرسانیمان خستە بەرچاوان و بەم قەسیدەیە بڕوای پێهێناوە کە ئاوای دامەزراندووە:

وەختێ تاریفی ڕوخساری لە بیرمدا درەوشاوە

ئاسۆی ڕۆژهەلاتی شێعرم، خۆری تێزا و ترووسکاوە

دوای چوار مانگ کەیف و نەهەنگ و خۆشڕابواردن، وەختایەک کە خەبەری بۆ هات شایەحیای کوڕی(؟) لە شیراز ئالای دژایەتی و بەربەرەکانی هەلداوە، خێرایەکی پێی‌نایە ئاوزەنگی و بەرەو شیراز بزووت.

هەر لەم سالەدا میر تەیموور بە مەبەستی هێرش بۆ سەر مەلبەندی خارەزم هەستا و بێئەوەی کاری بە سەرۆک و سەرداران بێ، بۆ جاری چوارەم[1] لەگەل پۆلە زەبروەشنێک ڕۆیی و خەنیمانی شکاند و بە سەریان‌دا سەرکەوت. لەو دەمەدا توقتەمێشخان هاتە خزمەتی و میر لاواندییەوە و بە سەری کردەوە و بەڕێی کردە سەقناق.

---

١- دەبێ جاری سێهەم بێ، چونکە دواتر باسی چوارەمجار دەکا و میر تەیموور تەنیا چوار نۆرە پەلاماری خارەزمی داوە و خاپووری کردووە.

## ساڵی ٧٧٨ / ١٣٧٦ ـ ٧٧

لەم ساڵەدا بۆ دووەم جار توقتەمێشخان هاتە خزمەت میر تەیموور و گەلێکی دەستی ڕێز لێنا و لەشکرێکی وەپێش کرد و ناردی بۆ سەقناق و جڵەوی حکوومەتی وێندەرێی دایە دەستی.

هەر لەم ساڵەدا میر تەیموور ڕاسپاردەی نارده هیرات لای میر غەیاسەددین و بناغەی دۆستایەتی و هاوپشتی و هاوپەیمانی پتەو کردەوە.

## ساڵی ٧٧٩ / ١٣٧٧ ـ ٧٨

شاروخمیرزای کوڕی تەیموورشا چاوی بە دنیا ڕوون بۆوە. میر تەیموور زستانەهەواری بردە «زنجیرسەرای» و بە گوتەی نووسەری «مەتلەعوسسەعدەین» میرزا جانگیری کورە گەورەشی هەر لەم ساڵەدا ڕووی کردە بەر دلۆڤانی یەزدانی مەزن.

## ساڵی ٧٨٠ / ١٣٧٨ ـ ٧٩

میر تەیموور بۆ جاری چوارەم هەڵمەتی بردە سەر خارەزم و سێ مانگ و شازدە ڕۆژ قەڵاکەی گەمارۆ دا و بۆی نەگیرا. یۆسف سۆفی لەو سەروبەندەدا مرد.

## ساڵی ٧٨١ / ١٣٧٩ ـ ٨٠

سەرەنجام لەم ساڵەدا میر تەیموور قەڵاتی خارەزمی گرت و شاری «کەش»ی زێدی خۆی کەڵتە کردەوە و دەستی بە سەر و ڕوویدا هێنا.

هەر لەم ساڵەدا شاشوجاع ئاژاوەی ساروو عادلی ڕۆمرکاند کە یەکێک بوو لە سەردارانی سوڵتان حوسێن. ساروو عادل کە سەرقاڵی سەربزێوی بوو، وەختایەک شاشوجاع پەلاماری دا، پەنای بردە بەر قەڵای سوڵتانییە و ئاخرییەکەی شانی بۆ شا نەوی کرد و بە خاکەساری هاتە خزمەتی. فەرمانڕەوا نێوچاوانی لێ تاڵ نەکرد و دڵخۆشی داوە و گەڕایەوە شیراز.

## ساڵی ٧٨٢ / ١٣٨٠ ـ ٨١

میر تەیموور هرووژمی کردە خوراسان و لە سەرەتای مانگی قوربان‌دا گەیشتە شارۆکەی کووسوویە. حاکمی وێ کە مەهدی بێ چوو بەرەوپیری و بەخێری هێنا و پادشا چاکەی لەگەڵ کرد. پاشان ڕۆیی بۆ تاییاد کە ماڵی مەولانای مەزنی بەرزەجێ زەینەددین ئەبابەکر لەوێیە. بە خزمەت مەولانا گەیشت و دواندی و لەو دیدارە خێر و بەرەکەت و قازانجێکی زۆری پێگەیی. لەوێوە ئەسپی تیژبەزی بەرەو شارۆچکەی فووشەنج (پووشەنگ) تاو دا کە کەوتۆتە شەش فرسەخی هیرات بە باڵی ڕۆژاوادا. شەوی هەینی لە نیوەی مانگێدا قەڵای فووشەنجی گرت و دواتر سەری جڵەوی بەرەو شاری «هەری» وەرگێڕا.

## ساڵی ٧٨٣ / ١٣٨١ ـ ٨٢

لەم ساڵەدا میر تەیموور مەڵبەندی گرینگ و ئاوەدانی هیراتی داگیر کرد. هەروەها سوڵتان مرادخانی فەرمانڕەوای ڕۆم ناوچەی نیزیک بەدلکلوو قەبای ئاغاجحەساری گرت کە مەشهوورە بە حەوشەی «حەقیەغدی».

## ساڵی ٧٨٤ / ١٣٨٢ ـ ٨٣

لە سەرەتای ئەم ساڵەدا سوڵتان مرادخان قەڵای «سیرووز»ی کێشایە ژێر ڕکێفی. هەروەها سوڵتان ئەحمەدی کوڕی سوڵتان وەیسە کە ئەردەوێلی وەک پاوانەمیر درابوویە، لە سوڵتان حوسێنی برای ڕاپەڕی و لە تەورێز کوشتی و کاروباری حکوومەتی بە دەستەوە گرت.

## ساڵی ٧٨٥ / ١٣٨٣ ـ ٨٤

تەیموورشا هەڵیکوتایە سەر سیستان و سەرلەبەری ئەو هەرێمە و دەوروبەرەکەی گرت و گەڕایەوە سەمەرقەند.

هەر لەم ساڵەدا ساروو عادل، سوڵتان بایەزیدی کوڕی سوڵتان وەیسەی لە سوڵتانییەی عێراق کردە پادشا و پیاوی ناردە شیراز و داوای

يارمەتي و كۆمەگي كرد لە شاشوجاع. ئەويش لەشكري بەرەو سولتانييە دەنگ دا و دواي ڕاپەڕاندني كاروباري پێويست، جلەوي ئەسپي خۆشاژۆي بۆ لاي دزفوول و شووشتەر شل كرد و شيشي سوورەوەبووي بە چاوي سولتان «شبلي» كوڕيدا كێشا و كوێري كرد.

## ساڵي ٧٨٦ / ١٣٨٤ ـ ٨٥

مير تەيموور هێرشي بردە سەر جورجان و ئەستەراباد و حاكمي وێ كە مير وەلي بوو دەريپەڕاند و پاشان بەرەو شاري ڕەي شۆڕ بۆوە و بنەي لێخست.

شەوي يەكشەممۆي ٢٢ي كولەمانگي ئەم ساڵە شاشوجاع لە كونجەخانووي تەنگ و تاريك و نەوي دنيا و دركەلاني دەرد و مەينەتەوە ڕووي كردە مێرگ و مێرغوزاري ئۆقرەيي و جاڕەگوڵي حەسانەوە و هەواري ژياني گوێستەوە. شاشوجاع سەرتۆپ و هەوێني بنەماڵەي خانەداني موزەففەر و پياوێكي سەر و ڕووخۆش و زانا و يەكجار بليمەت و تێگەيشتوو بوو. پەنجا و سێ ساڵ و دوو مانگ ژيا و بيست و پێنج ساڵ و دە مانگ و بيست ڕۆژي فەرمانڕەوايەتي كرد. لە دواي نەماني شايەحيا لە ئيسفەهان و سولتان ئەحمەد لە كرمان جێي باوكيان گرتەوە و هەميشە پێكەوە ناڵێك و ناتەبا بوون.

## ساڵي ٧٨٧ / ١٣٨٥ ـ ٨٦

لەم ساڵەدا مرادخاني حوكمڕاني ڕۆم، قەڵاي ئەسكەتە و مارووڵەي گرت و گەلێك قاپ و تاسي زێڕ و زێو كەوتە چنگ غەزاكەراني دوژمنبەزێن كە بە سەري خۆيان ڕۆدەكردن. سولتان مرادخان ئەو ديمەنەي كەوتە بەردڵي و لەو دەميڕا تاسكلاوي ئاڵتوون و زێو بوو بە باو.

هەر لەم ساڵەدا مير تەيموور هەتا سولتانييەي عێراق بزووت و دواي گرتني ڕووي كردە ڕۆستەمدار و مازندەران و لەوێوە گەڕايەوە سەمەرقەند و لە ساليسەراي خێڵ و باري خست.

توقتەمێشخان بە مەبەستی دەمکوتی ئەحمەد، هێزێکی پەنجاهەزار سوارەی ناردە تەورێز و ناوچەکە بوو بە پێخوستی تالانوبڕۆ و پاشان قۆشەن بە دەربەندی شیرواندا هاتەوە.

## سالّی ٧٨٨ / ١٣٨٦ ـ ٨٧

لەم سالەدا سولتان مرادخان قەلای زیحنە، قەرەوریە، دەرامە، قەوالە و مەناستەری داگیر کرد.

هەر لەم سالەدا وەختایەک تەیموورشا باسی هێرش و پەلامار و پێشێلبوونی تەورێز و ئازەربایجانی بیست و زەبری توقتەمێش ڕەنگی دایەوە، سپای بەرەو ئەو بالە ئاژاوت و ئازەربایجان و گورجستانی گرت و زستانەهەواری بردە قەرەباغی ئەرران.

## سالّی ٧٨٩ / ١٣٨٧ ـ ٨٨

میر تەیموور لەم سالەدا بە ئامانجی خاشەکێشانی ئاژاوەی قەرەمحەممەدی تورکمان لە زستانەهەواری قەرەباغەوە ڕووی کردە ئازەربایجان. لە کاتی گەڕانەوەدا هێزەکانی ڕێیان کەوتە دەشتی مووش و ئەخلات. حوکمڕانی وێ نەهاتە پێشوازی و سەری وەبەرنەهێنا و میر فەرمانی تالان و داڕووتاندنی عێلات و مەڕ و مالاتی دەرکرد. بە گوێی گۆلی «وان»دا ڕۆیی بۆ عادلجەواز و حاکمی ناوچەکە ملی بۆ دانەواند و بە بەندی ماهیدا چووە وان.

لە درێژەی سالدا هەرێمی عێراق و فارسی گرت. خەبەری بۆ هات کە توقتەمێشخان ئەوبەڕووباری داکرووساندووە و مال و سامان و حکوومەتی شیرازی دایە دەس خانەدانی موزەففەر و میر سەید شەریفی بلیمەتی بە سال و کۆچەوە لە شیراز هەلگرت و سەری جلەوی بەرەو سەمەرقەند وەرسووڕاند.

##ساڵی ٧٩٠ / ١٣٨٨

لەم ساڵەدا تەیموورشا بۆ جاری پێنجەم پەلاماری خارەزمی دا و جارێکی تر ئەو مەڵبەندەی گرت و شووره و قەڵا و نەردەک و بەرزەکی دارماند و لەگەڵ خاکی ڕەش ڕێکی کرد.

## ساڵی ٧٩١ / ١٣٨٨

توقتەمێشخان لەم ساڵەدا بە مەبەستی بە گژداچوونی میر تەیموور لەشکری کێشا و بێئەوەی ئامانجی وەدیبێ لە ڕێگادا گەڕاوە. تەیموور ئەسپی تیژفڕی بەرەو مەغوولستان تاو دا و چڵپاندی و لە ژێر سمی یەکسماندا پێخوستی کرد. هەروەها میرزا میرانشای کوڕی بە ئامانجی سەرکوتی میرانی سەربەدار و جانی قوربانی ناردی بۆ خوراسان.

## ساڵی ٧٩٢ / ١٣٨٩ ـ ٩٠

ئایدین ئۆغلی بە مەیل و بە دڵی خۆی سەری وەبەر دەرگانەی سوڵتان مرادخانی غازی هێنا و خوتبە و سکەی بە نازناوی شکۆمەندی میرانەی ڕازاندەوە.

## ساڵی ٧٩٣ / ١٣٩٠ ـ ٩١

لەم ساڵەدا[1] سوڵتان مرادخان هەڵیکردە سەر لاز ئۆغلی (لازار دێسپووت)ی سێرب و شەڕ و کوشتار لە نێوانیاندا قەوما. سەرداری کافرانی گرت و کوشتی. یەکێک لە جڵەودارانی لادینان بە ناوی میلووش[2] بە بیانووی سەر وەبەرهێنانی میر و چوونە دەس ماچ کردنی، گەیشتە خزمەت سوڵتانی غەزاکەر و دەستەوبەجێ بە خەنجەران دایگژایە و ئەو شەنگەدارەی باخچۆڵەی

---

١- مێژووی عوسمانی لە لاپەرە ٢٩١ی بەرگی یەکەمدا دەڵێ، ئەم شەرە ڕۆژی ١٦ی شابانی ساڵی ٧٩١ ی ک/١٠ی ئاگوستی ١٣٨٩ی زایینی ڕووی داوە.

٢- میلووش کووبیلۆویچ یا ئووبیلۆویچ. (مێژووی عوسمانی، ب ١، ل ٢٩٤).

فەرمانڕەوایەتی بە لادا هێنا و دەماری ژیانی هەڵبڕی. ئەو سوڵتانە گیانفیدایە بەرەو هێلانەی پەڕپەڕۆچکەی بەرزی یەزدانی باڵی ئـەنگاوت و شـەهید بـوو. شێست و یەکساڵی تەمەن هەڵبوارد و ماوەی سی و یەک ساڵی حوکمات کـرد. ئیلدروم بایەزید و یاقووب چەلەبی لە پاش بەجێما. خێرەددینپاشای ناسراو بە قەرەخـەلیل مەزنـەوەزیری ئـەو سوڵـتانە شـەهیدە بـووە. عـەلیپاشـا و سارووجەپاشا کە گەیشتوونە پلەی وەزیرایەتی کوڕی قەرەخەلیل بوون.

سوڵتان ئیلدروم بایەزید لە تەمەنی ٤٤ ساڵیدا جێی باوکی گرتەوە و بوو بە فەرمانڕەوا و یاقووب چەلەبی برای کوشت. یەکەم کەسە لە میرانی خانـەدانی عوسمان کە دەستی بـە خـوێنی بـرای خـۆی سـوور کـردووە. عـەلیپاشـا و تەیموورتاشی بە وەزیر دانان. قەرەتووە و قەڵای ئۆسکووب و سیرووز بە دەست ئۆرنووسبەگ گیران. قەڵای ئەلاشار و ئەفلاق گـیران و حـاکمی ئـەوێ بـاجی لادینانەی پێوەبەسترا.

هەتا لە بیرمە با هەروا سەرپێی ناوی چـەنـد کـەس لـە زانـایـان و مەزنەمـەلاکانی هاوچـەرخی سوڵـتان مرادخـان بخەمـە ڕوو: ١- مـەولانا جەماڵەددیـن ئاقسەرایی کە بیرمەندانی زەمان لایان وایـە بـە چـوار پـشتان دەگاتەوە ئیمام فەخری ڕازی و بەوپەڕی وردەکاری پەراوێزی لەسـەر «تەلویح» نـووسیـووە. ٢-مەولانا فەناری کە لە وڵاتی عەجەمەوە پەڕەوازە بـووە و لای مەولانا جەماڵەددین خوێندوویەتی و لە ماوەیەکی کورتا بۆتە پیاوێکی فرەزان لە نێو پیتۆڵانی ڕۆمدا. ٣- میر سەید شەریفی جورجانی کە بە ئـاواتی دیـداری مەولانا جەماڵەددین چۆتە ئاقسەرای و هەتا گەیوەتێ مامۆستا نەماوە و دیتنی دەستی نەداوە. مەولانا گەلێک نووسراوەی مەنشووری لـە پـاش بـەجێمـاوە. ٤- مەولانا مەحموودی قازی بوورسا کە بە قۆجە ئەفەندی ناسـراوە و مووسـا چەلەبی کوڕی بۆ خوێندنێ چۆتە نیشتمانی عەجەمان و لە زانـستی ئـەژمێر و پێوانندا کەس دەسکی لە دوو نەکردووە. لە هەرێمی ئەوبەرڕووبار و خوراسان بە

قازیزادەی ڕۆمی ناوبانگی دەرکردووە. لە کاتی ئەستێرەگەریی میرزا ئۆلغبەگی کوڕی میرزا شاروخ کوڕی میر تەیموور لە سەمەرقەند، وێڕای میرزا بووە.
٥- مەولانا بورهانەددین ئەحمەد کە قازی ئەرزەنجان بووە. پەراوێزێکی بە ناوی «تەرجیح» لەسەر «تەلویح» نووسیوە. یەکێکە لە شێخەکانی سوڵتان حاجی بەکتاش کە خەڵکی سەرزەمینی ڕۆم بە پیری پیرانی دەزانن.

##ساڵی ٧٩٤ / ١٣٩١ ـ ٩٢

لەم ساڵەدا بە خزمەت سوڵتان ئیلدروم بایەزیدیان ڕاگەیاند کە قازی بورهانەددینێک بۆتە حوکمڕانی هەرێمی ڕۆم. سوڵتان بە تەمای گرتنی ڕۆم بزووت و دەروازەی قەڵاکانی تووقات و ئاماسییە و سامسۆن و «جانێک»ی ترازاندن و لەشکری وەسەرگێڕان.

## ساڵی ٧٩٥ / ١٣٩٢ ـ ٩٣

لەبەرووەی پارەکە کۆتوورۆم بایەزیدی حوکمڕانی قەستەموونی بە فیت و دنەی مەنتەشا ئۆغلی خۆی دابوویە دەسدرێژی و پەلوپۆ هاویشتن لە قەڵەمڕەوی سوڵتانیدا، ئیلدروم بایەزید چەشنی برووسکەی لەنەکاو بە سەری دادا، بەڵام وەختایەک گەیشتە مەڵبەندی ژێر دەسەڵاتی، کۆتوورۆم بایەزید مرد و ئەسفەندیاری کوڕی بەرەو سینووب ڕەوی. مەنتەشا ئۆغڵی چووە خزمەت ڕکێفی میر تەیموور و هانی پەلاماردانی هەرێمی ڕۆمی دا.

هەر لەم ساڵەدا قەڵاکانی تۆرقلوو، قەستەموونی و عوسمانجق کەوتنە دەست کارگێڕان و جڵەودارانی حکوومەتی عوسمانی.

ڕۆژی شەممەی هەشتی مانگی ڕەجەب میر تەیموور بەربینگی بە خانەدانی موزەففەر گرت و تۆوبڕی کردن و دەمی شیری تیژی لێنەپاراستن و تێکڕای هەرێمی فارسی بردە ژێر ڕکێفی. لەم بابەتەوە شاعیرێک دەڵێ:

ئالی موزەففەر بۆ پەند وەرگرتن لێیان بڕوانە

ئەو پۆلەمیرەی گۆی دەسەڵاتی شایانیان فڕاند

سالّی حەوسەد و پێنج و نەوەد بوو، نۆی مانگی ڕەجەب
که هیچی نەما و خاشەیان بڕا و تۆماریان دڕاند

سالّی ٧٩٦ / ١٣٩٣ ـ ٩٤

سولّتان ئیلدروم بایەزید قەلاّی «سەلانیک» کە شارۆکەیەکی خۆش و بەرچاوی مەڵبەندی هەرێمی ڕۆمە گرتی. ئەم شوێنە هەمیشە پیاوی وریا و هۆنەری لێزانی لێهەڵکەوتووە.

هەر لەم ساڵەدا میر تەیموور شاری بەغدا و قەلاّی تکریت و بەشێک لە خاکی کوردستانی گرت. میرزا تۆلّغبەگی کوڕی میرزا شاروخیش لە دایک بوو.

سالّی ٧٩٧ / ١٣٩٤ ـ ٩٥

قەرالّی ئەنکرووس لە ناوچەی «ئەفلاق»ەوە هات و باوەشی لە دەورەی قەلاّی «نیکبۆلّی» وەراند. وەختایەک ئیلدروم بایەزیدخان ئەم هەواڵەی بە گوێی ئاشنا کرا، چەشنی هەورەبرووسکە و بای بەتەوژم و تیژباڵ ئەسپی گاڵ دا و گەیشتە سەری و شەڕێکی قورس و گرانیان لە مابەینیدا قەوما و ئاخرییەکەی قەرالّی بەدکردار شکا و جەماوەرێکی زۆری بە چنگ مسولّمانان بە دیل گیران و قەراڵ بە هەزار ناری عەلی لەو گێژی گێژاوی نەمانە خۆی دەرباز کرد و بە پەلەپرووزێ ڕەوی.

هەر لەم ساڵەدا سولّتان ئیلدروم بایەزید قەلاّی کۆزەلجەحەساری (گوێزەلحەساری) بەرامبەر بە بوغازحەسار لە باڵی ئاناتۆلی ساز کرد. قەلاّتی «شیلی»ش گیرا. پیاوی لە «تەکوور»ی ئیستانبووڵ ڕاسپارد کە خەریکە هەڵکاتە سەری. ئەویش ملی بۆ نیری دەسەلاّتی دانەواند و وەئەستۆی خۆی گرت هەموو ساڵێ دەهەزار سکەی زێڕ بدا بە خەزێنەی میری. هەروەها لە گەڕەکی ئیسلامییەی شار قازی مسولّمان دابندرێ و مزگەوت و منارە ساز بکرێ و بانگ بگوترێ. ماوەیەک بەم شێوەیە داب و نەریتی ئیسلامی لەوێ کاری پێکرا و لە

مەوداى هەڵلا و هەراى مـير تـەيمووردا، كـافران وەخۆكـەوتن و مزگـەوت و منارەيان داڕووخاند و مسوڵمانانيان بەرەو ڕۆملى ڕەپاڵ نا.

## ساڵی ٧٩٨ / ١٣٩٥ ـ ٩٦

سوڵتان لەم ساڵـەدا تـوانى قـەڵاكانى قەرەفريـە و مەلاتييـە و دڕنـدە و ديوورێگى و بێهسەنى بگرێ.

سەيدێک بە ناوى مير قەوامەددين لە نەوە و نەتيژەكانى ئيمام محەممەدى عەسكەرى (؟) بنەى گوێستەوە بۆ ئامولى مازندەران و خەڵكى وێ زۆريان بـڕوا پێهێنا و بوونە مريد و دەروێشى. تەنانەت ئەفراسيابى جەلاوى كە حوكمـڕانى مازندەران بوو، باوەڕى پێهێنا. كاتێک سەيد بير و بڕواى مريدەكانى سەبارەت بە خۆى لەوپەڕى بەرزى و پتەوىدا هاتە بەرچاوى، لە خۆى ڕادى و ڕۆژێک كە ئەفراسـياب هـاتبووە زيـارەتى، گرتـى و سـەرەونخوونى كـرد و تەپـڵى فەرمانڕەوايەتى لێدا و ئاڵاى سەرهەڵدانى پێهەڵابرد و ڕۆژ بـە ڕۆژ دەسـەڵاتى گەشەى كرد و پەلوپۆى پتر هاويشت. لەو زەمـانىڕا هـەتا ئێـستا دەسـەڵاتى ناوچەكە پشتاوپشت بۆ تۆرەمەى ئەو بڕاوەتەوە و چەند ساڵێكە شاعەبباسـى سەفەوى كە لـە بـەرێڕا وەجـاخى دەچێتـەوە سـەر كچـى مـير عەبدوڵـڵاى مازندەرانى، تێكڕاى ئەو هەرێمەى خستۆتە سەر قەڵەمڕەوى خۆى و حوكمڕانى بۆ ديارى كردووە.

## ساڵی ٧٩٩ / ١٣٩٦ ـ ٩٧

لەم ساڵەدا مير تەيموور ماڵ و سامانى تەواوى هيراتى بەخشى بە مـيرزا شاروخى كوڕى. يەكێک لەو خەڵاتانەى كە پەروەردگارى مەزنى دڵاوا هەر لـەم ساڵەدا باربووى ميرزا شاروخى كرد، لەدايكبوونى موبارەكى ميرزا بايسونقور بوو كە چەشتەنگاوى دووشەممۆ، ٢١ى مانگى قوربان لە شانشينى هيرات پێـى نايە حەوشەى ژيان.

## ساڵی ٨٠٠ / ١٣٩٧ ـ ٩٨

مەلیک تاهیری(؟) حوکمڕانی ئەرزەنجان سەری وەبەر ئاستانەی سوڵتان ئیلدروم بایەزیدخان هێنا و کلیلی قەڵاکانی خۆی نارده بەر دەرانەی میری.

هەر لەم ساڵەدا میر تەیموور بە مەبەستی خەزا بەرەو هیندووستان لەشکری دەنگ دا.

## ساڵی ٨٠١ / ١٣٩٨ ـ ٩٩

میر تەیموور زۆربەی ناوچە و مەڵبەندەکانی هیندووستانی گرتن. مەحموودخان و مەلووخانی فەرمانڕەوای ئەو خاکەی هەڵبڕین و سەری جڵەوی گەڕانەوەی بەرەو سەمەرقەند وەرسووڕاند.

## ساڵی ٨٠٢ / ١٣٩٩ ـ ١٤٠٠

لەم ساڵەدا بۆ ئاخرجار میر تەیموور لەشکری بەرەو ئێران کێشا و لە قەرەباغی ئەرران خێڵبەزی کرد و لای مێژوونووسان بە هێرشی حەوت ساڵە ناسراوە.

سوڵتان ئەحمەد و قەرەیۆسف لەبەر لافاوی خەساربارى لەشکری زۆر و زەوەندی کە دەتگوت دیمەنی ڕۆژی ڕابوونەوەیە، خۆیان ڕانەگرت و هەڵاتن و بەرەو ڕۆم تێیانتەقاند. لە ناوچەی بێهسەنی شەیتان و شۆفار و دووزمانی نانخۆری ناندێندڕ کەوتنە نێوانیان و سەرساردی ڕووی تێکردن و دڵیان گەردی لێنیشت. میر قەرەیۆسف ڕووی وەرگێڕا و سوڵتان ئەحمەد ڕێگای چوونە ڕۆمی بەرنەدا. لە ئەنکوورییە شەرەفی دیداری سوڵتان ئیلدروم بایەزیدخانی پێبڕا. سوڵتان دەستی ڕێزی لێنا و چۆن چاکە ئاوای دڵخۆشی داوە و کووتاهییەی بە باج و پیتاکەوە باربوو کرد. لەم کاتەدا میر قەرەیۆسفیش هات و سوڵتان ماڵ و داهاتی «ئاقشار»ی بۆ خەرجوبەرجی دیاری کرد.

## ساڵی ٨٠٣ / ١٤٠٠ ـ ١

میر تەیموور لەشکری بردە سەر خاکی ڕۆم و قەڵای سیواسی گرت. لەوێوە ڕووی کردە عەرەبستان و سوڵتان فەرووخی(؟) حوکمڕانی میسر و شامی بەزاند و سوڵتانی هەتا شام ڕەتاند و ئەو وڵاتەی کردە پێخوستی تاڵانوبڕۆی. گۆڕی یەزیدی کوڕی موعاوییەی هەڵدایەوە و یەسکوپرووسکی ئەو بە لەعنەتکراوەی سووتاند. پاشان گەڕاوە و زستانەهەواری بردەوە قەرەباغ.

## ساڵی ٨٠٤ / ١٤٠١ ـ ٢

لەم ساڵەدا سوڵتان ئیلدروم بایەزید بە مەبەستی شان تێکگیراندن لەگەڵ میر تەیموور بەرەو ئەنکوورییە بزووت. هێزەکانیان پێکداهاتن و هۆزی گەرمیان و مەنتەشالوو و تاتار لە سوڵتان بایەزید هەڵگەڕانەوە و چوونە پاڵ تەیموورشا. هەر بۆیە قۆشەنی سوڵتان تووشی نوشوستی بۆوە و لە بەریبەیانیڕا هەتا بوولێڵەی ئێوارێ پاڵەوانانی شەڕکەر گەلێک تێکۆشان و ئازایانە ڕاوەستان. لەو گرمە و زەنازەنایەدا مستەفا چەلەبی کوڕی سوڵتان ون بوو. دەستەیەک قۆشەنچی ڕایانکرد و خودی سوڵتان پاش تاوپەڕی ڕۆژی نۆزدەی مانگی قوربان کەوتە چنگ مەحموودخان و بردییە لای میر تەیموور.

## ساڵی ٨٠٥ / ١٤٠٢ ـ ٣

میر تەیموور زستانەهەواری بردە ناوچەی ئایدین لە هەرێمی ئاناتۆلی و هەر خاکێکی کە سوڵتان گرتبووی داینەوە بە خاوەنەکانیان. قەستەموونی دا بە ئەسفەندیاربەگ ئۆغلی و قەرامان و ڕۆمی بۆ کوڕی قەرامان دانا و گەرمیان و مەنتەشای بۆ پاشەوار و میراتگران بەجێهێشت. بڕیاری دا کە سوڵتان بایەزیدخان بەربێ و مەڵبەندی بە میراتگەڕاوی بنەماڵەی باربوو بکرێتەوە، بەڵام لەم جەنگەدا کە ڕۆژی پێنج شەممۆی چاردەی مانگی شابان بوو خەبەر هات سوڵتان لە ئاقشار بە نەخۆشی هەناسەبڕکە لەم دنیا خۆنەگرە دەرچووە.

سوڵتان شێست ساڵ ژیاوە و سێزدە ساڵی حوکمات کردووە و گەلێک پاشماوەی چاک و بەخێروبێری لە دوا بەجێماوە. بۆ وێنە مزگەوت و خانەقای هەرەباشی لە ئەدرنە ساز کردووە. خوێندنگا و مزگەوت و تەکیە و نەخۆشخانەی زۆری دیکەی تەواو کردوون. پێنج کوڕی لە پاش بەجێماوە: سوڵتان سولەیمان، سوڵتان محەممەد، عیسا، مووسا و مستەفا. زانایان و گەورەمامۆستایان و شێخانی هاوچەرخی سوڵتان ئیلدروم بایەزید بریتین لە: ١- شێخ حامیدی کوڕی مووسا ئاقسەرایی کە غەیبزان بووە و خەڵک زۆریان بڕوا پێی بووە و بارگای گومبەزی پیرۆزی لەوێیە. ٢- شێخ بەیرامسوڵتان کە سەرەتا مامۆستای دەرسوێژ بووە و پاشان دەستی هەڵگرتووە. بە خزمەت شێخ حامید گەیشتووە و ئەویش بۆتە سوارچاکی مەیدان و بواری نەبەدی و کاری سەیر و سەمەرەی لێوەبەرچاو هاتووە و لە ئانکارا نێژراوە. ٣- شێخ شەهابەددینی سیواسی کە سەرەتا غولام و کۆیلەی کەسێ بووە و سەرەنجام بە خزمەت زەینەددینی خەوافی گەیشتووە و لە زانستی سۆفیایەتی‌دا پێگەیوە و لە ئاناڵیغ ئەسپاردەی خاک کراوە. ٤- قوتبەددین ئێزنیقی (ئێزنیکی) کە چاوی بە میر تەیموور کەوتووە و گەلێکی ئامۆژگاری کردووە. ٥- مەولانا شەمسەددین محەممەد کوڕی (؟) محەممەدی فەناری کە لە میسر خوێندوویەتی و پاشان گەڕاوەتەوە ڕۆم. سەرەتا بۆتە قازی بوورسا و سەرەنجام گەیوەتە پلەی وەزارەت. لە بواری لێکدانەوە و زمان و ئەدەبیاتی عەرەبەوە نووسراوەی بەنرخ و پاراوی هەیە و چۆتە زیارەتی مەکە و مەدینانیش. ٦- مەولانا حافزەددین محەممەدی کوردی کە بە کوڕی بەزاز ناسراوە. کتێبی «فتوای بەزازی» نووسیوە کە یەکجار پشتی پێدەبەسترێ. ٧- مەولانا مەجدەددین ئەبووتاهیر محەممەدی شیرازی کە لە بەستێنی وشەدا کتێبی «قامووس»ی داناوە و یەکێکە لە شوێنەوارەکانی. ٨- مەولانا محەممەد کوڕی مەولانا شەمسەددین محەممەدی فەناری کە لە تەمەنی هەژدە ساڵی لە قوتابخانەی میری‌دا بۆتە مامۆستا و بۆ

هیچ وانەیەک گرێی لەبەر نەبووە. ٩- مەولانا بەهائەددین عومەر کوڕی شێخ قوتبەددین کە موفتی سەردەمی خۆی بووە. ١٠- مەولانا عەلی شیرازی کە سەر و بەر و کاکڵ و توێکڵی شەرع و یاسا و ڕێسای دینی چاک زانیوە. ١١- مەولانا برایم کوڕی محەممەدی حەنەفی کە زۆر پیاوێکی زانا و فتوادەری زەمانی خۆی بوَوە. ١٢- مەولانا عیززەددین عەبدوللەتیف کە لەسەر «مشاریق و مەنار» شیکردنەوەی نووسیوە. ١٣- مەولانا ئەحمەدی گەرمێنی (سیواسی) کە پیاوێکی خوێندەواری لەزەبر و شاعیر بووە. بۆتە هاونشین و هاودەمی کوڕی شازادە سوڵتان سولەیمان. کتێبی «ئەسکەندەرنامە»ی لەسەر ناوی ئەو بە شێعر هۆندۆتەوە. چۆتە دیداری میر تەیموور و نوکتەکانی شایان وەسەر کەیف هێناوە و میر فەرمووی گەرماوی داوە و ئەو قسە خۆشەی کە لەوێ بە میری گوتووە زۆر مەنشوورە.

## ساڵی ٨٠٦ / ١٤٠٣ ـ ٤

میر سولەیمانی کوڕی سوڵتان ئیلدروم بایەزید لە بوورسا چووە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی و مووسای برای لێیهەڵبڕا و هەڵات و ڕۆیی بۆ لای کوڕی قەرامان و لەوێوە پەنای بردە بەر ئەسفەندیاربەگ و ئەویش سواری کەشتی کرد و ناردی بۆ کن «ویوودە»ی ئەفلاق. ویوودە لە زاراوەی ڕۆمیدا یانی دارۆغە یان حاکم. جا چونکە حاکمانی کافر باج و خەراجیان بە ئەستۆی دابڕاوە هەر بۆ سووکایەتی پێیاندەڵێن ویوودە. لە ڕاستیدا حاکمی ئەفلاق ناوی مەرجوو بوو. وەختایەک ئەم دەنگوباسانە بە وڵاتی وەربوون، میر سولەیمان بەرەو ئەدرنە لەشکری ئاژاوت.

هەر لەم ساڵەدا میر تەیموور تەواو ڕۆمی ڕۆمرکاند و کۆتایی بە هێرش و پەلامارەکانی هێنا و بە مەبەستی چوونە غەزای گورجستان و گرتنی قەڵاکانی هێزی دەنگ دا. دەستی کرد بە سازکردنەوەی شاری بیلەغانی ئەرران کە لە

کۆنەوە میچ و بان و دار و دیواری خانووبەرەکانی بە سەریەکدا تەپیبوون و بە چۆلەواری کەوتبۆوە.

## سالّی ٨٠٧ / ١٤٠٤ ـ ٥

شەوی چوارشەممەی حەڤدەی مانگی شابانی ئەم سالّە میر تەیمووری کوورەگان چوو بەرەوپیری بانگەوازی یەزدان و لە سەفەری «خەتا» لە ناوچەی ئۆترار سەری وەبەر ژێردەرانەی ڕەحمەتی پەروەردگار هێنا. کوڕان و نەوەکانی ناکۆکی کەوتە بەینیان و سەرەنجام شاروخمیرزا لە خوراسان تەختی دەسەلاتی گرتەوە.

## سالّی ٨٠٨ / ١٤٠٥ ـ ٦

لە سەرەتای ئەم سالەدا میرزا میرانشای کوڕی میر تەیمووری کوورەگان لە ئازەربایجانەوە ڕووی کردە خوراسان. وەختایەک میرزا شاروخی برای ئەو هەوالّەی بیست، دەستەیەک لە سەرکردەکانی وەک سۆفی تورخان و میر جیهانمەلیک و میر فیرووزشای لەگەڵ پێنجهەزار سوار دانا کە بەرەوڕووی بڕۆن. ئەگەر زانیان بەڕێزیان بە تەمای تەخت و تاج و سەربزێوی دێ، لێی وەخۆ کەون و چما دیتیان بە ڕێگای برایەتی و هاوپشتی خێلاتیدا بەپێی پێویستی بارودۆخ دەبزوێ، ئەوەندەی ئەرکی خزمەت و میوانداریيە ڕایپەڕێنن. کاغەزێکی نووسی و داینە دەستی و باسی چۆنیەتی ڕێسای درەوشانەوەی ناو و زڕانی ناوبانگ و یاساکانی سولّح و شەڕی تێدا کرد.

سەرکردەکان وێکڕا بزووتن و لە کالبووش گەیشتنە هۆردووی میرزا میرانشا و شەرەفی ڕایەخڕامووسانی میرانەیان پێبڕا و کاغەز و ڕاسپاردەی شاروخشایان بە خزمەتی گەیاند. میرزا میرانشاش باسی خۆشەویستی و یەکێتی و ڕووڕاستی خستەگۆڕ. فەرمووی خوداوەندی مەزن لە ڕۆژی بناوانەوە بەختەوەری لە چارەی برامان نووسیوە و فەرمانڕەوایەتی نەمرینی پێبەخشیوە و هیوای خستۆتە دەروونی ئێمە. من بە وردی گوێم شل کردووە بۆ

مزگێنی ئەم کەلامەی گوتوویەتی: «وا دەکەین براکەت پشتت بگرێ؛ بە نیشانەکانی خۆشمان دەسەڵاتێکوو دەدەینێ.»[1] سەران و سەرداران گەلێکیان دۆعا بۆ کرد و بە تاریفاتی‌دا هاتن. لە مەودای ئەم باروهەوایەدا میرزا ئەبابەکر لە بەندیخانەی سوڵتانییە ڕزگاری هات و چووە لای باوکی و پاش ڕاوێژ لێکردن پێکەوە بەرەو ئازەربایجان بزووتن.

## ساڵی ٨٠٩ / ١٤٠٦ ـ ٧

مووسا چەلەبی و عیسا چەلەبی کوڕانی سوڵتان بایەزید لەسەر دەسەڵات ملیان دەبەر ملی یەکتر نا و پێکهەڵپڕژان. عیسا کوژرا و مووسا لە بوورسا بوو بە فەرمانڕەوا.

## ساڵی ٨١٠ / ١٤٠٧ ـ ٨

میرزا میرانشای کوڕی میر تەیموور کە بە فەرمانی باوکی ببوو بە حوکمڕانی سەر تەختی دەسەڵاتی هۆلاکۆخان، لەبەروەی لە سواری ئەسپەوە گلابوو، مێشکی شڵەقابوو و نەیدەتوانی کاروباری وڵاتی هەڵسووڕێنێ. لەم جەنگەدا قەرەیۆسفی تورکمان هەلەکەی بە لەبار زانی و لێی‌ڕاپەڕی و لە ناوچەی «سەردەرۆ»ی سەر بە تەورێز بە شەڕهاتن و میرزا کوژرا و قەرەیۆسف دەسەڵاتی بە سەر ئازەربایجان‌دا شکایەوە.

## ساڵی ٨١١ / ١٤٠٨ ـ ٩

لەم ساڵەدا میرزا شاروخ لەسەر پێوشوێنی ڕێبازی - پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی کە میرزا بایسونقور و میرزا محەممەد جووکی کە ڕووپەڕی شادمانی و ڕوخساری کامەرانی و گەوهەری کانگای بەختیاری بوون، خەتەنە بکرێن و داب و نەریتی باو دانەکووژێ.

---

[1] - « سنشد عضدك بأخيك ونجعل لكما سلطنا»، قورئانی پیرۆز، سووڕەی قەسەس، ئایەی ٣٥، ل ٣٨٩، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار... .

## ساڵی ٨١٢ / ١٤٠٩ ـ ١٠

میرزا شاروخ فەرمانی چاککردنەوە و کەڵتەی مەروی دا کە لە شارە بەناوبانگەکانی خوراسان و پایتەختی میرانی پایەبەرز بوو. ئەم باژێرە کە بە تێپەڕینی کاروانی ڕۆژان و شەوان و ڕووداوەکانی ڕۆژگار ببوو بە کاولاش و هەرەسی بە سەریەکدا ڕووخاو، کەوتە بەر بووژانەوە. لە ساڵی ٦٢٠ڕا کە تووڵیخانی کوڕی چەنگیزخان فەرمانی خاپوورکردنی دابوو، هەتا ئەمڕۆ کە دەستیان دایە ساز کردنەوەی، ١٩٠ ساڵ بوو کە ئەو خاکە لانی کەروێشک و کونی ڕێوی بوو. بەکورتی لە ماوەکی کەمدا ئەو نیشتمانەی خۆش و ئاوەدان کردەوە.

## ساڵی ٨١٣ / ١٤١٠ ـ ١١

میر سولەیمان لەم ساڵەدا بە مەبەستی تێکەڵچوون لەگەڵ برای لەشکری بەرەو بوورسا گاڵ دا. لە گەرمەی شەڕا هێزەکانی هەرێمی ڕۆم پشتیان کردە میر سولەیمان و چوونە پاڵ مووسا چەلەبی برای(؟) میر سولەیمان هەڵات و دوای ڕۆژێک بە مردوویی لە گوندێک دۆزییانەوە. مووسا چەلەبی لەسەر تەختی حکوومەتی ڕۆم بە سەربەستی پاڵی داوە و لەمپەر و بەرگری لەسەر ڕێگای نەما. میر سولەیمان حەوت ساڵ و حەوت مانگی حوکمڕانی کرد.

## ساڵی ٨١٤ / ١٤١١ ـ ١٢

سەرەتای ئەم ساڵە مووسا چەلەبی قەڵای مەترنی و پەروادی گرت. میرزا خەلیلی کوڕی میرزا میرانشا کە لە کاتی هێرش بۆ سەر وڵاتی «خەتا» لە خزمەت ڕکێفی هەمیشە سەرکەوتەی باپیری پایەبەرزیدا بوو. پاش نەمانی باوەگەورەی هرووژمی بردە سەر سەمەرقەند و تەواوی خەزێنەکانی سەر ڕووی زەوی کە میر تەیموور کۆی کردبوونەوە، دەستی بە سەر داگرتن. ئاخرییەکەی سەری وەبەر میرزا شاروخی مەزنەمیری مامی هێنا و ئەویش ناردی بۆ عێراق و لە «شاریار»ی سەر بە ناوچەی ڕەی مرد.

## ساڵی ٨١٥ / ١٤١٢ ـ ١٣

میر قەرەیۆسفی تورکمان لە تەورێزەوە بە تەقڵەکوت و سەرڕەو چووە قەرەباغی ئەرران و پیاوی ناردە لای شێخ برایمی حوکمڕانی شیروان و بۆ پێکهاتن و ئاشتی لێی ڕاسپارد. سەید ئەحمەدی حاکمی شەککی و «کۆستەندیل»ی گورجی حوکمداری «زەکەم»، لەگەڵ شێخ برایم قسەیان کردە یەک و پێملی نەبوون و سەریان بۆ دانەخست.

قەرەیۆسف لە چۆمی ئاراس (ئاران) پەڕییەوە و باڵەکان زۆر توند و تیژ تێکهەڵچوون. شێخ برایم و شێخ باڵوولی برای و «کۆستەندیل»ی گورجی لەو گەردەلوولەدا کەوتنە داوی کەمەندی بەڵاوە. قەرەیۆسف، کۆستەندیل و براکەی لەگەڵ سێسەد کەس شەڕکەری گورجی بەرەو جەحەندەم ڕایدان و ناوچەی شەمماخی تاڵان کرد و گەڕایەوە تەورێز. شێخ برایم و شێخ باڵوول و مەولانا زەهیرەددین قازی بە چۆلەپێچکراوی بردە ئازەربایجان. لەگەڵ شێخ برایم وای قەرار کرد کە هەرچی کەلوپەل و هەوڕ و هاڵی زێڕ و زێوی لە شیروان هەیەتی بیهێنێتە تەورێز و بیداتە خەزێنەی میری. شێخ باڵووڵ دووسەد تمەن و قازی سەدتمەن خوێنبایی بدەن و ڕزگار بن. هەرسێکیان ئەوەی گفتیان لەسەر دابوو جێبەجێیان کرد و بە سلامەتی گەڕانەوە وڵاتی خۆیان.

## ساڵی ٨١٦ / ١٤١٣ ـ ١٤

سەرەتای ئەم ساڵە سوڵتان محەممەدخانی کوڕی سوڵتان ئیلدروم بایەزید تەشریفی لەسەر تەختی دەسەڵات پاڵی داوە. ئەویش نەقڵەکەی ئاوایە کە سوڵتان محەممەدخان دوای نەمانی باوکی و لە سەردەمی هەڵلای براکانیدا جاری وابوو سەری وەبەردێنان. لەو ناوچەیەی کە باوکی باربووی کردبوو دانیشت و چورتەی نەکرد هەتا ڕۆژایەکی کە «کۆر شامەلیک»ی وەزیری مووسا چەلەبی برای لە نانبدەی خۆی هەڵگەڕایەوە و پەنای بردە بەر تەکووری ئیستانبووڵ. وێڕای ئۆرنووسبەگ پیاویان ناردە لای سوڵتان محەممەدخان لە

ئاماسییە و دنەیان دا بۆ فەرمانڕەوایەتی. لەبەر پاڕانەوەی ئەوان سوڵتان محەممەدخان چووە بوورسا و بە هاوکاری تەکووری ئیستانبووڵ لە کەلیبوولیڕا چووە هەرێمی ڕۆم. تەواوی ئەو میرانەی کە لە پشتی بوون هەتا ئەدرنە بە پێشوازییەوە چوون.

وەختایەک مووسا چەلەبی بەم باسوخواسەی زانی ڕایکرد و سوڵتان محەممەدخان کەوتە شوێنی. پیاوان و غولامانی سوڵتان لە سماقلوو گرتیان و بەپێی فەرمانی میر کوشتیان. پاشان سوڵتان تەواو بە سەربەستی لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت.

لە بنەبانی ئەم ساڵەدا کوڕی قەرامان بە سەر بوورسای دادا و ئەو مەڵبەندەی داڕووتاند و کردی بە سمکوتی ڕەوەی یەکسمانی و گەڕایەوە. سوڵتان محەممەدخان هەتا قوونییە کەوتە پەیکەردەی و شەڕێکی قورسیان لە نێوانیدا قەوما. محەممەدبەگی کوڕی قەرامان لەگەڵ مستەفای کوڕی گیرا. سوڵتان محەممەدخان تاوانی باوک و کوڕی بەخشین و بەشێک لە ناوچەکانی قەرامانی دانەوە دەستی.

## ساڵی ٨١٧ / ١٤١٤ ـ ١٥

سوڵتان محەممەد دەروازەی قەڵاکانی سامسۆن، ئێسکلیب، سووریحەسار، قیرشار، نیکدە، ئاقشار، یەکیشار، سەیدغازی، ئارغادی و سەعیدئیلی خستنە سەر گازەرای پشت و پێیتێنان و هەموویان کەوتنە ژێر چنگی بەگلەرانی حکوومەتی زاڵ و باڵادەست.

هەر لەم ساڵەدا میرزا شاروخ بە مەبەستی سەرکوتی میرزا بایقورای برازای کە ئاڵای سەربزێوی هەڵدابوو، سپای بەرەو هەرێمی فارس ئاژاوت و کاتێک کەژاوەی پیرۆزی میری گەیشتە شیراز، میرزا بایقورا داما و تاسا و شانی داتەپی. میرزا بایسونقوری کوڕی ڕێزداری ئەو پایەبەرزەی کردە تکاکار و

شمشێر و کفنی بە ئەستۆیەوە هەڵاوەسی و چووە لاشیپانەڕامووسانی مامی مەزنی و بە سۆزی میرانە لاوێندرایەوە و تاوانەکانی خرانە پشت گوێ.

## ساڵی ٨١٨ / ١٤١٥ ـ ١٦

سەرەتای ئەم ساڵە قەڵای سۆران کەوتە چنگ بەگلەرانی سوڵتان محەممەدخان کە سەرکەوتن جڵەوی دەکێشان. میرزا شاروخ وەرگرتن و کۆکردنەوەی باج و پیتاکی هەرێمی بەدەخشانی باربووی میرزا «سیورغتەمێش»ی کوڕی کرد.

## ساڵی ٨١٩ / ١٤١٦ ـ ١٧

سوڵتان محەممەد توانی قەڵاکانی کانقوری، چەقا، تووسیا و باقر کورەسی بگرێ.

شەوی پێنجشەممۆی سەرەتای مانگی جیمادی یەکەم، خودای مەزن لە «باغی سپی» شانشینی هیرات، کوڕێکی دا بە میرزا بایسونقوری کوڕی میرزا شاروخ کە ناویان نا میرزا عەلائوددەولە.

## ساڵی ٨٢٠ / ١٤١٧ ـ ١٨

سوڵتان محەممەد فەرمانی دابەستنەوەی قەڵای ئیساقچی دەرکرد. لە نێرینەی ئەم ساڵەدا میرزا شاروخ بە مەبەستی زیارەتی مەشەدی نوورانی و مەرقەدی بۆنخۆشی عەلی کوڕی مووسا ڕەزا لە هیراتەوە بارگە و بنەی سەفەری پێچاوە و ڕۆیی و ڕۆژی پازدەی مانگی شابان گەیشتێ. پاش زیارەت و نزا و پاڕانەوە، فەرمووی چلوورەیەکی زێڕی سێهەزار مسقاڵی کە لە ڕووی خۆشەویستی و هەستی دەروونەوە بۆی ساز کردبوو، لەسەر گلکۆی پاکی هەڵاوەسن. پاشان دەستووری دا چوارباغ و سەرایەک لە باڵی ڕۆژهەڵاتی نێژگەی ئەو پایەبەرزە هەڵبخرێن و گەڕایەوە هیرات.

## ساڵی ٨٢١ / ١٤١٨ ـ ١٩

لەم ساڵەدا یوورکلیجە مستەفای خەلیفەی کوڕی سەماونەی لە دینوەرگەڕاو کە داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد لە هەرێمی ڕۆم کوژرا. یوورکلیجە لە مەڵبەندی ئادین خەڵکی بانگدەهێشت کە بکەونە پێوشوێنی کوڕی سەماونە و بڕوای پێبێنن.

## ساڵی ٨٢٢ / ١٤١٩ ـ ٢٠

لەم ساڵەدا شاروخمیرزا نەوەزایەکی پادشای مەغوولستانی بە ناوی «مێهرنیگارئاغا»ی کچی محەممەدخانی(؟) بۆ جووکیمیرزای کوڕی خواست.

## ساڵی ٨٢٣ / ١٤٢٠ ـ ٢١

کوڕی سەماونە وەختایەک بیستی یوورکلیجە مستەفای خەلیفەی کوژراوە، لە قەڵەمڕەوی سوڵتان محەممەدخان وەدەرکەوت و بەرەو سامسۆن بزووت. لەوێوە بە سواری لۆتکە ڕووی کردە ئەفلاق و پاشان هەتا سولسدەرە ڕانەوەستا. لەوێ کۆمەڵێکی بەرچاو تێیهاڵان و باوەڕیان پێهێنا و بوونە مریدی و ئەویش داوای پادشایەتی کرد. سوڵتان محەممەدخان بەم هەرایەی زانی و پیاوی ناردە سەری و لە زەغرە گرتی و هێنایە دەرگانەی میری و لە سیرووز چوارمێخەیان کێشا.

هەر لەم ساڵەدا میرزا شاروخ بە ئامانجی تێکهەڵچوون لەگەڵ قەرەیۆسف لە خوراسانەوە بە قۆشەنی زۆر و زەوەندەوە ڕووی کردە ئازەربایجان. کاتێک ئاڵا سێبەرپیرۆزەکانی شاروخی لەسەر ناوچە و مەڵبەندەکانی عێراق لەنگەریان گرت، قاسیدێک لە تەورێزەوە هات و هەواڵی هێنا کە قەرەیۆسف لە ناوچەی ئۆجان ڕووحی داوەتەوە دەست پەروەرێنی جیهان. تورکمان وەکوو ژیوە هارووژاون و حەجمینیان لێهەڵگیراوە و قەڵای سوڵتانییەیان چۆڵ کردووە و بێروبەوێدا پەرمەپەرم بوون.

میرزا شاروخ بەپرتاو بەرەو سوڵتانییە ئەسپی تاو دا و میرزا بایسونقوری بەغار نارد بۆ تەورێز. لە نێوەڕاستەکانی مانگی نێوجێژنان‌دا سوڵتانییەی کردە خێوەتگای خۆی و لەو زستانەدا خێڵ‌بەزی بردە قەرەباغ.

## ساڵی ۸۲٤ / ۱٤۲۱

میرزا ئەسکەندەری کوڕی قەرەیۆسف لە دەوروبەری ئەلەشکورد سێ شەو و ڕۆژ بەرەوڕووی میرزا شاروخ چەقی و بەرەنگاری بۆوە و سەرەنجام ڕایکرد. دوای گەڕانەوەی شاروخ‌میرزا چووە تەورێز و لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی پاڵی داوە.

## ساڵی ۸۲٥ / ۱٤۲۱ ـ ۲۲

سوڵتان محەممەدخانی حوکمڕانی ڕۆم لەم ساڵەدا(؟) بە نەخۆشی زگچوون لەم دنیا بێ‌سەرەنجامەوە ڕووی کردە ماڵ و مزڵی هەمیشەیی. چل و هەشت ساڵ ژیا و نۆ ساڵی فەرمانڕەوایەتی کرد. پێنج کوڕی هەبوو: سوڵتان مراد، سوڵتان مەحموود، سوڵتان یۆسف، مستەفا چەلەبی و کووچک سوڵتان ئەحمەد. سوڵتان مەحموود و سوڵتان یۆسف کوێرکران و ئاخری بە نەخۆشی چاوقوڵکە مردن. مستەفا چەلەبی و کووچک سوڵتان ئەحمەد(؟) بە دەستی برای خۆیان کوژران و سوڵتان مرادخان لە جێی باوکی دانیشتە سەر تەختی دەسەڵات.

ڕۆژی حەوتی مانگی ڕەجەب پەروەردگاری گەورە کوڕێکی دا بە میرزا بایسونقور کە بە میرزا ئەبولقاسم بابور ناودێر کرا.

سوڵتان محەممەد شوێنەواری خێر و چاکەی زۆری لە پاش بەجێماون و بریتین لە: ۱- مزگەوتی گەورە و خانەقا و گومبەز و مەزارگەی سوڵتانییە. ۲-خوێندنگایەکی گرینگ لە بوورسا. ۳- دوو مزگەوت و دوو حەمام لە شارۆکەی مەرزیفوون. ٤- مزگەوت و خانەقایەک لە قونش لەسەر گۆڕی محەممەدبەگی مەنەت ئۆغلی کە یەکێک بوو لە غەزاکەرانی خودایی ٥- وقف‌کردنی ملک‌وماشێکی زۆر بۆ مەکە و مەدینەی پیرۆز کە خودا لە شان و شەوکەتیان زیاد کا.

زانایان و شێخان و مامۆستایانی هاوچەرخی سوڵتان محەممەد ئاوایان ناو هاتووە: ١- مەولانا حەیدەری هێرەوی کە یەکێک بووە لە قوتابیانی شاباڵی بەختی دین و شەریعەت مەسعوودی تەفتازانی. لەسەر «شەرحە کەششاف» کۆبە و پەراوێزی نووسیوە و «ئیساغووجی»شی شیکردۆتەوە. ٢- مەولانا فەخرەددینی عەجەمی کە لای میر سەید شەریفی جورجانی فەقێ بووە و لە چاخی خۆی‌دا کەس تای نەکردووە. ٣- مەولانا قەرەیاقووبی نیکدی کە زۆر لێزان و وریا بووە. ٤- مەولانا بایەزیدی مەنشوور بە سۆفی کە بۆتە مامۆستای سوڵتان محەممەدخان. ٥- مەولانا محەممەدی کافیەچی کە لە زمان و ئەدەبی عەرەبی‌دا کەس شانی لە شانی نەداوە. ٦- پیرئەلیاسی ئاماسی کە خاوەنی کەشف و کەرامات بووە و خەڵکی بژاردە و ڕەمەکی دەستەوداوێنی بوون. ٧- شێخ عەبدوللەتیفی مەرزیفوونی(؟) کە پێشەوای زەمانی خۆی بووە و لە بوورسا نێژراوە و خانەقا و بارگای لەسەر گۆڕی سازکراوە و ڕێبواران و هاتوچۆکەران لەوێ نان و پێخۆریان دراوەتێ. ٨- شێخ ئاوڕەحمانی مەرزیفوونی(؟) کە یەکێک بووە لە گەورە خەلیفەکانی شێخ زەینەددینی خەوافی و نێژگەی پیرۆزی لە مەرزیفوونە. ٩- شێخ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حیسامەددینی کومێشی و هەر لەم شارۆکەیە گەشەی کردووە و بە یاهوویاهووی ئەوینی یەزدانی و جەزم بوونەوە کەوتۆتە سەما و پێیەوە ناسراوە و لە ئاماسییە نێژراوە. ١٠- شێخ زەکەریای خەڵوەتی کە گەیوەتە پلەی بەرزی خوداناسی و پێیەوە سووتاوە و ئەویش هەر لە ئاماسییە تەسلیم بە خاک کراوە. ١١- شێخ لوتفوڵڵای کوڕی ئەسفەندیار کە لە خزمەت شێخ حاجی‌دا بووە و بەرز تێهەڵچووە و لە بالی کەسرا نێژراوە. ١٢- شێخ شوجاعەددینی قەرامانی ١٣- شێخ موزەففەرەددینی لارندەوی ١٤- شێخ بەدرەددینی دەقیقی ١٥- شێخ سەلاحەددین بوولەوی ١٦- شێخ موسلیحەددین خەلیفە ١٧- عومەر دەدە بوورساوی. ئەم شەش کەسەی دوایی هەموویان

خەليفەی شێخ حاجی بوون و گەیشتوونە پایەی بڵیند و خەڵکی ئەو وڵاتە سەروبەر بڕوایان پێیان بووە.

## ساڵی ٨٢٦ / ١٤٢٢ ـ ٢٣

لەم ساڵەدا سەرهەڵدان و ڕاپەڕینی سوڵتان مستەفا دۆزمجە لە هەرێمی ڕۆم خۆی نواند. وەک پێشتر باسی کراوە، لە شەڕی میر تەیموور و ئیلدروم بایەزیدا، سوڵتان مستەفای کوڕی سوڵتان بایەزید سوڕی ون بووە. بەڵام لەم جەنگەدا کەسێک لە سەلانیک پەیدا بوو و گوتی من مستەفا چەلەبی کوڕی سوڵتان بایەزیدم کە لە هەراکەی میر تەیمووردا بزر ببووم. حەشامەتێکی زۆر بڕوایان پێکرد و لە دەوری بەیداخی کۆبوونەوە. تەنانەت کوڕانی «ئۆرنووسبەگ»یش سەریان وەبەرهێنا و قەڵای «سیرووز»یان دایە دەستی. پاشان ڕووی کردە ڕۆملی و هەرچی چەکدارە لەوێ دەغالەتیان پێکرد. بایزپاشای میری‌میرانی ڕۆملی کوشت و بەرەو ئاناتۆلی ڕۆیی. سوڵتان مرادخانیش هەتا ئەلووباد لەگەڵی هات و پردەکەی هەڵبڕی و لە کەنار ئاوێ بنەی خست. شەو پەلاماریان بۆ برد و دۆزمجە مستەفا خۆی ڕانەگرت و ڕایکردە کەلیبوولی و کەشتی و لۆتکەی خەڵکی کێشایە لێواری ڕووبار. سوڵتان مرادخان چووە لابسکە و چەند لۆتکەیەکی جێبەجێ کرد و ئاژاوتی. دۆزمجە مستەفا پێی-زانی و بەرەو قزڵئاغاج یەکیجەسی فڕی. دەستەیەک لە هێزەکانی میری کەوتنە پەیکەردەی و گرتیان و بردیانە خزمەت سوڵتان و ئەویش فەرمانی دا بە کوژرانی.

## ساڵی ٨٢٧ / ١٤٢٣ ـ ٢٤

سوڵتان مرادخان چووە شەڕی ئەسفەندیاربەگ و دەروەستی نەهات و شکا. هەر لەم ساڵەدا سوڵتان مرادخان کیژی حوکمڕانی لازی مارە کرد.

## سالی ٨٢٨ / ١٤٢٤ ـ ٢٥

ئەسفەندیاربەگ بە مەبەستی گرتنی تۆراقلوو هێزی دەنگ دا. سولتان مرادخان پێیزانی و لێی وەخۆ کەوت و هەسی داوە و بەرەو بوولی پاشەکشەی پێکرد. چونکە قاسمبەگی کوڕی لە ڕکێفی سولتاندا بوو، تێکڕای میران و بەگلەران ڕوویان لێوەرگێڕا و چوونە خزمەت قاسمبەگ. ئەسفەندیاربەگ ڕایکردە قەڵای بوولی و مرادبەگی کوڕە چکۆلەی خۆی ناردە لای سولتان و داوای لێبووردنی کرد. پادشای بەدڵ و دەستی سینگ فرەوان، چاوی لە تاوانەکانی پۆشی و بە سۆزی میرانە قەڵەمی بە سەردا کێشان و گەڕایەوە بوورسا.

یەکێک لە ڕووداوە تازە و بەرچاوەکانی ئەم ساڵە نووسرانی کتێبی مێژووی «زەفەرنامە»یە کە بە پێنووسی پاراوی بلیمەتی دەوران مەولانا شەرەفەددین عەلی یەزدی نووسراوە و لەسەر ناوی میرزا شاروخ تۆمار کراوە. ئەم شوێنەوارە دەگەڕێتەوە سەر هەوڵ و هانی میرزا سولتان برایمی کوڕی میرزا شاروخ کە حوکمڕانی فارس بووە و ڕێگەی بۆ مەولانا خۆش کردووە هەتا قەڵەمی ڕەنگینی چۆن چاکە ئاوای بگێڕێ و بۆن و بەرامەی هەموو وڵاتی پێبتەنێتەوە و ئاوێتەی دەروونی سەروخواری کۆمەڵ بێ. زمانی گەوهەرباری مەولانا شەرەفەددین عەلی چەشنی خۆرەتاو، تیشکە و ترووسکەی هەموو لایەکی گرتۆتەوە و گەورە و گچکەی دنیای وە پاش نەداوە. یاڕەببی خودای مەزن خێری بنووسێ.

## سالی ٨٢٩ / ١٤٢٥ ـ ٢٦

حاکمی ئەفلاق کە بە دەیرولغەوا ویوودە ناسرابوو، ئەو دەمەی سولتان مرادخان لە ئاناتۆلی بوو... هەڵیکردە سەر هەرێمی ڕۆملی و چەند ناوچەیەکی داڕووتاند و کردی بە مەیدانی تراتێن و ڕمبازێنی. وەختایەک ئەم هەواڵە بە گوێی فەرمانڕەوا ئاشنا کرا، دەوری سێهەزار پیاوێکی دڕی شەڕانی بە سەرۆکایەتی فیرووزبەگ ناردنە سەر مەڵبەندی ئەفلاق. ویوودە پێیزانی و لە

ترسان باج و خەراجی دیاریکراوی بار کرد و وێڕای دوو کوڕی ڕووی نایە دەرگای میری و بەڵێنی دا و گوتی شەرت و مەرج بێ تازە ساڵمەخەتەی ناکەم و سنووری قەڵەمڕەوی میری نابەزێنم و کەتن و ئاژاوە نانێمەوە.

هەر لەم ساڵەدا میران و بەگلەرانی هەرێمی ئایدینئیلی، ساڕووخان، حەمیدئیلی و مەنتەشا کە پێشتر سەریان وەبەر نیری دەسەڵاتی خانەدانی عوسمان هێنابوو و کەوتبوونە لیزگەی سەردارانی گەورەوە، لە جەنگەی هەرا و هەڵلای میر تەیمووردا تێهەڵچووبوونەوە. بۆیە پەلاماردران و سەرلەنوێ ناوچە و مەڵبەندەکانیان کەوتەوە نێو جەغزی قەڵەمڕەوی میری. سەرۆک و گەورە و مەزنەکانی ئەو ناوچانە ڕەوین و چوونە لای محەممەدبەگی قەرامان ئۆغلی.

لە لایەکی دیکەوە شاروخمیرزا گومبەزێکی هەرەباشی لەسەر مەرقەدی پیری هیرات واتە خواجە عەبدوڵلا ئەنساری ساز کرد و لێیبۆوە.

## ساڵی ٨٣٠ / ١٤٢٦ ـ ٢٧

محەممەدبەگی کوڕی قەرامان لە سوڵتان مرادخان ڕاپەڕی و هێرشی بردە سەر قەڵای ئەنتالییە و گەمارۆی دا. بەڵام لەناکاو لە نێوخۆی قەڵاوە تۆپێکی تێهەڵکرا و ئەنگێورا و لەتوپەت بوو. ئەوێ دەمێ سوڵتان محەممەدخان چووبووە شەڕی کافران. دوای ئەم ڕووداوە میر برایم و عیسا و عەلائەددین کە هەرسێک کوڕی محەممەدبەگ بوون، وێکڕا چوونە نێودەرانەی سوڵتان مرادخان. هەرێمی قەرامان باربووی برایمبەگی کوڕە گەورەی کرا و میر دەستی بە سەریدا هێنان و دڵیدانەوە و دوو براکەی تریش مانگانە و دابینکرانی خەرجوبەرجیان بۆ دیاری کرا کە لە خزمەت ڕکێفی پادشادا بن.

یەکێک لە ڕووداوە گرینگ و بەرچاوەکانی ئەم ساڵە وەبەر خەنجەردرانی میرزا شاروخە. میر عادەتی وابوو کە هەموو ڕۆژانی جومعە تەشریفی دەبردە مزگەوتی گەورەی شاری هیرات و دەکەوتە پێوشوێنی [ئەم فەرمانەی هاوار

دەکا]: «ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، هەر وەختێ لە ڕۆژی هەینی بۆ نوێژی هەینی بانگ ئەدرێ، ئێوە بەلەز بەرەو یادی خودا بچن.»[1]

ڕۆژی ٢٣ی مانگی ڕەبیعی دووەم دوای نوێژ بەتاڵ بوون کاتێک ویستی لە مزگەوتەوە بەرەو ماڵ بێتەوە، کابرایەکی شڕۆڵەی پەستەک بە شان بە ناوی ئەحمەدی لوڕ کە یەکێک بووە لە مریدانی مەولانا فەزلوڵلای ئەستەرابادی بە بیانووی سکاڵا کردن کوتەکاغەزێکی بە دەستەوە گرتووە و لێی چۆتە پێش. میرزا شاروخ ئاماژەی بە شازادەیەکی خزمەتی کردووە بزانێ دەڵێ چی. بەڵام ئەحمەدە لوڕە مەودای نەداوە و بێ ترس گوڕمی بەستۆتێ و وەک مستێ لە چاو دەی خەنجەرێکی لە زگی ئەم پایەبەرزە داوە، بەڵام برینەکە زۆر قووڵ نەبووە. هەر لەڕێوە سەرۆکان و سەرداران لوڕە نەفامیان شڕودڕ کردووە.

پاشان میرزا بایسونقور و میران کەوتوونە بە دواداچوون و لێکۆڵینەوە. ئەگەر سەر و کلاویان پشکنیوە کلیلێکیان دۆزیوەتەوە کە لە بازاڕچەی کووتاڵفرۆشان دەرگای ماڵێکی پێکراوەتەوە. زۆر کەس بەم ئاورەوە سووتاون و ماڵوێران بوون. سەرتۆپی پیاوچاکان میر قاسمی ئەنوار تۆمەتی ئەم کەتنەی پێوەبەستراوە. فەرمانی پادشایەتی بۆ دەرکران و دوورخرانەوەی دەرچووە. لەبەر دۆستایەتی و یەکێتی لەگەڵ میرزا بایسونقور، سەید زیانی پێنەگەیوە. بۆخۆی چۆتە خزمەت میر قاسم و لە گەرمەی قسانددا پێیگوتووە جا بۆچی ناکەویە پێوشوێنی گوتەی خۆت.

قاسم کورتی ببڕەوە و هەستە بڕۆ بە ڕێدا

تووتی شەکروەشان کە و کەلاک بدە بە دالاش

---

١- « يا ايهاالذين امنو اذا نودى للصلوة من يوم الجمعة فاسعوا الى ذكر الله» ، قورئانی پیرۆز، سوورەی جومعە، ئایەی ٩، ل ٥٥٤، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار...

جەنابی میر لە ئاخری ئەو ڕۆژەدا شاری هیراتی بەجێهێشتووە. یەکێک لە زانایانی زەمان سەبارەت بەم ڕووداوە گوتوویەتی:

ڕێکەوتی ساڵــی هەشسەد و سی بوو
خەنیم بە جومعــە نــەگەییە ئاوات
ڕووداوێ سەیــر قــەومــا ئــەو ڕۆژە
لە خوراسان و لــە شــاری هیــرات
یەکێکی لاڕێ بــە چــەشنــی وەزیــر
ویستی شاروخی بخا، بوو بە مات

هەر لەم ساڵەدا میرزا سیورغتەمێشی کوڕی میرزا شاروخ کــە حوکمــڕانی بەدەخشان و غەزنەین و کابول بوو، بە مەرگی دیاریکراو بــەرەو سەرســەرای هەرمان باڵی گرت.

## ساڵی ٨٣١ / ١٤٢٧ ـ ٢٨

قزڵقۆجەی تورکمانی دانیشتووی چــوروم کــە هــەموو ساڵــێک بــە ســەر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی سوڵتان مرادخانیدا دەدا، سوڵتان دەستی لێنەپاراست و بە توخم و تایەفەوە تۆوبڕی کــرد. قــەڵاکــانـــی قۆجەقەیاسی، جانێــک و «سەلانیک»یش هەر لەم ساڵەدا گیران.

## ساڵێ ٨٣٢ / ١٤٢٨ ـ ٢٩

سوڵتان مرادخان کچی ئەسفەندیاربەگی بــۆخــۆی خــواست و داوەت و گۆوەندێکی گەورەی ساز کرد.

هەر لە سەرەتای ئەم ساڵەدا میرزا شاروخ بــە مــەبــەستــی چــوونە شەڕی ئەسکەندەرمیرزای کوڕی قەرەیۆسفی تورکمــان لــە خــوراســانــەوە بـــەرەو ئازەربایجان بزووت. لە ناوچەی سەڵماس هێزەکانیان لووتوبزووت تووشــی

یەکتر هاتن و دوو شەو و ڕۆژ کوشت و کوشتار ئاشی گێڕا. سەرەنجام میرزا ئەسکەندەر شکا و هەڵات. میرزا شاروخ، جووکیمیرزای کوڕی لەگەڵ بەگلەران خستە دووی. ئەمانە هەتا ئەرزەڕۆم کەوتنە پەیکەردەی نەیاران بەڵام شوێنیان ون کردن و نەیاندیتنەوە. میرزا شاروخ لە سەڵماسەوە گەڕایەوە و زستانەهەواری بردە قەرەباغی ئەرران.

## سالی ٨٣٣ / ١٤٢٩ ـ ٣٠

میرزا شاروخ حکوومەتی وڵاتی ئازەربایجان و تەواوی ناوچە و مەڵبەندەکانی بەخشی بە میرزا ئەبووسەعیدی کوڕی قەرەیۆسفی تورکمان کە بارەگای میری کردبوو بە خانەی هومێدی خۆی. پاشان لە خێڵبەزی قەرەباغی ئەررانەوە بەرەو خوراسان بزووت.

## سالی ٨٣٤ / ١٤٣٠ ـ ٣١

وەختایەک شاروخمیرزا لە سەفەری دووەمی ئازەربایجان گەڕاوە و گەیشتە هیرات، بە خزمەتیان ڕاگەیاند کە لە لای خارەزمەوە تەتەرێک هاتووە و دەڵێ لەشکری ئۆزبەک داوەریوە و گەرد و تۆزی ئاژاوەی وە حەوا خستووە و گەڕی ناوەتەوە و هێزێکی زۆری لە کەنار ڕووباری ئاموویە مۆڵ داوە و هێرشیان کردۆتە سەر خارەزم. میر برایمی کوڕی میر شامەلیک کە حوکمڕانی ئەوێیە، تابشتی نەهێناوە و کشاوەتەوە بۆ «کات» و «خیووق». قۆشەنی ئۆزبەک خارەزمیان گرتووە و دەستیان لە تالانوبڕۆ و خاپوور کردنی وڵات نەپاراستووە و زۆریان شوو لێهەلکێشاوە.

میر بە بیستنی ئەم باسوخواسە دەستەیەک لە بەگلەران و مەزنەمیرانی ڕاسپارد کە بەرەو خارەزم ببزوون. هەر ئەوەندەی گەیشتنێ، سپای ئۆزبەک خۆی بۆ ڕانەگیرا و تێما و دەستی لێکبەردا و پرشوبلاو کەوتەوە. سەرداران بە سەرکەوتوویی گەڕانەوە خاکی خوراسان.

## ساڵی ٨٣٥ / ١٤٣١ ـ ٣٢

ئەم ساڵ سوڵتان محەممەدی کوڕی سوڵتان مرادخان لە هەرێمی ڕۆم پێوقەدەمی بەخێر و بەختیارانەی نایە نێو جەغزی ژیان.

هەر لەم ساڵەدا قاسیدێک لە لای ئازەربایجانەوە هات و بە خزمەت میرزا شاروخی ڕاگەیاند کە ئەسکەندەرمیرزای کوڕی قەرەیۆسف، ئەبووسەعیدی برای کە بەرلەوی بە فەرمانڕەوای ئەو نێوەنێوە داندرابوو، پەلاماری داوە و کوشتوویەتی و جێی گرتۆتەوە.

## ساڵی ٨٣٦ / ١٤٣٢ ـ ٣٣

لەم ساڵەدا میر خەلیلوڵڵای حاکمی شیروان کە پێشینە و مێژینەی خانەدانی مەزنی ئەوەندە ڕوونە پێویست بە لێدوان ناکا و زۆرجاران باسی کراوە؛ میرزادە یارعەلی کوڕی میرزا ئەسکەندەری کوڕی قەرەیۆسف کە لەبەر هەڵسوکەوتی توند و تیژی باوکی، بە دڵشکاوی پەنای بۆ بردبوو، بە سواری لۆتکە ناردی بۆ لای میرزا شاروخ لە هیرات. میرزاش زۆر بەگەرمی وەریگرت و دەستی ڕێزی لێنا و خستییە نێو لیزگەی شازادان؛ بەڵام ئەو بوو بە دەستەبرای لاتەوپاتە و قەلەوقوتە و تاوانباران و چەپەڵکارانی تورک و تاجیک. میرزا شاروخ دەهەزار ماڵێکی تورکمانی ئازەربایجانی ڕاگواستبوون بۆ شاری هیرات. لەم دەور و زەمانەدا وەستا فەرروخی ئاسنگەر کەوانی هەورەبرووسکەی داڕشتبوو و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە چوارسەد مەنی بەرد پێداوێم. میرزا شاروخ بۆ دیتنی ئەو کەوانە بەرداوێژە چووبووە سەر کێوی باوەلیگا و لێیدەڕوانی. لەم جەنگەیەدا میرزادە یارعەلی شەنگەلاو دەرکەوت کە بە نیگایەک تیری هاویشتە ڕیزی ئەویندارانی ڕۆژی ڕابوونەوە و بە پەیکانی ڕوانینی دڵی بێدڵانی دایە بەر هرووژمی تانەی. وەختایەک خەڵکی شار چاویان پێیکەوت هەموویان بەجارێک و بێئەوەی هەوساریان بە چنگ خۆیانەوەبێ بەرەو لای داوەرین و بە چەشنێک کەوتنە شوێنی. وای لێهات هیچکەس ئاگای لە کەوانی هەورەبرووسکە

نەما. شاروخ‌میرزا بە دیتنی ئەم دیمەنە پەشۆکا و کاتێک گەڕایەوە شار، لەڕێوە میرزا یارعەلی ناردە سەمەرقەند، لەبەروەی نەکا تورکمانان و حەشامەتی خوراسان و شار لێی‌هاڵێن و ئاژاوە و هەرایەک باڵ بنگێوێ.

## ساڵی ٨٣٧ / ١٤٣٣ ـ ٣٤

سوڵتان مرادخان کچی حاکمی «سەمەندەرە»ی مارە کرد. بەیانی ڕۆژی شەممەی حەوتی جیمادی یەکەم میرزا بایسونقوری کوڕی شاروخ‌میرزا لە باغی سپی شاری هیرات کۆچی‌دوایی کرد و لە ژێر گومبەزی خوێندنگای گەوهەرشاد بەگمی دایکی نێژرا. بایسونقورمیرزا لە تەواوی شازادەکانی تەیمووری پتر چاوی بە سەر زانایان و هونەرمەندانەوە بوو. دەڵێن چل کەس خەتخۆش بێ‌پسانەوە لە کتێبخانەی ئەو مەزنەدا خەریکی نووسینەوە بوون. بلیمەتی بەڕێزی ڕۆژگار مەولانا لوتفوڵلای مەشهوور بە «حافزی ئەبروو» کتێبی «زوبدەتوتتەواریخ»ی لەسەر ناوی ناودێری ئەو نووسیوە کە باسی ڕووداوەکانی جیهان و چۆنیەتی ژیان و بەسەرهاتی چین و توێژەکانی بنیادەمە.

لە ڕۆژی نەمانی ئەو هێژایەدا زانایان و شاعیران گەلێکیان هۆنراوەی چەمەری داناوە، بەڵام ئەمیر شاهی بەم چوارینەیە وەپێش هەمووان کەوتووە:

لە تازیەی تۆدا زەمان زۆر گریا     شلێر داوێنی پڕی هوون کریا
گوڵ یەخەی مۆری یەکسەر دادڕی     قومری هیزاری لە گەردن دریا

## ساڵی ٨٣٨ / ١٤٣٤ ـ ٣٥

لەم ساڵەدا قەڵای ئەنکرووس و گۆکرجێنلیک بە دەس پیاوەکانی سوڵتان مرادخان گیران.

هەر لەم ساڵەدا میرزا شاروخ بە ئامانجی دەمکوتی تۆرەمەی تورکمانان بەرەو ئازەربایجان بزووت. کاتێک سەری جڵەوی بەرەو ڕەی وەرسووڕاند، مانگی بەفرانبار داهات و لەوێ خێڵی خست.

## ساڵی ٨٣٩ / ١٤٣٥ _ ٣٦

سەرەتای مانگی محەررەم میرزا شاروخ لە زستانەهەواری ڕەیەوە ڕووی کردە تەورێز. هەر کە سوڵتانی دارانیشان بزووت، میرزا ئەسکەندەری تورکمان تەورێزی چۆل کرد و ڕەوی. میرزا جیهانشا بەپێچەوانەی برای، چەشنی باڵی بەختی نەمرین چوو بەرەو پیری کەژاوەی میرەوە و بە سۆز و سیلەچاوی فەرمانڕەوایانە لاوێندرایەوە و سەری بەرز کرایەوە.

میرزا شاروخ لە شانشینی تەورێز بە شان و شەوکەتی میرانەوە ڕۆنیشت. ماوەیەک لەو مەڵبەندە مایەوە و کارە گرینگەکانی وڵاتی ئازەربایجانی ڕاپەڕاند و ڕێکوپێکی کردن. ڕۆژی هەشتی ڕەبیعی دووەم بە مەبەستی چوونە زستانەهەوار بەرەو قەرەباغی ئەرران کەوتەڕێ و بنەی لێخست. سەرەتای بەهار ڕووی کردە ئۆجان و لەوێ پلەی حوکمڕانێتی ئازەربایجانی کردە باربووی جیهانشامیرزای کوڕی قەرەیۆسف و حوکمی پیرۆزی بۆ مۆر کرد. هەوساری هەڵسووڕاندن و ڕاپەڕاندنی تەواوی کاروبارەکانی ئەو هەرێمەی دایە دەستی لێوەشاوەی وی. خۆی و تەواوی پیاوەکانی بە پەخششی میرانە لاواندنەوە و جڵەوی گەڕانەوەی بەرەو خوراسان وەرسووڕاند.

هەر لەم ساڵەدا سوڵتان مرادخان بەگلەربەگی ڕۆمئیلی (ڕۆملی) بە مەبەستی دەمکوتی قەراڵی ئەنکرووس گاڵ دا کە پەلاماری قەڵای گۆکرجێنلیکی دابوو. ماوەی چل و پێنج ڕۆژان ئەو هەرێمەیان داڕووتاند و پێخوستیان کرد و دیل و دەسکەوتێکی زۆر کەوتە چنگ غەزاکەران و بە ساخ و سلامەتی و دەستی پڕەوە گەڕانەوە. وەلەق ئۆغلی حاکمی سەمەندەرە کچێک و چوار کوڕی خۆی ناردنە خزمەت سوڵتان مرادخان.

### ساڵی ۸٤۰ / ۱٤۳٦ ـ ۳۷

لەم ساڵەدا لەبنەوەبڕی و غەیانەتی وەلەق ئۆغلی بۆ بیری تروسکەداری سوڵتان مرادخان تەواو ڕوون بۆوە و بە مەبەستی تێکەوەپێچانی لەشکری بەڕێکرد.

هەر لەم ساڵەدا ئەسکەندەرمیرزای کوڕی قەرەیۆسف بە مەبەستی ڕووخاندنی دەسەڵاتی میرزا جیهانشای برای کە میرزا شاروخ کردبوویە حوکمڕانی ئازەربایجان، لە ڕۆمەوە قۆشەنی دەنگ دا. لە «سۆفیان»ی تەورێز هێزەکانیان بەرەوڕووی یەکتر بوونە و تێکهەڵچوون و میرزا ئەسکەندەر بەزی و پەنای بردە بەر قەڵای ئەلەنجەق. شاقوبادی کوڕی کە پەنامەکی کەینەوبەینەی لەگەڵ یەکێک لە نیزیکان و خزمەتکارانی حەرەمی پەیدا کردبوو، باوکی کوشت و مەیتەکەی بردە تەورێز و لە سەرووی قەڵای ئەخیسەعیدەددین لە والیانکێو نێژرا و گومبەزێکی گەورەی بۆ سازکرا.

### ساڵی ۸٤۱ / ۱٤۳۷ ـ ۳۸

وەلەق ئۆغلی ڕایکرد و چووە ناوچەی ئەنکرووس و قەڵاکانی سەمەندەرە، موورە و گەرمەموورە، کەوتنە دەس سەرۆکان و بەرپرسانی حکوومەتی سوڵتان مرادخان.

هەر لەم ساڵەدا سەیفەددینپادشای حوکمداری هۆرمز بە خزمەت میرزا شاروخ گەیشت و بە چاوی پڕ سۆزی میرانە گەشایەوە و بە کامەرانی گەڕایەوە.

### ساڵی ۸٤۲ / ۱٤۳۸ ـ ۳۹

ئەسفەندیار ئۆغلی (؟) سەرلەنوێ پێی لە پەیمان و بەڵێنی خۆی نایەوە و بە ون بوونی سوڵتان مرادخان ناوچەی «بازاڕی» دایە بەر گوڕمی تاڵانوبڕۆی و پێشێلی کرد و زەحمەتی وەبەر خێڵ و بنە و بار و مەڕ و ماڵاتی میری هێنا. سوڵتان لێبڕا هەڵکاتە سەری، بەڵام ئەو دەستی ڕەپێش دا و خێزانی کە خوشکی

سوڵتان بوو لەگەڵ وەزیری خۆی بە مەبەستی داوای لێبووردن ناردی بۆ بارگای میری و بە لوتفی هەراوی بێبەرگێڕەوەی شاهانە تاوانەکانی بەخشران.

هەر لەم ساڵەدا میرزا شاروخ بە ئامانجی زیارەتی مەرقەدی ئیمام ڕەزا -درووود و سەلامی لەسەر بێ- هەنگاوی نا و دوای بەجێهێنانی ڕێورەسمی باو گەڕایەوە هیرات. لەم جەنگەیەدا وەستا قەوامەددینی شیرازی کە لەبەر کەترەخەمی لە کاروباری نژیارڤانیدا بە کەساسی لە قولینچکێک کەوتبۆوە و میر لووتی لێهەڵپێچابوو، ڕۆژەژمێرێکی داهێنابوو کە پێیهاتەوە نێو گەلێ و میرزا شاروخ بە ڕووی گەشەوە دەرگای کۆڕی شاهانەی لێکردەوە و کە لێیوەژوور کەوت میرزا لەڕێوە ئاوای فەرموو:

تۆ کاری زەویت بە ڕێکی دانا    لە ئاسمانیش دەسی خۆت ڕانا

## ساڵی ٨٤٣ / ١٤٣٩ ـ ٤٠

سوڵتان مرادخان لەشکری دانا کە لوور بێتە هەرێمی ئەفلاق و بیچڵپێنێ و گەسکی لێدا. لەبەر بەفر و سەرما و کڕێوەی زستان، زۆرێک لە هێزەکانی ئیسلام کەسیرە بوون و تێداچوون و بە خەسارباری گەڕانەوە.

شەوی سی مانگی شابانی ئەم ساڵە میرزا عەلائەددین کوڕی میرزا بایسونقور خودای گەورە کوڕێکی دایە کە ناوی نرا میرزا برایم.

## ساڵی ٨٤٤ / ١٤٤٠ ـ ٤١

قەڵای قۆهرە کەوتە بەردەست هاوڕکێفانی سوڵتان مرادخان و شەهابەددینپاشا لە نیزیک قەڵای بێلغراد (بێلگراد) سەنگەری داکوتا.

هەر لەم ساڵەدا شاروخمیرزا زۆر توند و پتەو فەرمانی دا بە شازادان کە لەوەی بەو لاوە نابێ مەی بخۆنەوە و تەشریفی موبارەکی پێی نایە ئاوزەنگی و

بە مەیخانانٚدا گەڕا و خاپووری کردن و کەوتـە شـکاندنی کۆپـەی ئـارەق و شەراب و تەپڵ و تووزەلە و هەرچی قەدەغە و قۆرغی لەسەرە.

## ساڵی ٨٤٥ / ١٤٤١ ـ ٤٢

سوڵتان مرادخان لەم ساڵەدا(؟)[1] بە دڵی خۆی دەستی لە فەرمانڕەوایـەتی هەڵگرت و سوڵتان محەممەدخانی بەڕێزی کـوڕی کـردە مـیر و لـە مەغنیـسا (مانیسا) بە خانەنشینی پاڵی دایەوە.

هەر لەم ساڵەدا میرزا شاروخ، سەید شەمسەددین محەممەدی زمزمی کردە کەیخودا و ڕاوێژکاری بالاپۆش پێهەڵکێشانی خانەی خودا کە مەکەی موبارەک بێ و ناردی بۆ لای سوڵتانی میسر و ئەویش لێی قبووڵ کرد و ئیزنی فەرموو کە بڕوا.

## ساڵی ٨٤٦ / ١٤٤٢ ـ ٤٣

سوڵتان مرادخان کچی خۆی کردە دەسگیرانی... بەگی کـوڕی ئەسـفەندیار ئوغلی.

میـرزا شـاروخ مەولانا عەبدوڕڕەزاقی سـەمـەرقـەنـدی کـە مێـژووی «مەتلەعوسسەعدەین»ی نـووسیـوە، وەک باڵوێز نـاردی بـۆ هیندووسـتان. هەروەها چەند ناوچەیەکی عێراقی وەکوو سوڵتانییە، قەزوێن، ڕەی و «قوم»ی باربووی میرزا سوڵتان محەممەدی نەوەی، کوڕی میرزا بایسونقور کرد.

## ساڵی ٨٤٧ / ١٤٤٣ ـ ٤٤

کوڕی قەرامان پیاوی نارد و لە قەراڵی ئەنکرووسی نووسـی کـە سوڵـتان مرادخان لەبەرەوەی نەخۆشی دەورەیـان تـەنیوە و ناتوانـێ لـە جێـی خـۆی بجووڵێتەوە و پێی ناگاتەوە ڕکێفێ و دەستی ناگرێتەوە دەستەجڵەوێ، تەختی

---

1- مێژووی عوسمانی، ب ١، ل ٤٨٥، ساڵی ٨٤٨ی ک/ ١٤٤٤ ی ز بە دروست دەزانـێ و دەڵێ میر لە میخالیچەوە چۆتە بوورسا.

فەرمانڕەوایەتی بەرداوە و کوڕەی مێرمناڵی لە شوێنی خۆی داناوە و کردوویەتە پادشا و کاروباری خانەدانی عوسمان لەوپەڕی کزی و لاوازی دایە. جا بۆیە وا چاکە ئێوە لەولارا و ئێمە لەم لایەوە ببزووین و تێکیانەوەپێچین. قەراڵی چەپەڵکار بۆئەوەی بیری لێبکاتەوە بەم گوتە دەرپەڕی و هاتە سەر سوڵتان محەممەدخان. سوڵتانیش نەترسا و بەرەوپیری بزووت و هێزەکانیان تێکبەربوون و پاش هەوڵ و هەڵسووڕانێکی زۆر، قۆشەنی کافران شکا و بە ڕاکەڕاکە ڕەوی و شیری تیژی غەزاکەرانی بالادەست گەردنی قەراڵ و چەکدارانی گرتەوە.

هەر لەم ساڵەدا میرزا شاروخ زستانەهەواری بردە شانشینی هیرات و کەوتە ڕاپەڕاندنی کاروبار و بەرژەوەندییەکانی دین و نیشتمان.

## ساڵی ٨٤٨ / ١٤٤٤ ـ ٤٥

لەم ساڵەدا هێزی یەکیچەری (یەنیچەری) بەرەورووی سوڵتان محەممەدخان چەقی و هەڵیانکردە سەر وەزیرەکانی کە دووبارە سوڵتان مرادخان لە مەغنیساوە بێننەوە و بیکەنەوە فەرمانڕەوا. وەزیرانیش هەر وایان بە بەرژەوەند زانی و سوڵتان مرادیان هێنایەوە و کردیانەوە حوکمڕان و سوڵتان محەممەدخانیان بەرێکردە مەغنیسا.

هەر لەم ساڵەدا میرزا شاروخ وا نەخۆش کەوت کەس نەیدەگوت دەژی و خەڵکی هیرات بۆ مان و نەمانی دوودڵی بوون. بەڵام دوای چەند ڕۆژان هاتەوە سەرخۆ و چاک بۆوە و ئەو کەسەی خێرەی بۆ دەگرتەوە وای بە باش و پێویست زانی وەک چۆن پارەکە بالاپۆشی ناردووە بۆ خانەی خودا و ئیزنی لە سوڵتان چەقماق وەرگرتووە، ئەم ساڵیش هەر دووپاتی بکاتەوە. ئەویش زۆر شێلگیرانە شێخ نوورەددین محەممەد مورشیدی و مەولانا شەمسەددین محەممەدی ئەبهەری بەو بالاپۆشەوە کە لە یەزد تەنیبوویان، ناردنی بۆ حیجاز و ئەو دوو پیاوە گەورەش زۆر بە چاکی ڕاسپاردەکەیان ڕاپەڕاند و گەڕانەوە.

جووکیمیرزای کوڕەگچکەی میرزا شاروخ چۆوە بەر دلۆڤانی خودێ.

سالّی ۸٤۹ / ۱٤٤٥ ـ ٤٦

سەرەتای ئەم سالە قەلای ئاقچەحەسار و باللووبادەرە کەوتنە ژێر حوکمی ـولتان مرادخان.

هەر لەم سالەدا میرزا حەمەسولتان کوڕی میرزا بایسونقوری حوکمڕانی ێراق و فارس وەختایەک هەوالی نەخۆشیی شاروخمیرزای باپیری بیست، ـالای دژایەتی و سەرهەلدانی هەلدا.

سالّی ۸٥۰ / ۱٤٤٦ ـ ٤٧

لەم سالەدا میرزا شاروخ بۆ گوێبادان و تەمێ کردنی میرزا سولتان حەممەدی نەوەی کە بەیداخی لاساری بەرز کردبۆوە لە خوراسانەوە رووی کردە ـاوەندەی دەسەلاتی عێراق و فارس. کاتێک کەژاوەی شاروخشا گەیشتە ـیسفەهان، میرزا سولتان محەممەد بەرەو لوڕستان ڕەوی. میرزا شاروخ ـاروباری قورس و گرینگی عێراق و فارسی تەکووز کرد و گەڕاوە بۆ لای ڕەی. لە ـەشابوویە ژانی گەدە ئاراوقارای لە میرزا هەلگرت و وای لێپیس کرد، هەر ـەڕێوە دلّی تۆقی و بەرەو دنیای هەرمان بارگە و بنەی پێچایەوە و ڕۆیی. ـەکێک لە بیرمەندان سەبارەت بە مێژووی ژیانی گوتوویەتی:

کەلی دەرکەوتنی نوور، شاروخی شاهی جیهان
حەوسەد و حەفتا و نۆ پێی نایە جەغزی ژیان
سالّی هەشسەد و هەشتێ، گەیشتە تاج و تەختێ
سالّی هەشسەد و پەنجا لە مالّی فیزێ نەمان

شاروخمیرزا پێنج کوڕی زیت و زانا و وریای لە پشتی ڕسکابوون:

- میرزا ئۆلغبەگ کە ماوەی ٤۲ سال لەبری باوکی بە سەر ئەوبەرروبار و

تورکستان ڕادەگەیی و فەرمانڕەوایەتی دەکرد. ٢- میرزا بـرایم کـە حوکمـداری فارس بوو. بە دنە و هەوڵی ئەم شازادە دادەوانە مامۆستا شـەرەفەددین عـەلی یەزدی کتێبی زەفەرنامەی نووسی کە بە بڕوای من لە بواری مێژوودا هەتا ئێستا هیچ زانایەک دەقـی ئـاوای نەنووسـیوە. ٣- مـیرزا سـیورغتەمێش ٤- مـیرزا محەممەد جووکی. بەڵام وەک پێشتر باسی کراوە، چوار کوڕی بێجگە لە مـیرزا ئۆلغبەگ هەموویان لە سەردەمی ژیانی باوکیاندا مردوون.

دوای نەمانی شاروخمیرزا، ئۆلغبەگ لە ماوەڕائونەهر (ئەوبەڕووبار) و تورکستان و میرزا عەلائوددەولەی کوڕی مـیرزا بایـسونقور لـە خوراسـان و سوڵتان محەممەددی برای لە ئێراق و فارس ڕۆنیشتنە سەر تەختی دەسەڵات.

## ساڵی ٨٥١ / ١٤٤٧ ـ ٤٨

لەم ساڵەدا میرزا عەلائوددەولە لەسەر تەختی حوکماتی خوراسان ڕۆنیشت. میرزا عەبدوللەتیفی کوڕی میرزا ئۆلغبەگی لە قەڵای ئیختیارەددیندا زینـدانی کرد و پاش دوو سێ مانگان بەری دا.

هەر لەم ساڵەدا شەڕ و ناکۆکی و دووبەرەکایەتی لە نێوان پاشـەوارەکانی میرزا شاروخدا سەری هەڵدا و حیکایەتێکی دوور و درێژە.

## ساڵی ٨٥٢ / ١٤٤٨ ـ ٤٩

میرزا ئۆلغبەگ بە قۆشەنێکی قورس و گرانەوە لە ئەوبەڕووبارەوە ڕووی کردە خوراسان و لە «تورناب»ی چوار فرسەخی شاری هیرات، ئاگری شەڕێکی بەگەرمەی لەگەڵ میرزا عەلائوددەولەی بـرازای هەڵگیرسـانـد. هێـزەکانی عەلائوددەولە شکستیان هێنا و ئەو بازرە بوو بۆ لای میرزا ئەبولقاسم بابوری برای لە خاکی جورجان و تازە چاوی بە تەختی حوکمات نەکەوتەوە.

میرزا ئۆلغبەگ تەواوی سەرزەوی خوراسانی گرت و گەڕاوە ئەوبەرچـەم. میرزا بابور دوای گەڕانەوەی مامی، هەڕەتی مانگی قوربان لە ئەستەرابادەوە

ڕووی کردە شانشینی هیرات و لەسەر کورسی دەسەڵات پاڵی دایەوە و میرزا عەلائوددەولەی برای گرت.

هەر لەم ساڵەدا قەراڵ «مەنکووس»ی ئەنکرووس و قەراڵی هەرێمی قوسون (قوسوە) یانقوو بانگاوازی ئێلجارپیان دا و لە کەڵەشاخی شەڕیان تووڕاند و بە سپایەکی وەک خیز و خۆڵ پەلاماری بێلغرادیان دا و پاش پێخوستی خاکی مسوڵمانان و تالانوبڕۆ و پێدادان، کاتێک دەیانویست بەرەو قوسون بگەڕێنەوە، سوڵتان محەممەدخان لە مەغنیساوە گەیشتێ. شان بە شانی باوکی هەڵمەتیان بردە سەر کافرانی بەدئاکار و شیریان تێنان و شەڕێکی قورس قەوما. لەم گەرداوەدا چەند «بان لە» و «بان چە» و بانی دیکە کوژران و گیرۆدەی خاکی ڕەش بوونەوە. بان لە زاراوەی لادینانی فەرەنگ یانی وەزیر. غەزاکەرانی مسوڵمان و دلاوەرانی تاقانەپەرست لەو هەڵلایەدا وا بەرەنگاربوونەوە کە شەڕەکەیان بە خەزای گەورە ناودێر کرد.

## ساڵی ٨٥٣ / ١٤٤٩ ـ ٥٠

یانقووی قەراڵ و قەراڵی ئەنکرووس، ویوودەی ئەفلاقیان لەگەڵ خۆیان ڕێکخست و چوونە نیکبوولی. لەشکری سوڵتان مرادخان بە سەر کافرانی دادا و کۆمەڵێکی زۆر لەو خاکەسارانە کوژران. یانقوو هەڵات و لادینان بوونە تۆوی نێو دڕکان.

هەر لەم ساڵەدا میرزا عەبدوللەتیفی کوڕی ئۆلغبەگ ڕووی لە بابی وەرگێڕا و بەرەنگاری وێستا. لە دەوروبەری سەمەرقەند باوک و کوڕ تێکگیران و میرزا ئۆلغبەگ شکا و بەرەو شاروخییە ڕۆیی. غولامی نانخۆری ناندێندڕ دەرگای قەلای لێنەکردەوە. دەیهەویست پەنا بەرێتە بەر ئەبولخێرخانی ئۆزبەک، بەلام بیری کردەوە کە سۆزی باوک و فرزندی لە گۆڕێدایە و بۆ لای سەمەرقەند بزووت و بەرەو کوڕەی ناجوامێری تێکشا. مانگی ڕەمەزان بوو کە بێ ترس چووە لای عەبدوللەتیفی کوڕی. ئەو چارەڕەشە تەواوی ئەرک و ئەمەگی

باوكايەتی ژێرپێ خست و ڕووی وەرگێڕا لە پەند و ئامۆژگاری زانایان و مەزنەمامۆستایانی بەرەی ئادەمی کە بە درێژایی زەمان هاتوون و چوون و زۆریشیان سەبارەت بەم مەبەستە پێ لێهەلێناوە.

لەوەتی ئیسلام هەیە، ناوەللا لە ڕۆژگاری ئەسکەندەری جووتقۆچەوە هەتا ئێستا پادشایەکی ئاوا بلیمەت و پیتۆلی بەدەسەلات خۆی نیشان نەداوە. بە دەستی هەباسناوێک گەیشتە پلەی بەرزی شەهید بوون.

عەباس كوشتی بە شیری زالی زۆردار

«عەباس كوشت»ی بە ئەبجەد سالی مەرگی

ئەو چارەڕەشە شەش مانگ دوای كوژرانی باوكی بە دەستی «باباحوسێن»ناوێكی غولام و ئەمەگداری بابی پشووی لێبڕا و ئەم شێعرەی لێوەدیهات:

کێ باوکی بکوژێ لەبۆ شا نابێ

بش بێ لە شەش مانگ بۆ ئەولا نابێ

یەکێک لە سەیر و سەمەرەکانی ژیان، ڕێکەوتی کوژرانی ئەویش بوو کە لەگەڵ کابرای بکوژی یەکتری دەخوێندەوە و هۆنەرێک گوتوویەتی:

باباحوسێن کوشتی شەوی هەینی بە تیرێ

باباحوسێن کوشتی دەبێتە سالی مەرگی

هەر ئەم شەوەی کە میرزا عەبدوللەتیف کوژرا، مەزن و ماقوولانی سەمەرقەند میرزا عەبدوللای کوڕی میرزا برایمی کوڕی میرزا شاروخیان دانا بە پادشا.

## سالّی ٨٥٤ / ١٤٥٠ ـ ٥١

لەم ساڵەدا سولتان مرادخان لە هەرێمی ڕۆملی چووە بە سێبەری ڕەحمەتی پەروەردگار.[1] وەزیرەکانی ماوەی سێزدە ڕۆژان تەرمەکەیان شاردەوە و مەرگیان نەدرکاند هەتا سولتان محەممەدخان لە مەغنیساوە هات و لەسەر تەختی خونکاری پاڵی دایەوە. ئەمجار مەیتی پیرۆزیان ناشت.

سولتان مرادخان چل و چوار ساڵ ژیا و سیویەک ساڵی فەرمانڕەوایەتی کرد. پێنج کوڕی بووە: سولتان محەممەد، سولتان ئەحمەد، سولتان عەلائەددین، سولتان حەسەن و سولتان ئوورخان. سولتان ئەحمەد و سولتان عەلائەددین لە ئاماسییە مردوون و هەر لەوێش نێژراون . سولتان حەسەن و سولتان ئوورخان لە ئەدرنە کۆچیان کردووە و لە دارولحەدیس بە خاک ئەسپێردراون.

وەزیرەکانی بریتی بوون لە: ١- برایمپاشا ٢- حاجی عەوێزپاشا ٣- دەمووورپاشای کوڕی تەیموورتاشپاشا ٤- سارووجەپاشا ٥- عەلیپاشا ٦- ئیسحاقپاشا ٧- شەهابەددینپاشا ٨- بەلبانپاشا ٩- خەلیلپاشای کوڕی برایمپاشا.

هەر لەم ساڵەدا میرزا ئەبووسەعیدی کوڕی میرزا سولتان محەممەد کوڕی میرزا میرانشا کوڕی میر تەیمووری کوورەگان لە بوخارا ڕاپەڕی و نەزیلەکەی ئاوایە:

---

١- مێژووی عوسمانی، ب ١، ل ٥٠٨، مەرگی سولتان مرادی دووەم دەباتەوە ڕۆژی یەکەم چوارشەممەی مانگی محەڕڕەمی ساڵی ٨٥٥ ی ک/ سێی شوباتی ١٤٥١ ی ز.

میرزا سولتان ئەبووسەعید لە سەمەرقەند لە ڕکێفی میرزا ئۆلغبەگدا بوو. ئەو دەمەی کە میرزا ئۆلغبەگ لە قەراخ ڕووباری جەیحوون بەرەوڕووی میرزا عەبدوللەتیفی کوڕی سینگی داکوتابوو، ڕایکرد و چووە نێو خێڵی ئەرغوون و دەستەوبەستەیەکی لێ ساز کردن و هاتە سەر سەمەرقەند. وەختایەک میرزا ئۆلغبەگ بەم دەنگ و هەرایەی زانی خێرایەکی لە قۆشەنی ڕاخوڕی و دەمکوت و تاراندنی ئەوی بە گرینگتر دانا و بەرەو سەمەرقەند غاری دا. سولتان ئەبووسەعید کاتێک گوێی بە ژاوەژاوی هرووژمی لەشکری میر زرینگایەوە هەڵات و هۆری‌هۆری چۆوە نێو خێڵی ئەرغوون. پاش ئەوەی میرزا عەبدوللەتیف بنەی بە کێشەی باوکی هێنا و کوشتی، پیاوی ناردە سەری و گرتی و هێنایە سەمەرقەند و لە بەندیخانەی پەستاوت. میر بووسەعید بەندی زیندانی هەڵبوارد و بۆی دەرباز بوو و خۆی گەیاندە بوخارا. داڕۆغەی شار گرتی و وای چۆڵەپێچ کرد دەتگوت کەوتۆتە نێو جەغزی بەرچاوی تەنگی گولی بەغیل. بەڵام ڕاست لەو ڕۆژەدا هەواڵی کوژرانی میرزا عەبدوللەتیف گەیشتە ئەو شوێنە. کەیخودا و پیاوماقووڵانی بوخارا بۆ عوزرخوازی چوونە خزمەت میرزا سولتان ئەبووسەعید و لە زیندان هێنایانەدەر و دایاننایە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی. ئەو ڕێزدارە قنیاتی بە حکوومەتی بوخارا نەکرد و لەڕێوە هێرشی بردە سەر میرزا عەبدوڵلا کە دوای میرزا عەبدوللەتیف لە سەمەرقەند جڵەوی دەسەڵاتی بە دەستەوە گرتبوو. کاتێک گەیشتە دە فرسەخی سەمەرقەند، میرزا عەبدوڵلا قۆشەنی لێ‌دەنگ دا و بەهەشتاو بەرەوپیری بزووت. دوای شەڕ و لێکدان و کوشتار، میرزا عەبدوڵلا سەرکەوت و بووسەعید بەزی و کۆڵی دا و پشتی لێکردەوە و ڕایکردە تورکستان.

باسی شوێنەواری خێر و خێراتی بەجێماوی سوڵتان محەممەدخانی دووەم(؟):[١] تەواو کردنی مزگەوتی گەورەی ئەدرنەیە کە مووسا چەلەبی لە رۆژگاری دەسەڵاتی خۆیدا بناغەی ڕۆنابوو و بە نیوەچڵی مابۆوە و مەرگ مەودای نەدابوو رایپەڕێنێ. وەختایەک سوڵتان محەممەدخان جڵەوی حکوومەتی بە دەستەوە گرت درێژەی پێدا و تەواوی کرد و کۆمەڵێک دووکان و ژووری جۆلایی و کووتاڵتەنی لە دەوری مزگەوتی جامیع هەڵخست. ئەویش پێڕانەگەیی و مرد. سەرەنجام سوڵتان مرادخانی (دووەم) کۆتایی پێهێنا. ئەوقافی مستەوفی بۆ مزگەوتی گەورە دیاری کرد کە بە «ئیسکی جامیع» ناودێرە. مزگەوتێکی دیکەی بۆ نوێژی هەینی دانا کە ئێستا بە «مەولەویخانە» بەناوبانگە. پردێکی گەورەی لەسەر ئاوی (شارۆکەی) ئەرگەنە هەڵبەستووە کە سێسەد و شێست خێوەت لە خۆی دەگرێ و ئەو سەرەوسەری مزگەوتی چاک و خانەقای لێساز کردووە. هەموو ساڵێک هەزار سکەی فلووری[٢] بۆ پێنجیەکی خانەدانی حەزرەتی محەممەد دیاری کردووە کە بدرێ بە مەزنەسەیدان و گەورەپیاوانی بەرزەجێ و هەروابێتەوە سێ هەزار سکەی ئاڵتوونی داناوە بۆ هەژارانی مەکەی پیرۆز و مەدینەی نوورانی و لە ملکانەی خۆی داویەتی و ناردوویەتی.

گەورە مامۆستایان و شێخانی ناوبەدەرەوەی دەورەی سوڵتان مرادخان بریتی بوون لە: ١- مەولانا محەممەدی ئەرمەغانی کە یەکێک بووە لە فەقێکانی

---

١- سوڵتان محەممەدخانی یەکەم دروستە. و

٢- فلوورین یا فلووری سکەیەکی زێڕ بوو کە یەکەمجار لە فلۆرانس لێدرا و گوڵی شەشپەڕی لەسەر نەخشابوو. پاشان هەموو سکەیەکی زێڕ لە ئورووپا پێیگوترا فلوورین. عوسمانییەکانیش وەختایەک سکەی زێڕیان لێدا هەر ناویان نا فلوورین... وا دیارە هەر فلوورییەک بۆتە سێ درەم. (مێژووی عوسمانی، ب ١، ل ٦١٨-٦١٩).

مەولانا فەناری و زۆر خوێندەوار بووە و سەرەنجام بۆتە قازیعەسکەر و موفتی سەردەمی خۆی. ٢- یکن ئۆغلی(؟) کە ناسراوە. ٣- مەولانا شامحەممەدی یکن ئۆغلی کە بۆتە قازی بوورسا. ٤- مەولانا محەممەد یۆسفی بالی یکن(؟) مامۆستای حوجرەکانی بوورسا و کابرایەکی زۆر زانا بووە. پەراوێزی لەسەر «تەلویح» نووسیوە. ٥- مەولانا شەرەفەددین(؟) سەید ئەحمەدی قریمی کە پیاوێکی فرەزان بووە و گەلێک کتێب و نووسراوەی بەرچاوی هەیە. لە ئیستانبووڵ بۆتە مامۆستای خوێندگا هەرەبەرزەکان و لەگەڵ میر نێوانی خۆش بووە. ٦- مەولانا سەید عەلی سەمەرقەندی کە هاتۆتە ڕۆم و لە لارندە بۆتە مامۆستا و لە نێو زانایاندا شوێنەواری قەڵەمی دیارە و لێکدانەوەی مەنشوورە. ٧- مەولانا ئەحمەدی گۆرانی کە لە بواری حەدیس و شەریعەت و لێکدانەوەدا تاقانەی ڕۆژگار و پارسەنگی زەمان بووە و بۆتە مامۆستای سوڵتان محەممەدخانی (دووەم). ٨- مەولانا تاجەددین ئیبراهیم، مەشهوور بە خەتیبزادە کە لە زانستی مەعقوول و مەنقوولدا کەس تای نەکردووە و گەلێک نووسراوەی بەپێزی هەیە. مووچەی سەد ئاقچە[1] کە سەرەتا لە هەرێمی ڕۆم بۆ مامۆستایان دیاریکرا، لەویرا دەستی پێکردووە. ٩- مەولانا خدرپاشای (؟) مەنتەشالوو کە

---

١- یەکەمین سکەی زێو کە ساڵی ٧٢٧ی ک / ١٣٢٧ ی ز بە فەرمانی ئوورخانبەگ لێدراوە. لە بەرێکی دەستەواژەی شادەوئیمان و ناوی چوار خەلیفەی ڕاشیدین نووسراوە. لە بەرەکەی تری ناوی ئوورخانی کوڕی عوسمان و شوێنی لێدرانی کە بوورسایە وەبەرچاو دێ. لە خوار وشەی بوورسا ژمارەی ٣ بە ڕێنووسی سیاق نووسراوە و لە قەراخەکانی ساڵی ٧٢٧ بە عەرەبی نەخشێندراوە. لە سەرەوەی وشەی ئوورخانیش دروشمی تیرەی قایی کە عوسمانی دەچنەوە سەر ئەوان خۆی دەنوێنێ... کێشی یەکەم ئاقچە ٥ قیرات و سێ حەببە بووە. ئوورخان دواتر دوو ئاقچە و پێنج ئاقچەشی لێدا. دوو ئاقچە یازدە قیرات و یەک حەببە و پێنج ئاقچە سێزدە قیرات و سێ حەببە قورس بوون. (مێژووی عوسمانی، ب ١، ل ١٤٨، ٦١٦).

لە نێو پۆلی چازانان‌دا بە حەمید ئۆغلی ناسراوە و لە پێش‌دا بۆتە فێرکاری سوڵتان محەممەد. ١٠- مەولانا هەمزەی قەرامانی کە لە بواری زانستی عەقڵی و نەقڵی‌دا نووسراوەی هەیە و ئاخرییەکەی بۆتە موفتی چەرخی ژیانی خۆی. ١١- مەولانا عەلائەددینی قۆچحەساری کە بۆ نووسینەوەی دەقی کتێبان بێوێنە بووە. لەسەر «میفتاح» شیکردنەوەی کردووە. ١٢- مەولانا قوتبەددینی ئێزنیقی کە حەقیقەت و شەریعەت و تەریقەتی پێکەوە کۆکردوونەوە و لە سۆفیگەری‌دا دەستێکی باڵای بووە. لەوپەڕی جوانی و پتەوی‌دا پەراوێزی لەسەر «فسووسولحەکەم» نووسیوە. ١٣- شێخ ئاق‌بیق کە سەرتۆپی بیروردانی سەردەم بووە. ١٤- شێخ محەممەدی کەلیبوولی کە بە یازیچی ئۆغلی مەشهوورە. کتێبی «محەممەدییە» شوێنەواری ئەوە. ١٥- مەولانا شێخی گرمێنی کە کتێبی خوسرەو و شیرینی بە تورکی هۆنیوەتەوە. خەڵکی ڕۆم ئەوەندەیان بڕوا بەو چیرۆکەشێعرەیە کە هەر باسی ناکرێ. ١٦- موسلیحەددین ئەدرنەوی کە بە ئیمامی دەباغان ناسراوە و لە زانستی بەدی و نەبەدی زانیوە. ١٧- مەولانا پیری خەلیفەی حەمیدئیلی کە گەیوەتە پلەی هەرەباڵا و لە چلەپۆپەی پیران باڵی ئەنگاوتووە و تەڕایی لە کاڵی تێدا نەماوە و تەواو کوڵیوە. ١٨- شێخ تاجەددین ١٩- شێخ حەسەن ٢٠- شێخ شەمسەددین کە هەرسێکیان لە زانستی هەرێمی ناخ و ڕواڵەتا تەواو پوختە بوون. یارەببی خودا بە شنەی بۆنخۆشی پاکی خۆی ڕووحیان بگەشێنێتەوە و دەروازەی ڕەحمەتیان بە ڕووی‌دا بکاتەوە.

## ساڵی ٨٥٥ / ١٤٥١ ـ ٥٢

میرزا ئەبولقاسم بابور و میرزا محەممەد سوڵتانی برای لە ناوچەی چنارانی سەر بە ئەستەراباد پێکەوە بە شەڕهاتن و لەشکری سوڵتان محەممەد شکستی بە ئەستۆی‌دا بڕا و بۆخۆی گیرا و بردیانە لای بابورمیرزا. تیر و تانەی لێدا و بە سەری ڕۆیی و گوتی بۆ قۆشەنت بە سەر وەرکردووم؟ سوڵتان محەممەد گوتی براله کاری حکوومەت و دەسەلات ئەوانەی هەر پێوەیە. دوای ئەم

دەمەتەقانە دەستەیەک وەک ئاوری بن کا لێی‌نەگەڕان و حـوکمـی کوژرانیـان پێ‌دەرکرد.

سولتان محەممەد سی و چوار ساڵ ژیا. دە ساڵی حکوومەت کرد؛ پێنجی وەک بریکاری میرزا شاروخی باپیری و پێنجەکەی دیکەی سەربەخۆ. لە نێرینان تەنیا میرزا یادگار محەممەدی لە پاش بەجێمابوو کە تەرمەکەی ڕاگواست بۆ شانشینی هیرات و خوێندنگای دایەگەورەی کە گەوهەرشادئاغا بێ و لە پەنا گۆڕی بـابی ناشتی. ژنەکەی وا بە سۆز دەگریا و شینی دەگێڕا و قوڕی دەپێوا کە بۆسۆی لە جەرگ و هەناوی هەڵدەستا و لە تاوان دوای دوو ڕۆژان دیقی کرد و گیانی شیرنی لە دەوری گڵکۆی مێردەکەی گێڕا و ئەوەش ڕووداوێکی یەکجار سەیر بوو.

میرزا بابور وەختایەک گێرە و کێشەی بـرای لـە کـۆڵ بـۆوە و سـەرینی خاترجەمی وە ژێر سەری دا، کەوتە بیری بڕینەوەی دڵخورتەی خۆی لە بابەت عەلائوددەولە کە برایەکی دیکەی بوو. بۆیە فەرمانی دا کە شیشی سوورەوەبوو بە چاوی میرزا عەلائوددەولەدا بکێشن کە لای خۆی بەند کرابوو.

لە سینەتدا ئەگەر بـێ چاوی ڕووناک

لە شینکە و جاڕەگوڵ بـڕوانـە سـەرپـاک

وەکوو پەندێ دەچـێ ئەم سەوزەڵانـە

بـە تۆزێکی دەشەمـزێ سیس و خـەمنـاک

وەها چاوێ کە کـل دەیکـرد برینـدار

لەبەر شیش چۆن نەچۆقی، بیرکەوە چاک

وا دەگێڕنەوە کە عەلائوددەولە ئەو دەمەی کوێریان دەکرد ئەم شـێعرانەی هۆنینەوە:

گەردوون کـە بـە دڕدۆنگـی لـە مـن ڕاسـاوە
بەم چەرخ و خـولـەی دڵـم لـە ژیـن تـاسـاوە
چاری چەمی من وەختێ کە نووسراوە لە شیش
تەمەنی لاوی دەلاڵێتەوە، هاواری لە دڵ هەستاوە

«بەڕاستی ئەمەش پەندە بۆ ئەوانەی وردبینن.»[1]

هەر لەم ساڵەدا میرزا سوڵتان ئەبووسەعید کە پارەکە دوای بەزین لە ئاست میرزا عەبدوڵلا بەرەو تورکستان ڕەویبوو، بە پشتیوانی ئەبولخێرخانی ئۆزبەک تێهـەڵچـۆوە و تـەشـریفـی بەرەو شەرگە ئەسپی ئاژاوت. میرزا عەبدوڵلا بە یەکانگیری و هێرشی دوژمنانی زانی و قۆشەنێکی بە ئەندازەی دەنکی بارانـی بێژماری کۆکردەوە و لە سەمەرقەندەوە بە قەنەقن وەدەرکەوت. پاش تێپەڕینی لە ڕووباری کووهەک، هێزەکان تێکهەڵـەنگووتن و مـیرزا عەبدولـلا دەسـتی پێنەکراوە و لەشکری بەزی و بوو بە هەڵاتهەڵاتی سواران. لە جەنگەی ڕاکردنا یەکسمەکەی لە قوڕ و زەلەق چەقی و وەبەر پەنجەی چارەنووس کەوت و بە دیل گیرا. شەوی شەممەی ٢٠ی مانگی جیمادی یەکەم بە فـەرمانی مـیرزا سوڵـتان بووسەعید شەکراوی شەهیدبوونی بە زاریدا کرا. میرزا سوڵتان بووسەعید لـە شاری سەمەرقەند وەژوور کەوت و لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی پاڵی داوە.

## ساڵی ٨٥٦ / ١٤٥٢ _ ٥٣

لەم ساڵەدا سوڵتان محەممەدخان لە دەوروبەری ئیـستانبووڵ حەسـار و قەڵایەکی بنیات نا کە بە بوغازی کەسن ناسراوە.

---

١- « ان فی ذلك لعبرة لأولی الابصار»، قورئانی پـیرۆز، سـوورەی ئـالی عیمـران، ئایەی ١٣.

هەر لەم ساڵەدا پاش ئەوەی بابورمیرزا خەمی کێشەی براکانی لە گەردنی دارنی، لە ڕێگای بیابانی یەزدەوە بەرەو عێراق و فارس بزووت. کاتێک لە شیرازەوە دەچوو بۆ ئیسفەهان، قاسیدێک لە ڕێیەدا گەیشتە لای و خەبەری دایە کە لە هیرات ئاژاوەیەکی گەورە سەری هەڵداوە و وڵات تەواو شێواوە. میرزا عەلائوددەولە کە شیشی بە چاوی‌دا کێشراوە، گلێنەی چاک نەپێکراوە و سۆمایی هەر ماوە و راپەڕیوە و جەماوەری تێهاڵاوە.

میرزا وەختایەک ئەو هەواڵەی بیست سەری جڵەوی وەرسووڕاند و گوتی ئەو حاڵە بەو حاڵە ناشێ و لە ناوچەی کۆشکی زەردی نێوان شیراز و ئیسفەهانەوە بەرەو خوراسان ئەسپی تاو دا. کاتێک گەیشتەوە هیرات تێیانگەیاند کە میرزا عەلائوددەولە بەرەو هۆردووی جیهانشامیرزای کوڕی قەرەیۆسف ڕۆیشتووە کە ئەو دەمی لە ڕەی بنەی داکوتابوو. میرزا ئەبولقاسم بابور دڵی حەساوە و ئەو زستانە لە خوراسان بە کەیفی خۆی ڕایبوارد.

## ساڵی ٨٥٧ / ١٤٥٣ ـ ٥٤

سوڵتان محەممەدخانی حوکمڕانی ڕۆم کاری سەیر و سەمەرەی کرد و چوارسەد لۆتکەی ڕێکخست و لە ویشکانییەوە بە عەرابان ڕایکێشان و لە لای مەرقەدی پیری مەزن ئەییووبی ئەنساری خوابەشیوڕا بە ئاوی دادان. دەڵێن حەفتا کەشتی پاڵ ڕێکداوە و کردوویەتە پرد و هێزی بەرەو ئیستانبووڵ پێدا پەڕاندۆتەوە. چل و پێنج ڕۆژ دەورەی قوستەنتەنییەی داوە و ڕۆژی سێشەممۆی ٢٠ی جیمادی دووەم شار و شوورەی گیراوە و لەشکری ئیسلام زۆری دەسکەوت و خەنیمەت وەچنگ هێناوە. ڕۆژی هەینی لە ئەیاسۆفییەی کلیسای کافران نوێژ کراوە و خوتبە بە ناوی ناوداری سوڵتان محەممەدخان خوێندراوەتەوە. ئیدی لەو دەمی‌ڕا ئیستانبووڵ بۆتە پایتەختی سوڵتانەکانی خانەدانی عوسمان.

هەر لەم ساڵەدا هەرێمەکانی فارس و عێراق کەوتنە بن دەستی میرزا جیهانشای کوڕی قەرەیۆسفی تورکمان. وڵاتێکی ئاوا خۆش و گەش و ئاوەدان کە

بۆ ماوەی هەشتا ساڵ لە ژێر دەسەڵاتی میر تەیمووری کوورەگان و پاشەوارەکانیدا بوو، دەرکێشرا و کەوتە چنگ تورکمانان.

### ساڵی ٨٥٨ / ١٤٥٤

میرزا قاسم بابور ڕووی کردە ئەوبەرڕووبار و سوڵتان ئەبووسەعیدی بۆ ماوەی چل ڕۆژ لە شاری سەمەرقەند ئابلۆقە دا و پاشان لەگەڵی پێکهات و ئاشتی باڵ و پەڕی هەڵدا و ئەویش گەڕایەوە خوراسان.

### ساڵی ٨٥٩ / ١٤٥٤ ـ ٥٥

سوڵتان محەممەدخان لە خاکی ڕۆم قەڵاکانی سێلووری (سیلیووری)، بێغادووس (بیگادووس)، ئینووز، سووریحەسار و نەوابەردەی داگیر کرد.

### ساڵی ٨٦٠ / ١٤٥٥ ـ ٥٦

سوڵتان محەممەدخان قەڵای بێلغراد (بێلگراد)ی گرت. هەر ئەم ساڵە بابورمیرزا لە هیراتی ناوەندی دەسەڵاتەوە چووە شاری پیرۆزی مەشهەد و لەوێ بنەی خست.

ئەبووسەعیدمیرزا لە بنەبانی ئەم ساڵەدا خودا لە شاری سەمەرقەند کوڕێکی پێوقەدەم بەخێری دایە کە ناویان نا میرزا شێخ عومەر.

### ساڵی ٨٦١ / ١٤٥٦ ـ ٥٧

سوڵتان محەممەدخان لەگەڵ قەراڵی ئەنکرووس شەڕی کرد و لێکدانێکی سەخت قەوما. قەراڵ برینی هێنا و پێیەوە مرد و چوو بۆ جەحەندەم.

ڕۆژی سێشەممۆی ٢٥ی مانگی ڕەبیعی دووەم بابورمیرزا لە شاری پیرۆزی مەشهەد ڕووی کردە دنیای هەرمان. میرزا شامەحموودی کوڕەی گەورەی یازدە ساڵانەی هەر لەو ڕۆژەدا چووە سەر تەختی حوکمات و بوو بە میر. میرزا ئەبولقاسم بابور سی و شەش ساڵ تەمەنی بڕی کرد. وا دەگێڕنەوە کە دە ساڵی فەرمانڕەوایەتی کردووە. لە هێندێک سەرچاوەی مێژوویی‌دا هاتووە کە بابورمیرزا چوار ڕۆژ بەر لە مردنی، وەختایەک بۆ گەشت و سەیران و ڕاو لە

باژێری مەشەد دەرکەوتبوو و تەشریفی بە سەیرانگایەکا دەگەڕا، لەپڕ دەروێشێکی سەر و ڕیش ئاڵۆزی پاپەتی لێپەیدا دەبێ. لەسەر تەختەبەردێک جڵەوی ئەبولقاسم بابور دەگرێ و تەرجیعبەندێکی پتر لە پەنجا چامی بۆ دەخوێنێتەوە کە سەرلەبەری باسی بێوەفایی دنیا دەکا و ئەمە سەربەندی بووە:

فەرمانی کفلاکوون و ئەم گشتە خۆڕانانە[1]

هەر وەبەر چاوی نایە ئەوەی شێتی زەمانە

دوای خوێندنەوەی ئەم دەستەشێعرە دەروێش لەبەر چاوان ون دەبێ و میران و کاربەدەستانی دەسەڵات هەرچەندی بە شوێنیدا دەگەڕێن نایدۆزنەوە.

میرزا شامەحموود هەژدە ڕۆژ پاش کۆچیدوایی باوکی لە مەشەدەوە ڕوو دەکاتە هیراتی شانشین و ماوەی دوو مانگ کە لەوێ دەمێنێتەوە، لە قۆڵی «مورغاب»ەوە دەنگ دادەکەوێ کە میرزا برایمی کوڕی میرزا عەلائوددەولە بە لەشکرێکی وەک مار و مێروو بەرەو خوراسان دەکشێ. چونکە میرزا شامەحموود دەروەستی نەدەهات، ڕووی کردە مەشەد.

میرزا برایم گەیشتە هیرات بێ هیچ گیر و گرفتێک و لە سەرەتای مانگی ڕەجەبدا دانیشتە سەر تەختی خونکاری. لە نێوەڕاست مانگی شاباندا بە مەبەستی تەزاندنی شامەحموود تەشریفی چوو بۆ لای مەشەد. میرزا شامەحمووديش هێزێکی گەورەی لە دەوری خۆی کۆکردبۆوە و سەری جڵەوی بەرەو هیرات وەرگێڕا و بزووت. قۆشەنی هەردوولا کە دەجووڵان و دەهاژان ڕاست لە مابەینی شارۆکەی کووسوویە و کاروانسەرای شامەلیک پێکداهاتن و زۆر لەمێژە شەڕی وا نەقەوماوە. لە پێشدا هێزەکانی میرزا برایم شکستیان

---

١- کفلاکوون، «کن فیکون». فەرمانی خوداوەندە و یانی: «ببە، دەبێ».

تێکەوت و چەکدارەکانی دەستیان لێکبەردا، بەڵام سەرەنجام میر محەممەدی تورخان لە دواوەڕا گەیشتێ و ئەوپەڕی ئازایەتی و مەردایەتی نواند و لەشکری میرزا شامەحموودی تەفروتونا کرد. میرزا شامەحموود بوو بە ڕێبواری ڕێگەی ڕاکردن و بەرەو مەشەد ڕەوی. سەیر ئەمە بوو کە چەشتەنگاوی ڕۆژی دووشەممۆ ٢٥ی شابانێ خەبەر گەیشتە هیراتی شانشین کە میرزا شامەحموود سەرکەوتووە و بالادەستە. دوای ماوەیەک پۆلێکی دیکە گەیشتنێ و گوتیان کە میرزا برایمی زاڵی سەرکەوتە خەریکە دەگاتەوە. جەنگەی نیوەڕۆ ڕاسپاردەی میرزا بووسەعید تەشریفی هێنا و گەلێک حوکمی پلە و پایەی بۆ گەورەپیاوان و مەزنەوەجاخان کردە دیاری و خەبەری دا کە بە هیوای خودا بەیانی کەژاوەی مبارەکی لە باغی شار لەنگەر دەگرێ و تەشریفی دادەبەزێ. بەریبەیانی میرزا سوڵتان ئەبووسەعید لە شوێنی دیاریکراو ڕکێفی بەتاڵ کرد. میرزا برایم چووە سەرهەدی جورجان و ئەستەراباد و میرزا ئەبووسەعید ماوەی چل و سێ ڕۆژ لە هیرات بنەی داگرت. گەوهەرشادئاغای خێزانی پایەبەری شاروخمیرزای کوشت و پاشان بەرەو بەلخ ڕۆیی.

## ساڵی ٨٦٢ / ١٤٥٧ ـ ٥٨

وەختایەک جیهانشامیرزای کوڕی قەرەیۆسف هەواڵی مردنی بابورمیرزای بیست، لە ئازەربایجانەوە ڕووی کردە خوراسان. دوای ئەوەی کە لە کلکەی «سەندووقی سەکەن» تێپەڕی و فرسەخێکی هەتا ئەستەراباد مەودا مابوو، میرزا برایمی کوڕی عەلائوددەولە کە ئەو کاتی لەو مەڵبەندە دەژیا بە مەبەستی لێدانی، سپای دەنگ دا. لە نیزیک ئەستەراباد لەشکریان پێکوەربوون و گەلێک میر و میرزادەی جوغتای تێداچوون. میرزا برایم هەر خۆی بۆ ڕانەگیرا و هەوساری بە چنگەوە نەما و ڕەوی و هەتا هیرات سەری جڵەوی هەڵنەنگاوت و لغاوی بە دەمی ئەسپیدا نەدایەوە. ڕۆژی یەکشەممۆی مانگی سەفەر وەختایەک گەیشتەوە نێو کۆڵان و شەقامان، قەلەندەرێک لەسەر خوانچەکەی خۆی

ڕاستەوەبوو و گوتی: پادشای جیهان تەمەن درێژ بی! پێموایە ئەگەر هێرشێکی دیکەت بە دەستەوە بێ خاشەی تۆرەمەی جوغتای دەکێشی!

میرزا جیهانشا حەوت مانگ لە ناوچە و مەڵبەندەکانی جورجان ئاڵای دەسەڵاتی هەڵدا و پاشان ڕووی کردە هیرات. سەرەتای مانگی شابان وەختایەک میرزا برایم بە داوەرینی میرزا جیهانشای زانی، زینی کوتایە پشتی ئەسپان و بەرەو شاخستانەکانی غوور و غورجستان بە وێرغە ڕۆیی. میرزا جیهانشا نێوەڕاستی ئەم مانگە لە باغی زاغان ڕکێفی بەتاڵ فەرموو. بە ئومێدی خودای میری مەزن پاشماوەی بەسەرهاتەکان لە ساڵی داهاتوودا دەخرێنەڕوو.

## ساڵی ٨٦٣ / ١٤٥٨ ـ ٥٩

میرزا سوڵتان ئەبووسەعید کاتێک لە ناوچەی بەلخ بە چوونی جیهانشامیرزای زانی و لێی ڕوون بۆوە کە لە هیراتی پایەختی بنەی داکوتاوە، خۆی ساز دا بۆ شەڕ و لێکدان و چەند ڕۆژێک لە لێواری ڕووباری مورغاب هۆردووبەزی کرد. لەم ماوەیەدا پیاوی ناردە لای میرزا جیهانشا و لێیڕاسپارد کە وا چاکە لەسەر ملکی باوک و باپیرانی ئێمە هەستێ و بگەڕێتەوە ئازەربایجان کە میرزا شاروخ باربووی کردووە. کاتێک کەیخوداکانی ئەبووسەعیدمیرزا گەیشتنە لای جیهانشامیرزا و ڕاسپاردەکەیان ڕاگەیاند، چونکە ئەویش کۆمەڵێک هەواڵی تاڵ و ناخۆشی لە باڵی ئازەربایجانەوە پێگەیبوو، قسەی ڕاسپێراوەکانی بە موژدە و سەرکەوتنێکی گەورە دانا و ملی دا بۆ پێکهاتن. هەر خێرایەکی وێڕای میرزایادگار محەممەدی کوڕی میرزا سوڵتان محەممەد کوڕی میرزا بایسونقور کوڕی شاروخمیرزا بەرەو ئازەربایجان گەڕاوە.

میرزا ئەبووسەعید چووە هیرات و لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی خانەدانی خۆی ڕۆنیشت. لەم سەروبەندەدا میرزا شامەحموودی کوڕی میرزا ئەبولقاسم بابور و میرزا برایمی کوڕی میرزا عەلائودەولە چوونە بەر دلۆڤانی خودا.

## ساڵی ٨٦٤ / ١٤٥٩ ـ ٦٠

لەم ساڵەدا قزڵئەحمەدبەگ لە هەرێمی ڕۆمەوە ڕایکرد و چووە خزمەت حەسەنبەگی کوڕی عەلیبەگ کوڕی قەرەعوسمان کوڕی قۆتلوغبەگی ئاققۆیوونلووی حوکمداری دیاربەکر. سوڵتان محەممەدخان، سمایلبەگی برای بە خاوخێزانەوە بەڕێکردە ڕۆملی و لەوێ مواجبێکی بۆ بڕییەوە.

## ساڵی ٨٦٥ / ١٤٦٠ ـ ٦١

سوڵتان محەممەدخانی (دووەم) لەشکری نارده سەر ناوچەی دەسەڵاتی قزڵئەحمەدبەگ و قەڵاکانی قەستەمووني، سینووب، ترابزوون، قۆیوونلووحەسار، مەدلوو و «یایچە»ش کەوتنە دەس پیاوەکانی دامودەزگای دەسەڵاتی میری.

هەر لەم ساڵەدا میرزا عەلائوددەولەی کوڕی میرزا بایسونقور کە لەوەتی براکەی زەردایی لە چاوان بڕیبوو بە سەرگەردانی بێروبەوێدا دەخولایەوە، لە ڕۆستەمدار لە ماڵی مەلیک بێستوون مرد. مەیتەکەیان بردەوە هیرات و لە پەنا باوک و برای ناشتیان.

## ساڵی ٨٦٦ / ١٤٦١ ـ ٦٢

سوڵتان محەممەدخان بە ئامانجی چوونە خەزای هەرێمی ئەفلاق ڕاستەوەبوو. دوای زەبروەشاندن بە خۆشی و کامەرانی گەڕایەوە.

هەر لەم ساڵەدا جیهانشامیرزا بە مەبەستی گوێبادانی پیربوداقی کوڕی لە ئازەربایجانەوە ڕووی کردە فارس. پاش ئەوەی گەیشتێ کێشەکە بەوەی بڕاوە کە پیربوداق بڕوا بۆ بەغدا و ئەویش سەری وەبەر فەرمانی بابی هێنا و جیهانشا بایدایەوە تەورێز.

## ساڵی ٨٦٧ / ١٤٦٢ ـ ٦٣

لەم ساڵەدا قازقلوو ویوودەی ئەفلاقیان بانگهێشتە بارگای میری و ئەویش سەری بادا و نەهات. چارە وا نووسرابوو کە هێزەکانی ئیسلام هەڵکەنە سەر ئەو

هەرێمە و پێخوستی سمی ئەسپانی بکەن و دایڕووتێنن. پاشان سولـتان پلـەی قازقلوو ویوودەی بەخشی بە براکەی.

لە درێژەی سالا قەلای دوراج و ئەزورنیق گیران و هەردک هەرێمی بۆسنی و هێرسک کەوتنە نێو قەلەمڕەوی دەسەلاتی سولتان محەممەدخان.

## سالی ۸٦۸ / ۱٤٦۳ ـ ٦٤

میرزا سولتان ئەبووسەعید قەلای شاروخییەی سەر سنووری تورکـستانی داگیر کرد. میرزا محەممەد جووکی کوڕی میرزا عەبدولـــلەتیف کــوڕی مـیرزا ئۆلغبەگ کە لەو قەلایەدا ماتەی هەلـگرتبوو، گرتـی و تەشـریفی گەڕایــەوە خوراسان.

## سالی ۸٦۹ / ۱٤٦٤ ـ ٦٥

برایمبەگی قەرامان ئۆغلی مرد و ئیسحاقبەگ و پیرئەحمەدی کوڕانی هاتنە نێو دەرانەی سولتان محەممەدخان و دەسەلاتی باوکیان بۆ بڕایەوە. هەردک برا لـە ئـەرمـەنـاک شـەڕیـان کـرد و ئیسحاقبەگ بـەزی و چـووە خـزمـەت ئووزوونحەسەنبەگی حوکمداری دیاربەکر پیرئەحمەدبەگ لە مەلبەندی قەرامان بە سەربەستی جلەوی حکوومەتی بە دەستەوە گرت.

## سالی ۸۷۰ / ۱٤٦۵ ـ ٦٦

سەرەتای ئەم سالە سولتان محەممەدخان قەلاتی «ئەلبەسان»ی گرت.

هەر لەم سالەدا سولتان ئەبووسەعید زۆر سەخت نـەخۆش کـەوت و دوای ماوەیەک چاک بۆوە.

میرزا جیهانشا لە کۆتایی سالا بە مەبەستی دەمکـوتی پیربـوداقی کـوڕی بەرەو بەغدا بزووت.

## سالی ۸۷۱ / ۱٤٦٦ ـ ٦۷

دوای سالێک گەمارۆدانی بەغدا، جیهانشامیرزا توانی بیگرێ و پیربوداقی کوڕی بکووژێ و سەرکەوتننامە بەڕێ بکاتە لای میرزا سولتان ئەبووسەعید.

## سالی ٨٧٢ / ١٤٦٧ ـ ٦٨

ڕۆژی دەی مانگی شەشەکان میرزا جیهانشا بە مەبەستی چوونە شەڕی حەسەنبەگی بایوندوری لە تەوریز وەدەرکەوت و بەرەو دیاربەکر ڕۆیی. وەختایەک ئەم هەواڵە گەیشتە لای حەسەنبەگ لەشکری خۆی کۆکردەوە و جانگیربەگی برای وێڕای مرادبەگ و برایمبەگی کوڕانی پاڵیان وێدا. میران دانیشتن و خیرەیان بە کەلامی خودا گرتەوە و ئەم ئایەتە خۆی نواند: «بەرەو فیرعەون ڕێکەوە! ئەو لە ئەندازە دەرچووە.»[1]

کاتێک جیهانشامیرزا گەیشتە سەحرای مووش، قاسمی پەروانەچی[2] کە یەکێک بوو لە گەورە سەرکردانی، ئەرکی زێرەوانی و پێشەنگایەتی پێسپێردرا، بەڵام کەوتە بەر گوردی خەنیم و بەرگەی نەگرت. پاڵەوانانی ئاققۆیوونلوو هەموو باڵەکانیان تەنی و مەیدانیان هێنایە جۆلانە و کەوتنە کوشت و کوشتار و یەخسیرکردنی چەکدارەکانی. میرزا جیهانشا لە ئەبتوور (ئەنتوور) چەند ڕۆژێک لەنگەری گرت و سەرۆک و سەردارانی هێندێک بارودۆخەکیان پشکنی و گەڕانەوە. سپاسالارانی ئاققۆیوونلووش گوتیان چونکە ئەو نەیتوانیوە زەبرمان لێبوەشێنێ و خەسارمان پێبگەیەنێ، وا باشە ئێمەش بگەڕێینەوە، بەلام حەسەنبەگ ملی نەدا. کاتێک جیهانشامیرزا لەو هۆردووبەزەوە کۆچ و باری لێنا و لە داوێنی چیا خستی و پاشان بەرەو خوانجەق (سەنجەق)ی سەر بە چۆپاخچوور ڕۆیی و لەوێ هێزی هێور کردەوە، حەسەنبەگ وێڕای شەشهەزار سواری پەنجە بە خوێن هەڵیکردنە سەری. لەم جەنگەیەدا خەبەر هات کە جیهانشامیرزا هۆردووی لە پێشدا

---

١- « اذهب الی فرعون انه طغی»، قورئانی پیرۆز، سوورەی نازیعات، ئایەتی ١٧، ل٥٨٤، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار...

٢- پەروانەچی: بەرپرسی مۆر کردنی فەرمان و حوکمی میران، مۆردار.

بەڕێکردۆتەوە و لەگەڵ چەند کەسێکی دەستەژمێر خەوتووە و خەریکی حەسانەوەیە. حەسەنبەگ سێودووی لێنەکرد و تەپی دایە سەری. کاتێک لە هۆبەی پشوودان و خەوتنی نیزیک بۆوە، جیهانشامیرزایان ئاگادار کردەوە. ئەویش لەڕێوە سەری لێشێوا. بۆرەپیاوێک گەیشتە سەری و زەبرێکی لێدا. شا هاواری کرد مەمکووژە و بمبە لای حەسەنبەگ، زۆرت بە قازانجی تەواو دەبێ. لەبەروەی دەناڵی و برینەکەی قووڵ بوو لە پێ پەڕی و کابرا سەری بڕی. بەڵام چونکە دەترسا نەکا پێی تووشی کێشە و خەسارباری بێ، ڕووداوەکەی نەدرکاند. سەرەنجام ئەسپ و شیر و تیری جیهانشامیرزایان لای کابرای بکوژ دیتەوە و سەرەکەشی وەدەرکەوت. حەسەنبەگ کاژەلاکی ناردە لای سوڵتان ئەبووسەعید لە خوراسان. محەممەدیمیرزا و یۆسفمیرزای کوڕانی گیران. محەممەدی کوژرا و یۆسف کوێر کرا. حەسەنبەگ سەربەرز و سەرکەوتە سەری کەحێلی بەرەو زستانەهەوار وەسووڕاند.

##ساڵی ٨٧٣ / ١٤٦٨ ـ ٦٩

سەرەتای ئەم ساڵە سوڵتان ئەبووسەعید لەشکرێکی بێئامانی بۆ ئەستاندنەوەی تۆڵەی خوێنی جیهانشامیرزا لە حەسەنبەگی بایوندوری بەرەو ئازەربایجان گاڵ دا. وەختایەک ئاوایی «میانە» بوو بە جێ ڕەشماڵی هۆردووی ئەبووسەعید، بەجارێک قۆشەنی سەرما و سۆڵ هێرشی هێنا و تەنگی بە وڵات هەڵچنی و دەستی تاڵانی لێنەپاراست. میری ئەستێران کەوڵی گەواڵەهەوری بە سەر شانی دادا و لە ترسی تۆف و بەند سەری لە سەرسەرای شینی وەدەرنەنا. سوڵتان ئەبووسەعید میران و بەگلەرانی کۆکردنەوە و سەبارەت بە هۆردووبەز لەگەڵیان کەوتە ڕاوێژ کردن. هەموو لەسەر ئەمە ڕێککەوتن کە حەسەنبەگ لە خێڵبەزی قەرەباغ بترازێنن و جێی بگرنەوە. ئاڵا بەرزەکانی بەرەو قەرەباغی ئەرران شەکانەوە. کاتێک گەیشتنە حەوت فرسەخی قەرەباغ و ئاپۆرای بەشەوکەتی شایانی لەنگەری خست، لەبەر کەم بوونی خورد و خۆراک پیاوانی

بەتەگبیر وایان بە باش زانی کە بەرەو مەحمووداوا و قزڵئاغاج بڕۆن هەتا شیروانشا کە هەر باسی دۆستایەتی و لایەنگری دەکرد، بگاتە نێو هۆردووی گەورە.

بەم مەبەستە بزووتن و گەیشتنە دەشت و دەرێک کە گیاوگۆڵی تاڵ و ژاراوی سەری پێکەوە نابوو. هەر ئاژەڵێک قولێکی لێدەخوار، جەرگ و هەناوی دادەفەتا و پێی سەکەت و مندار دەبۆوە. پاشان لە دەشتی موغان هۆردووی میری مەزنەوەجاخ خستی. قاتیوقڕی وای باڵ ئەنگاوت کە مەنێک دەغڵودان بە دە دیناری کەپێکی[1] وەگیر نەدەکەوت. حەسەنبەگ هەموو ڕێوبانەکانی وا تەنیبوون کە کەس نەیدەتوانی هیچ شتێک بەرێتە نێو هۆردووی میری. هەرچۆنێک بێ دوای هاتوچۆی کەیخودایان و ئاڵوگۆڕی چەپکێ نامە و وتوویژێکی زۆر، سەرەنجام حەسەنبەگ سەیدی ئەردەوێلی وەک ڕاسپاردە ناردە لای ئەبووسەعید. پاش گەڕانەوەی گوتی خوراسانی حاڵیان تەواو شڕە و سەریان لێشێواوە و دەستیان بۆ ناکرێتەوە. وا چاکە لەگەڵیان ڕێکنەکەوی، چونکە هێندەی پێناچێ دەرپێیان دە لینگان دەکەوێ و دەڕەون. هەر بۆیە حەسەنبەگ کەیخوداکانی ئەبووسەعیدی ناردەوە کە بە مەبەستی پێکهاتن لەوێ بوون. ئەوانە هێشتا لە خزمەت سوڵتان ئەبووسەعید تەواو لە بنی کوولەکەیان نەدابوو کە ڕەشایی و تارمایی لەشکری حەسەنبەگ سەرەدای پەیدا بوو. لەم جەنگەدا دەستەیەک لە میرانی بێوەفای خوراسان سەنگەرەکانی خۆیان چۆڵ کرد و دایانە پاڵ دوژمنان. میرزا وای تەنگ پێهەڵچندرا کە نیوەڕۆی شازدەی مانگی ڕەجەب بە کۆڵێک دەرد و مەینەت و کوێرەوەری بەرەو سەحرای ڕەوین باڵی گرت. دوو کوڕی حەسەنبەگ کەوتنە پەیکەردەی و گرتیان و نیوەشەو

---

١- چەشنێک سکە. جۆرێک دینار و تمەن کە لە سەردەمی مەغوولان و تەیمووررییەکان و سەفەوییەکاندا برەوی بووە. (وشەدانی دێهخودا، ب ١٢، ل ١٨١٥٨).

هێنایانەوە هۆردووی باوکیان. ڕۆژی ٢٢ی ئەم مانگە، میری بەرزەشان خۆشاوی شەهادەتی نۆشی. مەولانا جەلالەددینی دەوانی دەربارەی ڕێکەوتی کوژرانی فەرموویەتی:

ئەمیر سوڵتان بووسەعید کە بۆ شەوکەتی میری
نەیدەبوو چاوی گەردوون لاوێکی وا بە پیری
بێشک دەبوو نەمێنێ، چونکە ڕێکەوتی مەرگی
«سوڵتان ئەبووسەعید»ە[1]، داندراوە بە ژێری

وەختایەک میرزا سوڵتان ئەبووسەعید لە قەرەباغ بەیداخی چوون بەرەو دنیای پاشینی هەڵدا، یازدە کوڕی لە دوا بەجێما: ١- میرزا سوڵتان مەحموود ٢-میرزا سوڵتان ئەحمەد ٣- میرزا شاروخ ٤- میرزا ئۆلغبەگ ٥- میرزا عومەرشێخ ٦- میرزا ئەبابەکر ٧- میرزا سوڵتان مراد ٨- میرزا سوڵتان خەلیل ٩- میرزا سوڵتان محەممەد ١٠- میرزا وەلەد ١١- میرزا سوڵتان عومەر.

هەر لەم ساڵەدا پیرئەحمەدبەگی قەرامان ئۆغلی کەوتە باری لاساری لەگەڵ سوڵتان محەممەدخانی حوکمڕانی ڕۆم و لێیهەڵبەزییەوە. میری گەورە هەرێمی دەسەڵاتی لێیئەستاند و سوڵتان مستەفای لەوێ کردە بەگلەربەگ.

## ساڵی ٨٧٤ / ١٤٦٩ ـ ٧٠

لەم ساڵەدا ئۆغرلوو محەممەدی کوڕی حەسەنبەگ لەبەر چەند هۆیەک لە باوکی تۆرا و ڕووی کردە بەغدا. لەوێش ڕانەوەستا و یەکسەر چوو بۆ خزمەت سوڵتان محەممەد لە ڕۆم. سوڵتان بەگەرمی پێشوازی لێکرد و کچێکی خۆی دایە و کوڕێکی لێکەوتەوە کە بە گۆدە ئەحمەد ناودێر کرا.

---

١- سلطان ابوسعید، بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە ساڵی ٨٧٣.

هەر لەم ساڵەدا حەسەنبەگ ڕووی کردە عێراقی عەجەم و ئەو وڵاتەی گرت و بەرەو فارس بزووت. یۆسفمیرزای کوڕی جیهانشای کوشت و شیرازی بەخشی بە عومەربەگی مووسلاوی. دواتر ئەو هەرێمەی دا بە سوڵتان خەلیلی کوڕی خۆی و گەڕایەوە تەورێز. ئەو میر و بەگلەر و قۆشەنچییانەی کە لە شەڕی سوڵتان بووسەعیدا یەخسیرکرابوون، تێکڕای خستنە ژێر ڕکێفی یادگار محەممەدمیرزای کوڕی سوڵتان محەممەدمیرزا کوڕی بایسونقورمیرزا کوڕی شاروخمیرزا کوڕی میر تەیمووری کوورەگان و ناردنی بۆ گرتنی خوراسان. وەختایەک یادگار محەممەدمیرزا گەیشتە کەوشەنی بەستام، بیستی کە میرزا سوڵتان حوسێنی کوڕی میرزا مەنسوور کوڕی میرزا بایقورا، کوڕی میرزا عومەرشێخ کوڕی میر تەیمووری کوورەگان لە هیرات چۆتە سەر تەختی دەسەڵات. لەبەرەوەی لەشکرەکەی ڕەق و ڕووت و بێ چەکوچۆڵ بوو، سەری جڵەوی بۆ لای مازندەران باداوە. کاتێک سوڵتان حوسێن بە هاتنی یادگار محەممەدمیرزای زانی، شێلگیر و پتەو هێرشی بردە سەر مازندەران. میرزا یادگار هەتا «چناران» هاتە پێش و هەردک سپا لەو شوێنە بەرەوڕووی یەکتر بوونەوە. پاش دەنگدانەوەی شەقوهۆڕی شیران و هازە و ویزەی تیران و هاژەی نێزان و هەوڵ و هەڵسووڕانێکی زۆر، لەشکری میرزا یادگار شکستی تێکەوت و بەرەو سمنان ڕەوی و میرزا سوڵتان حوسێنیش گەڕاوە جێگای خۆی.

## ساڵی ٨٧٥ / ١٤٧٠ ـ ٧١

لە سەرەتاکانی ئەم ساڵەدا سوڵتان محەممەدخان لە هەرێمی ڕۆم قەڵاکانی ئەرگیلی، ئاقسەرای، گۆلک، گۆکرە و عەلائییەی گرتن.

هەر لەم ساڵەدا یادگار محەممەدمیرزا پاش بەزینی لەبەر سوڵتان حوسێن و چوونی بۆ سمنان، داوای یارمەتی کرد لە حەسەنبەگ و ئەویش چەکدارێکی زۆری تورکمانی ئازەربایجانی ناردە هانای. جارێکی دیکەش ڕووی کردەوە خوراسان و دیسانەوە سوڵتان حوسێن چوو بۆ بەرەگە لێگرتنی. کاتێک گەیشتە

سەبزەوار، میرانی بێوەفای خوراسان پشتیان لێهەڵکرد و پاڵیان وەپاڵ یادگار محەممەدمیرزا دا. ئەویش بە ناچار خۆی بۆی ڕانەگیرا و ڕووی کردە باڵی مورغاب. یادگار محەممەدمیرزا دوابەدوای وی لەشکری بردە هیرات و تەشریفی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشت. کاتێک چل ڕۆژ بە سەر حکوومەتەکەیدا تێپەڕی، سوڵتان حوسێن شەوێ لەگەڵ پۆلەچەکدارێک، لە «بابائیلاهی»ڕا هەڵیکوتایە سەری و لە باغی زاغان پەلاماری دا و لە سەرایەکیدا کوشتی. لەوێ بەو لاوە تازە بوو بە پادشای سەربەخۆی هیرات و خوراسان.

## ساڵی ٨٧٦ / ١٤٧١ ـ ٧٢

لەم ساڵەدا میرزا سوڵتان حوسێن، مەزنەمیری بەڕێز نیزامەددین عەلیشێری هەتا پلەی سەرۆکایەتی دیوانی باڵای فەرمانڕەوایەتی پێهەڵابرد و تاجی سەربەرزی کردە سەری. دەستووری فەرموو کە هەر حوکمێکی دەنووسرێ دەبێ مۆری وی لە سەرەوەی تەواوی سەرۆک و سەردارانەوە بێ. یەکێک لە زانایان سەبارەت بە ڕێکەوتی دەست بە کار بوونی گوتوویەتی:

عەلیشێر خاوەنی شان و شکۆیە و میری گەردوونە
ئەوەندە ورد و وریایە کە ئاوەز واقی وڕماوە
لە ئاخری مانگی شابانێ کە بوو بە میری دیوانێ
عەداڵەت هاتە مەیدانێ، بۆی میرێکی داناوە
کە مۆری رووپەڕی بینی لە ڕۆژگاری شەهەنشادا
بە ڕێکەوتی عەلیشێر مۆری لێدا هاتە ئاراوە[1]

---

١- علی شیر مهر زد، بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە ساڵی ٨٧٦.

### سالی ٨٧٧ / ١٤٧٢ ـ ٧٣

میرزا سولتان حوسێن لەگەڵ میرزا سولتان مەحموودی کوڕی میرزا سولتان ئەبووسەعید، لە «چەکمەن»ی سەر بە ناوچەی ئەندخوود بە شەڕ هات و شکاندی و بە خێر و خۆشی گەڕایەوە هیراتی پاتەختی.

### سالی ٨٧٨ / ١٤٧٣ ـ ٧٤

قلیج ئەرسەلانی حاکمی قەڵای عەلائییە سەری وەبەر سولتان محەممەدخان هێنا و چەند ناوچەیەکی بە کەڵەبڕی بۆ تەرخان کرد و بەرەو ڕۆمئیلی گالی دا.

### سالی ٨٧٩ / ١٤٧٤ ـ ٧٥

سولتان محەممەدخان و حەسەنبەگی بایوندوری لە ناوچەی بایبۆرت دەگژ یەکتر ڕاچوون و شەڕێکی قورس قەوما. ئۆغرلوو محەممەدی کوڕی حەسەنبەگ کە لە ڕکێفی سولتاندا بوو کوژرا، بەڵام سپای حەسەنبەگ شکستی بە ئەستۆیدا برا و سولتانی بەرزەشان، شاد و کامەران گەڕایەوە ناوەندی خەلافەتی.

### سالی ٨٨٠ / ١٤٧٥ ـ ٧٦

لە نێوەڕاستەکانی ئەم ساڵەدا، سولتان محەممەد قەڵاکانی سیلسفکە، ئەرمەناک، کەفە و «مونکووب»ی گرت.

### سالی ٨٨١ / ١٤٧٦ ـ ٧٧

سولتان محەممەدخان توانی دەست دابگرێ بە سەر هەرێمی قەرەبوغدان (مووڵداویا) و سەرۆک ئێستیفان (چلمارە)ی حوکمڕانی وێندەرێ ڕایکرد.

### سالی ٨٨٢ / ١٤٧٧ ـ ٧٨

لەم ساڵەدا سولتان محەممەدخان بە شەڕێکی گەرم و خوێناوی توانی دەست باوێتە سەر قەڵاتی ئەسکەندەرییە.

شەوی مانگی ڕەمەزانی ئەم ساڵە ئووزوونحەسەنبەگی بایوندوری چۆوە بەر دەرگای ڕەحمەتباری یەزدانی . شاعیرێک سەبارەت بە ڕێکەوتی مەرگی گوتوویەتی:

بۆ تاریخی وەفاتی خەڵک وێکڕا دەیانگوت
شای دینپەروەری عادڵ مۆمی عومری کوژاوە[1]

هەر بەڕاستی پادشایەکی دادەوانی خەڵکخۆشەویست بوو. بۆ وەرگرتنی ملکانە و پادارانە و پیتاک لە جەماوەری ژێر سێبەری حوکماتی یاسا و ڕێوشوێنێکی دانابوو کە بە کردەوە سوڵتانەکانی عێراق و فارس و ئازەربایجان ڕەچاویان دەکرد. منداڵانی نێرینەی حەوت کەس بوون: ١- ئۆغرلوو محەممەد ٢-مەقسوودبەگ ٣- زەینەڵبەگ ٤- سوڵتان خەلیل ٥- میرزا یاقووب ٦- میرزا یۆسف ٧- میرزا مەسیح. ئۆغرلوو محەممەد و زەینەڵبەگ بە زیندیسەری خۆی چوونەوە دنیای دیکە. سوڵتان خەلیل دوای مردنی باوکی جێیگرتەوە و بوو بە پادشا و مەقسوودبەگی برای کوشت کە مزگەوتی مەقسوودییەی تەورێزی ساز کردووە.

## ساڵی ٨٨٣ / ١٤٧٨ ـ ٧٩

وەرزی بەهاری ئەم ساڵە میرزا یاقووب دژی سوڵتان خەلیلی برای ڕاپەڕی. ڕۆژی چوارشەممۆ، ڕێکەوتی ١٤ی ڕەبیعی دووەم کاتی چێشتانێ، لەسەر چۆماوی خۆیە شەڕێکی قورسیان لە نێوانیدا قەوما. سوڵتان خەلیل کوژرا و میرزا یاقووب چووە تەورێز و ڕۆنیشتە سەر تەختی پادشایەتی. میرزا یۆسف و میرزا مەسیح سەریان وەبەر برا گەورەیان هێنا.

---

١- شه دینپرور عادل، دەبێتە ٨٨٢ .

## سالی ٨٨٤ / ١٤٧٩ ـ ٨٠

سولتان محەممەدخان لەشکرێکی وە پێش عەلائوددەولەبەگی زولقەدر کرد و بەرەو خێلی خۆی ناردی هەتا دەسەلاتی ناوچەکە لە بوداغبەگی برای بستێنێ و ببێتە حوکمڕان. هەر کە هێزی ژێر فەرمانی گەیشتێ، ولاتەکە دەستی دا و گیرا.

لە کۆتایی سالدا سولتان محەممەدخان گۆدووک (گۆدیک) ئەحمەدپاشای بە مەبەستی گرتنی دورگەی پوولییە بەڕێکرد و ئەویش گرتی.

## سالی ٨٨٥ / ١٤٨٠ ـ ٨١

لە سەرەتای ئەم سالەدا سولتان محەممەدخان، مەسیحپاشای بە مەبەستی ڕەتاندنی حاکم ڕوودس ڕاسپارد و هێزێکی گەورەی خستە بەرڕکێفی. مەسیحپاشا گەلێک شەڕی پیاوانەی کردن، بەلام ئامانجی نەپێکا و گەڕایەوە.

هەر لەم سالەدا قانسووی حوکمڕانی میسر(؟) باشبەگی میرقەلەمی خۆی لەگەل لەشکری عەرەبستان بە مەبەستی گرتنی دیاربەکر بەڕێی کردن. کاتێک میرزا یاقووب بە پەیدا بوونی سەرەتای ئەم هێرشەی زانی، دەیەویست خۆی بچێتە مەیدانی بەرەنگاری، کەچی سەرۆک و سەرداران نەیانهێشت. هەر بۆیە ئەویش بایوندوربەگ و سولەیمانبەگی کوڕی بێژەن و سۆفی خەلیلی مووسلاوی ناردن تاکوو بەرەگەیان لێبگرن. لە دوور و نیزیکی ڕۆحا (ڕۆها) قۆشەن لەبەریەک دامەزران و ئاگری شەڕ گرفەی هات. باشبەگ وێڕای سەرکردەکانی هاوڕێی گیرا و کوژرا. میرزا یاقووب بە دەسخۆشانەی ئەم سەرکەوتنە ئیسفەهانی باربووی بایوندوربەگ کرد.

## سالی ٨٦٦ / ١٤٨١ ـ ٨٢

سولتان محەممەد لە تەکوور چایری (تەکیر چایری) ئێسکوودار دنیای ڕووخەکی خۆنەگری بەجێهێشت و بە شەنگەشەنگ بەرەو باخی بەهەشت هەنگاوی نا و مالاوایی کرد. سولتان محەممەدخانی دووەم (کە ناسراوە بە فاتح) لە تەمەنی بیست و یەک سالیدا بۆتە پادشا و سی و یەک سالی فەرمانڕەوایەتی

کردووە.[1] پاش ئەو سوڵتان بایەزیدی کوڕی ڕەسەنزادەی لە شانشینی قوستەنتەنییە (ئیستانبووڵ) جێی گرتەوە.

ئەو شوێنەوار و کارە چاکانەی کە سوڵتان محەممەد لە پاشی بەجێماون بریتین لە: ١- کلیسای ئەیاسۆفییە کە وەستاکارانی ڕۆژگار و نژیاروانانی گەردوونی گەردان لەوەتی دنیا بە دنیایە و شەش قۆڵی دیاری کراوە، قەت بینای ئاوایان لەسەر ڕووی زەوی ڕۆنەناوە و وەک دەڵێن بۆ ماوەی ١٣٠٠ ساڵان جێگای بوتان و پەرستگای زاڵمان بووە و کردوویەتە مزگەوتی جومعە. ٢- مزگەوتێکی گەورەی لەسەر گردێک لە نێوەڕاستی شاری ئیستانبووڵ ساز کردووە و هەشت ساڵی پێچووە. ٣- دانانی خوێندنگەی سەمانییە، کە ئەوەندی دنیا وەبیری دێ شوێنی ئاوا بەرچاوی نەدیوە. ئەم جێگایە لەوەتی هەیە بۆتە مەکۆی زانایان و مامۆستایان و هەموو ساڵێک ١٥٠ قوتابی و فەقێ لێیان خوێندووە و کەسانی چازان و وریا و زیرەک لەوێ وەدەردەکەون. ئی وایان هەیە کە پێنسەد ئاقچەیان مواجبی ڕۆژانە بۆ براوەتەوە و بوونە قازی لە شاری مەکە و مەدینەی پیرۆز، میسر، بەغدا، ئەدرنە، حەلەب، دیاربەکر و تەورێز. دواتر شانیان چۆن هەڵیگرتووە هەتا پلەی موفتی زەمان و قازیعەسکەری پێهەڵاچوون. ٤- مزگەوت و حوجرەی باش و خانەقای بۆ نانەدانی کۆمەڵی گەورە و بچووکان لەسەر مەرقەدی تroووسکەداری ئەییووبی ئەنساری پایەبەرز ساز کردووە کە ئەسحابەی پێغەمبەری مەزن بووە. ئەبووئەییووبی ئەنساری (خالیدی کوڕی زەید) ساڵی ٥٣ی کۆچی بە سپای ئیسلامەوە چووە بۆ گرتنی قوستەنتەنییە و (لە جەنگەی گەمارۆدا) تەمەنی براوەتەوە و بە دزی ناشتوویانە. لە سەردەمی

---

١- سوڵتان محەممەد، نوێژی نیوەڕۆی چوارەمین پێنجشەممۆی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٨٨٦ کۆچیدوایی کردووە و ٥١ ساڵ ژیاوە و سی ساڵی حوکمات کردووە. (مێژووی عوسمانی، ب ٢، ل ١٤٩).

سوڵتان محەممەدخان‌دا شێخ ئاق‌شەمسەددین – گۆڕەکەی پڕبێ لە نوور – لە رووی هەڵێنانەوەی ڕازی نەبەدی و کەراماتەوە، نیشانییەکانی گڵکۆکەی دۆزیوەتەوە. ٥- هەروەها لەسەر مەزاری سەرتۆپی پیاوچاکان و پێشەوای لە خواترسان، واتە شێخ ئەبولوەفا مزگەوتێکی جوان و دڵگر و خانەقایەکی چاکی بۆ دەروێشان ساز کردووە. دیارە ئاسەواری خێر و خێراتی زۆر لەوەی زیاترن کە باسیان کرا.

زانایانی گەورە و شێخانی زەمانی سوڵتان محەممەدخان ئاوا بژێردراون: ١- مەولانا شەمسەددینی گۆرانی کە سەرەتا مامۆستای پادشا بووە و پاشان بۆتە موفتی و قازی‌لەشکری سەردەمی خۆی. ٢- مەولانا خدربەگ کە لە خوێندنگای سوڵتان لە بوورسا دەرسی کوتۆتەوە و یەکەم قازییە کە بۆ قوستەنتەنییە هەڵبژێردراوە. ٣- سەرگوڵی بلیمەتانی گەلان مەولانا عەلی قوشچی کە هێندە ناوبەدەرەوەیە پێویست بە لێدوان ناکا. بەڵام دەبێ بزانین کە مەولانا لە تورکانی ئەوبەرڕووبارە و وێدەچێ باوکی کوڕە بازەوان (قوشچی‌زادە) بووبێ یان ڕەنگە بە ڕەگەز بچێتەوە سەر خێڵی قوشچی کە یەکێکە لە گەورە عێلاتی تورک. هەرچۆنێک بێ مەولانا عەلی لە هەرەتی شلکی و تازەلاوی‌ڕا خەریکی خوێندن بووە و لە زانستی حیکمەت و ئەستێرەناسی‌دا بۆتە سەرکاروانی زانایانی دەورانی خۆی. میرزا ئوڵغبەگی کوورەگان زۆری خۆش ویستووە و بە کوڕی خۆم بانگی کردووە. وێڕای میرزا لە ناوچەی سەمەرقەند کەوتۆتە ئەستێرەگەری و نامیلکەی ئەستێرەناسی نووسیوە. دوای کوژرانی میرزا ئوڵغبەگ پەرەوازەی ئازەربایجان بووە. حەسەن‌بەگی بایوندوری وەکوو ڕاسپاردە ناردوویەتە لای سوڵتان محەممەدخانی حوکمڕانی ڕۆم. سوڵتان ئیزنی گەڕانەوەی نەداوە و سەرەتا بۆتە مامۆستا لە خوێندنگای سوڵتانی لە بوورسا. دوای تەواو بوونی لە فێرگەی سەمانییە براوەتە ئیستانبووڵ و ڕۆژانە ١٥٠ ئاقچەی عوسمانی بۆ براوەتەوە و گوندێکی چاکیشی دراوەتێ. ٤- مەولانا

خوسرەو کە زانای جیهان و پوختەی چەرخ و خولی ڕۆژگار بووە. بۆتە قازی ئیستانبووڵ و غەلتە و ئێسکوودار و لە ئەیاسۆفییەش وانەی گوتۆتەوە. ٥- مەولانا شەمسەددین ئەحمەد ناسراو بە مەولانا خەیاڵی کە مامۆستای یەکێک لە حوجرەکانی ئێزنیق بووە. لەسەر «شەرحە عەقاید» پەراوێزی نووسیوە و زۆر کتێبی چاکە. ٦- مەولانا موسلیحەددین قەستەلانی کە سەرەتا دادوەری کردنی سێ شارانی لە ئەستۆ بووە.ئەو ڕۆژەی کە قازیئەسکەریی هەرێمەکان بوونە دوو، ئەو کرایە قازیئەسکەری ئاناتۆلی. ٧- مەولانا موسلیحەددین بوورسوویی کە بە خواجەزادە ناوبانگی ڕۆیشتووە و لە تەمەنی سێزدە ساڵیدا بۆتە قازیقۆشەن. ٨- مەولانا حەسەنی سامسۆنی کە لە زانستی مەعقوول و مەنقوولدا کەس تای نەکردووە و سەرەنجام بۆتە مامۆستای پادشا و دواتر گەیوەتە پلەی قازیئەسکەری. ٩- مەولانا عەبدولکەریم کە زێرخڕیدی سوڵتان محەممەدخانی غازی بووە، بەڵام خوێندوویەتی و لە شانی زانایانی ڕۆژگاری خۆی تێپەڕاندووە. بۆتە قازیلەشکر و پاشان بۆتە موفتی سەردەم و لەم پلەدا کۆچیدوایی کردووە. ١٠- مەولانا محەممەد کە بە حاجی حەسەنزادە مەنشوورە و لە زانستی مەنقوولدا کەس تۆزی نەشکاندووە. ١١- مەولانا فەخرەددینزادە کە ناوچەی هیراتە زێدی و نووسینی گەلێک زۆرن و لە نێو زانایاندا بە موسەننیفەک ئاوازەی ڕۆیشتووە. کاتێک هاتۆتە وڵاتی ڕۆم، ڕۆژێ هەشتا ئاقچەی بۆ براوەتەوە. ١٢- مەولانا سیراجەددین کە بە چەلەبیزادە ناسراوە و بە منداڵی میر تەیموور لە حەلەبەوە بردوویەتە هەرێمی ئەوبەرڕووبار. خۆی گەڕاوەتەوە ڕۆم و لە ئەدرنە بۆتە مامۆستا. ١٣- مەولانا سنانپاشای کوڕی خدربەگ کوڕی جەلالەددین کە سەرەتا بۆتە فێرکاری سوڵتان محەممەدخان و ئاخرییەکەی بۆتە وەزیر. ١٤- مەولانا محیدین کە لە نێو زانایاندا بە ئەخەوەین ناسراوە و کۆبە و پەراوێزی لەسەر «تەجرید» نووسیوە و چاکی شیکردۆتەوە. ١٥- مەولانا عەبدوللەتیف کە بەڕاستی پیاوێکی

تێگەیشتووی فرەزان بووە و ماوەیەک لە سەمانییە دەرسی کوتۆتەوە. ١٦- مەولانا محێدینی ناسراو بە کەپرلووزادە کە بۆتە قازیلەشکر. ١٧- مەولانا ئەحمەدپاشای کوڕی وەلیەددین کە بە وەلیەددین ئۆغلی ناسراوە و فرە چازان و ورد و وریا و شەریعەتزان بووە. سەرەتا بۆتە قازی لە بوورسا و دوایە گەیوەتە پایەی قازیئەسکەری و سەرەنجام هەتا پلەی وەزیری تێهەڵچووە و لێخراوە و ناوچەی بوورسای وەک کەلەبەر بۆ داندراوە ١٨- شێخ ئەبووئیسحاقی ئاقشەمسەددینی قوونەوی ١٩- شێخ ئەبولوەفای قوونەوی ٢٠- شێخ حاجی خەلیفەی ئیستانبووڵی ٢١- شێخ قووجووی خەلیفە. ئەم چوار شێخەی ئاخری لە پێشەوایانی بەرزەناو بوون و چما بمهەوێ لەو دەستەیە بژمێرم زۆر درێژ دەبێتەوە، بۆیە لە کورتیم بڕییەوە. یاڕەببی خودا لێیانخۆش بێ و بە ڕەحمەتی یەزدانی شاد بن.

## ساڵی ٨٨٧ / ١٤٨٢ ـ ٨٣

لە سەرەتای ئەم ساڵدا (؟) شازادە سەلیمخانی بەختیار پێینایە هەرێمی ژیان.[1]

هەر لەم ساڵەدا سوڵتان «جەم»ی[2] برای سوڵتان بایەزیدخانی (دووەم) حەجی بەجێهێنا و لە زیارەتی مەکە و مەدینە گەڕایەوە؛ کە گەیشتەوە خۆی هاویشتە نێو خێڵی توورغوود و وەرساق و لەشکرێکی لێپێکهێنان و کەوتە شەڕی سوڵتان بازیدخان، بەڵام بەرگەی نەگرت و هەڵات و تازە لە ڕووی هەڵنەهات لە خاکی ڕۆم وەمێنێ و بە سواری کەشتی ڕۆیی بۆ فەڕەنگ.

---

١- بەو حیسابەی کە ٥١ ساڵ ژیاوە دیارە دوازدە ساڵ زووتر لە دایک بووە، واتە ساڵی ٨٧٥ / ١٤٧٠.

٢- جەم سوڵتان بە «جمجمەسوڵتان»یش ناوی هاتووە.

هەر لەم ساڵەدا برایمپاشای کوڕی خەلیلپاشای قازیلەشکری ڕۆملی، بوو بە وەزیر. مەولانا عەلائەددین فەناری بوو بە قازیلەشکری ڕۆملی و ئاناتۆلی و هەر لەم پلەیەدا دواهەناسەی ژیانی دا.

## ساڵی ٨٨٨ / ١٤٨٣ ـ ٨٤

سوڵتان یاقووبی کوڕی حەسەنبەگ لە شانشینی تەورێز گەڵاڵەی سازکرانی هەشت بە هەشتی داڕشت کە بەڕاستی بەهەشتی بەرین ئێرەیی پێدەبا و لە ماوەیەکی کورتا تەواوی کرد.

## ساڵی ٨٨٩ / ١٤٨٤ ـ ٨٥

لەم ساڵەدا سوڵتان بایەزیدخانی (دووەم) ئەحمەدپاشای کوڕی شەمسەددین محەممەدی فەناری بۆ پلەی بەرزی وەزارەت پێهەڵبرد و هەر دوای ماوەیەکی کورت لێیخست.

## ساڵی ٨٩٠ / ١٤٨٥ ـ ٨٦

قەڵاکانی وەرساق و ئەدەنە کەوتنە دەس هێزەکانی سوڵتان بایەزیدخان.

## ساڵی ٨٩١ / ١٤٨٦

لەم ساڵەدا مەولانا محێدین محەممەد کە قازیقۆشەنی ڕۆملی (ڕۆمئیلی) بوو لەسەر کار لادرا و مرد. مەولانا ولدان بە قازیقۆشەنی ڕۆملی داندرا.

## ساڵی ٨٩٢ / ١٤٨٦ ـ ٨٧

میرزا سوڵتان حوسێن زستانەهەواری بردە مەرو و دەسەڵاتی ئەستەرابادی بەخشی بە میر نیزامەددین عەلیشێری هێژا.

## ساڵی ٨٩٣ / ١٤٨٧ ـ ٨٨

لەم ساڵەدا سوڵتان حەیدەری (سەفەوی) کوڕی شێخ جونەید کە خوشکەزای حەسەنبەگی (ئاققۆیوونلوو) بوو، بە دەس لەشکری سولەیمانبەگی کوڕی بێژەن کە سوڵتان یاقووب ناردبوویە یاریدەی فەرروخیەساری حاکمی شیروان، کوژرا.

## ساڵی ٨٩٤ / ١٤٨٨ ـ ٨٩

ڕۆژی دوازدەی ڕەبیعی یەکەم میرزا سوڵتان حوسێن کچی میرزا ئۆڵغبەگی کوڕی میرزا سوڵتان ئەبووسەعیدی بۆ میرزا محەممەد مەعسوومی کوڕی خواست. بە بەزم و ڕەزم و کەژاوان لە خاکی کابولەوە گواستیانەوە بۆ هیراتی پایتەخت.

## ساڵی ٨٩٥ / ١٤٨٩ ـ ٩٠

لە زستانەهەواری قەرەباغ سوڵتان یاقووب و یۆسفبەگی برای و دایکی نەخۆش کەوتن. دایکی ڕۆژی ٢٨ی مانگی قوربان چۆوە بەر دەرگای ڕەحمەتی یەزدانی، سوڵتان یاقووب و براکەی هەر بە جێوبان کەوتبوون و مەرگی دایکیان لە لا نەدرکاندن.

## ساڵی ٨٩٦ / ١٤٩٠ ـ ٩١

شەوی جومعەی ١٠ی مانگی محەررەم، یۆسفبەگی برای سوڵتان یاقووب بە تاسکەتاسک بەرەو باخی بەهەشت ڕۆیی. نەخۆشییەکەی سوڵتان یاقووب لێی توند کرد و ئێوارەی ڕۆژی پێنجشەممۆی مانگی سەفەر کەوتە شوێن باوک و دایک و برای. بایسونقورمیرزای کوڕی سوڵتان یاقووب بە حەولودەولی سۆفی خەلیل و میران و بەگلەرانی مووسڵلوو بوو بە پادشا. سەرۆکانی ئاقۆیوونلوو تۆوی ناکۆکییان لە نێودا بلاو بۆوە. بۆ وێنە بایوندوربەگی یەکێک لە مەزنەسەردارانی هۆز، بەپێچەوانەی سۆفی خەلیل مەسیحبەگی کوڕی حەسەنبەگی لە ئێراق کردە فەرمانڕەوا. شەڕێکی قورسیان لە مابەینیدا قەوما و مەسیحبەگ کوژرا و ڕۆستەمبەگی کوڕی (؟)[1] حەسەنبەگ گیرا و لە قەڵای ئەلەنجەقدا بەند کرا. مەحموودبەگی کوڕی ئۆغرلوو محەممەد کوڕی

---

١- ڕۆستەمبەگی کوڕی مەقسوودبەگی ئاقۆیوونلوو دروستە.

حەسەنبەگ بەرەو هەمەدان دایقەڵشت و شاعەلی پورناک کردی بە حوکمڕان. سۆفی خەلیل لەشکری لێکرد و لە ناوچەی برووجێرد کوشتی.

لەم جەنگەدا سولەیمانبەگی کوڕی بێژەن لە دیاربەکر دژی سۆفی خەلیل ڕاپەڕی و لە ڕووکاری قەڵای «وان» هێزەکانیان تێکهەڵچوون و سۆفی خەلیل کوژرا و سولەیمانبەگ جێی گرتەوە و بوو بە هەمەکارەی بایسونقورمیرزا.

## ساڵی ٨٩٧ / ١٤٩١ ـ ٩٢

برایمبەگی کوڕی دانا خەلیلی قاجار کە بە ئیبەسوڵتان ناسراوە، بە هاوکاری قۆرۆق سەیدی عەلی حاکمی قەڵای ئەلەنجەق، ڕۆستەمبەگی کوڕی مەقسوودبەگیان لە زیندانی قەڵا هێنایەدەر و کەوتنە سەر سولەیمانبەگی بێژەن ئۆغلی. سەرۆک و سەرداران ڕوویان لێوەرگێڕا و دایانە پاڵ ڕۆستەمبەگ؛ بۆیە سولەیمانبەگ لە حەوت کێوان تەقی و چووە دیاربەکر و لەوێ نوورعەلیبەگی کاکی ئیبەسوڵتان گرتی و کوشتی. بایسونقوربەگ هەڵات و چووە لای فەرروخیەساری باپیری کە حاکمی شیروان بوو.

ئاخروئۆخری مانگی ڕەجەب ڕۆستەمبەگ لە تەورێز لە باڵگەی پادشایەتی پاڵی دایەوە و بەجارێک ئاژاوە داکووژان و تۆویان بڕا.

هەر لەم ساڵەدا سوڵتان بایەزیدخان لە هەرێمی ڕۆم قەڵای دەپەدلن و وڵاتی ئەرناوود (ئالبانی) گرت.

## ساڵی ٨٩٨ / ١٤٩٢ ـ ٩٣

کۆسە حاجی حاکمی ئیسفەهان لە ڕۆستەمبەگ ڕاستەوەبوو، ئەویش بە مەبەستی سەرکوت کردنی بەرەو عێراق بزووت. سەرکردەکانی بەر لە خۆی گەیشتنە سەری و لە نیزیکی قوم کوشتیان.

مەولانا شەهیدی لەم بارەوە گوتوویەتی:

ئەی میر بەرەو قوم دەچووی، سەرکەوتنت هاتەڕێ
سەری مام حاجیت بڕی، خێری کابەت هاتەجێ

هەر لەم ساڵەدا لە ناوچەی گەنجە و بەردەع، ڕۆستەمبەگ و بایسونقوربەگی کوڕی یاقووببەگ بە شەڕهاتن و بایسونقوربەگ کوژرا.

سالّی ٨٩٩ / ١٤٩٣ ـ ٩٤

میرزا سولّتان ئەحمەدی کوڕە گەورەی سولّتان ئەبووسەعیدی کوورەگان کە دوای هەراکەی باوکی لە سەمەرقەند ببوو بە شا و ماوەی ٢٧ ساڵ بە خۆشی و کامەرانی فەرمانڕەوایەتی کردبوو، بە مردنی خۆی مرد و سولّتان مەحموودی برا گچکەی جێیگرتەوە.

عومەرشێخی کوڕی سولّتان ئەبووسەعید کە لە دەورانی باوکی‌دا حوکمداری فەرغانە بوو و دوای وی لەوێ ئالای میرایەتی هەڵدابوو و هەمیشە لەگەڵ سولّتان ئەحمەد و سولّتان مەحموودی برای کەڵەوەکێشی دەکرد و نەدەحاواوە، شەوی چوارشەممۆی چواری مانگی ڕەمەزان لە سەربانی کۆترخانەی ئەخسی کە شاردێیەکی ئەندیجانە هەڵدێرا و مرد. زەهیرەددین میرزا بابوری کوڕە گەورەی جێی باوکی گرتەوە و لە ماوەیەکی کەمدا چەند قەڵاتێکی سەرسنووری تورکستانی گرتن.

سالّی ٩٠٠ / ١٤٩٤ ـ ٩٥

لە نێوەڕاستەکانی مانگی محەررەمدا، میرزا سولّتان مەحموودی کوڕی میرزا سولّتان ئەبووسەعید کە دوای کاکی ببوو بە فەرمانڕەوای سەمەرقەند ئەجەلی هات و مرد. میرزا بایسونقوری کوڕە گەورەی بوو بە جێنشینی و شیشی بە چاوی

سولتان عەلی برا چووکەیدا کێشا کە دڵی لێی دەترسا، بەڵام سۆمایی لە چاوان نەبڕا.

## ساڵی ٩٠١ / ١٤٩٥ ـ ٩٦

سەرەتای ئەم ساڵە میرزا سولتان عەلی لە سەمەرقەند ڕایکرد و چووە بوخارا و لەوێوە بە خۆی و لەشکرێکی قورس و گرانەوە گەڕایەوە و پەلاماری بایسونقورمیرزای برای دا و ئەویش باشاری نەکرد و ماوەیەک لە شارا خۆی شاردەوە و ئاخرییەکەی پەنامەکی بۆی دەربازبوو و ڕووی کردە حەساری شادمان. میرزا سولتان عەلی برای جێی گرتەوە.

## ساڵی ٩٠٢ / ١٤٩٦ ـ ٩٧

گۆدە ئەحمەدی کوڕی ئۆغرلوو محەممەدی کوڕی حەسەنبەگ کە زاوای سولتان بایەزیدخانی حوکمڕانی ڕۆم بوو، ڕایکرد و بە سواری لۆتکە ڕۆیی و بەرەو عەنەدۆڵ ئاژاوتی و پۆلە ئەسپێکی کە لە ئەرزەنجان بە مەبەستی چوونە تەورێز ئامادەیان کردبوون، وەژێر ڕکێفی خۆی و یارانی دا و سەربەرەوژێر و بەپرتاو تێپەڕی. بە یارمەتی حوسێنبەگی عەلیخانی خوشکەمێردی هەڵیکردە سەر ڕۆستەمبەگ و بەزاندی و تەشریفی لە تەورێز چووە سەر کورسی فەرمانڕەوایەتی و ڕۆستەمبەگ کوژرا.

## ساڵی ٩٠٣ / ١٤٩٧ ـ ٩٨

گۆدە ئەحمەد ویستی هەتا ڕێوشوێن و یاسا و ڕێسای خانەدانی عوسمان ڕەچاو بکا. میرانی تورکمان پێیڕازی نەبوون و هەڵبەزینەوە. حوسێنبەگی عەلیخانی و موزەففەربەگی پورناک دژی ڕاوەستان و هەردکی کوشتن. ئیبەسولتانی قاجار و قاسمبەگی پورناک لە ئێراق سێتەپڵەی دژایەتییان کوتا. گۆدە ئەحمەد ئاوازەی دوژمنایەتی ئەوانی بە گوێی گەورە و گچکە ڕاگەیاند و بۆ شکاندیان ڕاست بەرەو ئیسفەهان ڕۆیی. وەرزی زستان گەیشتە وێندەرێ و هێزەکانیان تێکگیران و گۆدە ئەحمەد کوژرا. لەبەروەی گۆدە ئەحمەد

باوەعەمرەیەکی خرپنە بوو، کەسانی قسەخۆش بە کەلەمی ڕۆمییان شوبهاندبوو. شاعیرێک لەم بابەتەوە گوتوویەتی:

کەلەمی ڕۆمی کە کردیانە شەهەنشاهی جیهان
مانگی بەفرانێ لەسەر شانی تلی دا بۆ نەمان

## سالّی ٩٠٤ / ١٤٩٨ ـ ٩٩

لەم سالەدا محەممەدیمیرزای کوڕی یۆسفبەگ کوڕی حەسەنبەگ لە ئەلوەندبەگی برای وەدەس هات کە دوای گۆدە ئەحمەد لە ئازەربایجان جلەوی فەرمانڕەوایەتی بە چنگەوە گرتبوو. لە «عەزیزکەند» شەڕ قەوما و ئیبەسوڵتان کە هەمەکارەی قەلەمڕەوی ئەلوەندبەگ بوو کوژرا و محەممەدیمیرزا سەرکەوت و تەشریفی لە تەورێز ڕکێفی بەتاڵ کرد و ئالای سەربەستی هەلدا.
لەم کاتەدا سوڵتان مرادی کوڕی یاقووببەگ کە بە فەرمانی ئیبەسوڵتان لە قەلای «ڕووییندژ»دا زیندانی کرابوو، براکانی ئیبەسوڵتان دەستیان گەیاندێ و قوتاریان کرد و بردیانە شیراز بۆ لای قاسمبەگی پورناک.

## سالّی ٩٠٥ / ١٤٩٩ ـ ١٥٠٠

محەممەدیمیرزا بە ئامانجی ڕەتاندنی سوڵتانمراد و قاسمی پورناک قۆشەنی بەرەو شیرازی ناوەندی دەسەلاتی هەرێمەکە گال دا و لە ناوچەی دەوروبەری ئیسفەهان شەڕ هەلگیرسا. محەممەدیمیرزا دوای سەرکەوتن و بەزاندنی خەنیمان لەبەر کەترەخەمی و خۆنەپارێزی شکا و کوژرا. بوو بە تێکەولێکە و هەرکەس هەرکەس جەغزی دەسەلاتی ئاقۆیوونلووی داگرت و بناغەی حوکماتی بەرەو ڕۆچوون و شەقارشەقار بوون بردن.
هەر لەم سالەدا سوڵتان بازیدخان، بالیبەگی ناردە تالان کردنی هەرێمی «لێهـ» و نەسووحبەگی بەڕێکردە داڕووتاندنی مەلبەندی ئورووس. بالیبەگ

لەبەر بەفری قورس و کرێوە و باکوت و سەرما چی بۆ نەکرا و یەکسم و چەکدارێکی زۆری تێداچوون و گەڕایەوە. نەسووحبەگ ماڵ و دەسکەوتێکی بێژماری هێنا و هاتەوە.

## ساڵی ٩٠٦ / ١٥٠٠ ـ ١

سوڵتان بایەزیدخان لە هەرێمی ڕۆم توانی دەست دابگرێ بە سەر قەڵای مۆتوون و قروونداا.

هەر لەم ساڵەدا شیبەکخانی کوڕی بوداقسوڵتان کوڕی ئەبولخێرخان کوڕی دەوڵەت ئۆغلن کوڕی ئیبنووئوغلن کوڕی پۆلا ئۆغلن کوڕی ئینەخواجە کوڕی تووقیا کوڕی بۆلغان (؟) کوڕی شیبان کوڕی جووجی، توانی بە فێڵ و تەڵەکە میرزا سوڵتان عەلی کوڕی میرزا سوڵتان مەحموودی کوڕی میرزا سوڵتان ئەبووسەعیدی کوورەگان وەچنگ بێنێ و بیکوژێ و لە سەمەرقەند دانیشێتە سەر تەختی دەسەڵاتی کوورەگانی. تەواوی ئەو هەرێم و مەڵبەندانەی ئەوبەڕووبار کە بۆ ماوەی ١٣٠ ساڵ میرانی جوغتای حوکماتیان بە سەردا دەکردن لە ژێر چنگی دەرکێشان و سکەی بە ناوی لێدرا و خوتبەی بە ناوی خوێندرایەوە.

## ساڵی ٩٠٧ / ١٥٠١ ـ ٢

شاسمایلی سەفەوی لە ئێران سەری هەڵدا. شاسمایل کوڕی سوڵتان (شێخ) حەیدەر کوڕی شێخ جونەید کوڕی شێخ برایم کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ سەدرەددین مووسا کوڕی شێخ سەفییەددین ئیسحاقی «ئەردەوێلی»یە. شێخ سەفییەددین بە هەژدە پشتان دەچێتەوە سەر ئیمام مووسای کازم،[1] خودای

---

١- ئەم ڕەگەزنامەیەی کە شەرەفخان دیتوویەتی دەستی تێوەدراوە و هەر لە بنەڕەتەوە هەڵبەستراوە. بۆ زانیاری ڕاست و ڕوون بڕواننە: ئێرانی سەردەمی←

لێ ڕازی بێ. یەکەم کەسێکی کە لەم بنەماڵە مەزنەوەجاخە هاتۆتـە ئـەردەوێڵ سەید فیرووزشای «زێڕینکلاو»ە. ئەویش لەبەر پیاوچاکی و دینداری خەڵکی ئەو مەڵبەندە بوونە مریدی و بڕوایان پێهێناوە. لـە سـەردەمـی خـونکـارانـی چەنگیزیدا، میرانی مەغوول بەتایبەت مـیر چووپـان بـوو بـە مریـدی شـێخ سەفییەددین، ڕەحمەتی خودای لێبێ. هەر بۆیە مـەزن و مـاقووڵانی مـەغوول سەرجەم سەریان وەبەر هێناوە و بوونە دەروێشی شێخ و لە هـەموو ناوچـە و مەڵبەندێک نەخاسمە لە ئێران جەماوەرێکی یەکجار زۆر کەوتوونە شوێنی. لەم بارەوە دەگێڕنەوە، ڕۆژێکی میر چووپان کـە خـەریـکی دواندنی شێخ دەبـێ لێی دەپرسێ ئەرێ تۆبڵێی لەشکری شا زیاتر بێ یا مریدەکانی ئێوە؟ لە وەڵامدا فەرموویەتی کە لە ئێراندا مریدانی ئێمە دووهێندەی قۆشەنی پادشایە.»

دواتر ئووزوونحەسەبەگی بایوندوری تەواو بڕوا بە شێخ جونەید دێنـێ و خەجیج خاتوونی خوشکی خۆی دەداتێ و سولـتان حەیـدەر لـە داوێنـی ئـەم خاتوونە بەربۆتەوە. کاتێک سولتان یاقووبی (ئاققۆیوونلوو) دەچێتـە سـەر تەختی فەرمانڕەوایەتی، کیژی فەرروخیەساری حـاکمی شـیروان دەخـوازێ و لەبەر دڵی ئەو خاتوونە بەر بە سولتان حەیدەری کوڕە پووری دەگرێ کە هەموو ساڵێک دەچووە خەزای چرکەسان و بە ڕێگای شـیرواندا تێدەپـەڕی. سولـتان حەیدەر جوابی ناداتەوە و دەڕوا و لەگەڵ فەرروخیەسار دەیکاتە شەڕ و کێشە و نێواناخۆشی. سولتان یاقووب، سولەیمانبەگی بێژەن ئۆغلی و ئیبەسولتانی قاجار بە مەبەستی بەرپەرچدانـەوەی سولـتان حەیـدەر دەنێرێتـە یاریـدەی خـەزووری. لەشـکری تورکمانـان لەگـەڵ هێزەکـانی شـیروان لـە ناوچـەی تەبەرسەران ڕێ لە سۆفییەکان دەگـرن و وەک باسـی کـرا سولـتان حەیـدەر

---

→سەفەوی، ڕاجر سێیڤری، وەرگێڕانی سەلاحەددین ئاشتی، سولەیمانی، چاپخانـەی شڤان، ساڵی ٢٠٠٦، لە چاپکراوەکانی بنکەی ژین.

دەکوژرێ. (شێخ)حەیدەر، سێ کوڕی سەروپێچکەی لە پاش بەجێ دەمێنێ: سوڵتان عەلی، سەید برایم و شاسمایل کە هەرسێکیان خوشکەزای سوڵتان یاقووب بوون. سەرەتا سوڵتان یاقووب دەیاننێرێتە قەڵای ئەختەمار و لەوێ بەندیان دەکا و پاشان بەڕیاندەکاتە قەڵای ئیستەخری شیراز و لە زیندانیان دەپەستێوێ. دوای چوار ساڵ و نیو مانەوەیان لەو شوێنە، سوڵتان یاقووب دەمرێ و جڵەوی فەرمانڕەوایەتی تورکمانان دەکەوێتە دەستی لێوەشاوەی ڕۆستەمبەگی کوڕی مەقسوودبەگ. ئەویش بە تکای پووری لە قەڵای ئیستەخر ئازادیان دەکا و دەیانباتە تەورێز. ڕاست لەو سەروبەندەدا ڕۆستەمبەگ و بایسونقوربەگ نێوانیان دەشێوێ. سوڵتان عەلی لەو شەڕ و هەڵلایەدا زۆر ئازایەتی دەنوێنێ و ڕۆستەمبەگ زراوی دەچێ و لەبەر مەردایەتی ئەو پاڵەوانە سەری لێتێکدەچێ و بە زرمەزلیتان و دڵەڕاوکە خۆی کۆ دەکاتەوە و بەرەنگاری دەبێتەوە. ئیبەسوڵتانی قاجار و حوسێنبەگی عەلیخانی بە مەبەستی گرتنی سوڵتان عەلی و براکانی دەنێرێتە ئەردەوێڵ. سوڵتان عەلی لێیان ڕادەسێ و وەدەستدێ و پشتیان لێناکاتەوە و شەهید دەبێ.

شاسمایل و براکەی دیکەی هەڵدێن و پەنا دەبەنە لای کارکیا (حوکمڕان) میرزاعەلی حاکمی گیلانی بیەپیش. ڕۆستەمبەگ چەند جارێک داوایان دەکاتەوە، بەڵام میرزاعەلی هەر جارەی بە بیانوویەک خۆی دەپارێزێ. هەتا وای لێدێ کە شاسمایل لە تەمەنی سێزدە ساڵیدا بە ئامانجی فەرمانڕەوایەتی لە گیلانەوە سەر هەڵدەدا و خێڵبەزی دەباتە ئەرجەوان. سەرەبەهارێ دەچێتە لای مەنکۆل (مەنکگۆل) بۆ نێو هۆزی ئۆستاجلوو و حەوتهەزار سوارێک لە خۆی کۆدەکاتەوە و لە ڕووباری کوڕ دەپەڕێتەوە. فەرروخیەسار بە بیستهەزار سوارە و شەشهەزار پیادەوە بەرەگەی لێدەگرێ و شەڕی قورسیان لە مابەینیدا دەقەومێ. فەرروخیەسار و چەند گەورەپیاوێکی شیروان لەو هەڵلایەدا دەکوژرێن و شیروانشای کوڕی بە سواری کەشتی بەرەو گیلان دەڕوا.

شاسمایل وەرزی زستــان چــەنـد ناوچەکی هــەرێمی شــیروان دەگــرێ و زستانەهــەواری دەبــاتــە مەحمووداوا. لــەوێـوە بــە مەبەستی چوونە شەڕی ئەلوەندبەگی کوڕی یۆسفبەگ کوڕی حەسەنبەگ بەرەو نەخجەوان دەجمێ و لە «شەروور» هێزەکانیان تێکهەڵدەچن. ئەلوەندبەگ و مەزنەمــەردانی تورکمــان بــەتــایبــەت قەرەجوغای محەممەد، لەتیفبەگ، سەید عازیبــەگ و کــوڕانی پیلەتەنبەگ وێڕای هەشتاهەزار کەسی دیکە دەکوژرێن. شاسمایل لەوێوە لوور دەبێتە شانشینی تەورێــز و سکــە و میحرابی مزگەوتــان بــە نــاوی نــاوداری دەڕازێتەوە. حەسەنبەگی شاملوو دەکــاتــە ســەرۆکــی ســەرکــردان و قــازی شەمسەددینی گیلانی کە مامۆستای بوو، دایدەنێ بە مەزنەمامۆستای وڵات و میر زەکەریای ڕازی دەخاتە سەر سکەی وەزارەت.

## ساڵی ٩٠٨ / ١٥٠٢ ـ ٣

لەم ساڵەدا شەش کەس لە باڵوێزانی پادشاهان و خونکارانی گــەورە لــە ڕۆژێکا دەگەنە بارەگای سوڵتان بایەزیدخان. نێردراوەکــان لــە لایــەن «ڕای» هیند، «عەزیز»ی میسر، «حاکم»ی ئەنکرووس، «قەڕاڵ»ی لێهـ، «حوکمڕان»ی ئەفلاق و «پادشا»ی عەجەمەوە گەیشتبوونێ.

هەر لەم ساڵەدا شاسمایل لــە تــەورێزەوە بــە مەبەســتی گرتنــی عێــراق دەردەکەوێ و سوڵتان مرادی کوڕی سوڵتان یاقووب بــە خــۆی و حەفتاهــەزار سواری دڕی دەسکەرەوە لە قشلاخی «ویلەکان»ەوە ڕوو دەکاتە هەمەدان کە بەری پێبگرێ. لە ئێلاخی ئۆلمەقوڵاخی هەردک سپا دادگژێنــە یــەکتر. دوای شــەڕ و کوشتارێکی زۆر، قۆشەنی سوڵتان مراد پەرمپەرم دەبێ و گوێزەل ئەحمــەدی بایوندوری کە میریمیران دەبێ، لەگەڵ دەهەزار تورکمان دەکوژرێ.

سوڵتان مراد هەوسارپساو و ئاوزەنگی شکاو ڕوو دەکاتە شیراز . شاسمایل بە نامراد ناوی دەزڕێنێ و هەتا سەرهەدی فارس دەکەوێتە پەیکەردەی و وچانێ نادا.

## ساڵی ٩٠٩ / ١٥٠٣ ـ ٤

شاسمایل پێ دەنێتە هەرێمی فارس و تەشریفی لە خانەمیری شیراز دادەبەزێ. تەواوی مەلاکانی کازێروون لەبەرەوەی سوننی بوون دەیانکوژێ و ماڵیان تاڵان دەکا. حکوومەتی شیراز دەداتە دەس ئەلیاسبەگی زولقەدر و بۆی دەکاتە پاوانەمیر و ماوەی پەنجا ساڵ لە ژێر فەرمانی خۆی و پاشەوارەکانیدا دەبێ.

پاشان دەس دادەگرێ بە سەر قەڵاکانی گوڵخەندان، فیرووزکۆ و ئوستا. حوسێن کیای جەلاوی کە پێشتر ئەلیاسبەگی ئیقووت ئۆغلی ئۆستاجلووی حاکمی ڕەی کوشتبوو، گرتی و لە قەفەزی ئاسنینی پەستاوت و زۆری ئێشاند و جەڕەبابەی دا؛ ئەویش لە تاوان خۆی کوشت.

مرادبەگی جیهان شاملوو کە ئاواڵی حوسێن کیا بوو، سۆفی سەفەوی بۆ چاوترساندن و تەمێ گرتوویی خەڵک برژاندیان و کردیانە کەباب و خواردیان. لەم کاتەدا حەمەحوسێنمیرزای کوڕی سوڵتان حوسێنمیرزای حوکمداری خوراسان بە دڵئێشاوی لە باوکی دەچێتە لای شاسمایل و ئەویش زۆری دەستی ڕێز لێدەنێ و دەیلاوێنێتەوە. سوڵتان حوسێنی برای کارکیا میرزا عەلی حاکمی گیلانیش لەو وەختەدا دەگاتە خزمەت پادشا و بە کامڕەوایی دەگەڕێتەوە.

## ساڵی ٩١٠ / ١٥٠٤ ـ ٥

شاسمایل دوای ئەوەی کە سوڵتان مرادی کوڕی سوڵتان یاقووب بە ناکامی دڵی لە هەرێمی فارس هەڵکەند و چووە بەغدا، هەواری بردە کوێستانی سوورلق و تەختی سولەیمان و خێڵبەزی داوەری بۆ ئیسفەهان.

هەر لەم ساڵەدا ئەبەرقوو و یەزد و کرمان گیران. شاسمایل دەسەڵاتی یەزد و ئەبەرقووی باربووی حوسێنبەگی لالە شاملوو کرد و کرمانی بەخشی بە محەممەدخانی ئۆستاجلوو. خێڵی قزڵباش بەپێچەوانەی مەیلی سوڵتان حوسێن مەڵبەندی «تەبەس»یان داڕووتاند و کوشتاریان لێکرد و گەڕانەوە.

## سالی ٩١١ / ١٥٠٥ ـ ٦

لەم سالەدا شاسمایل خێلبەزی بردە تارومی قەزوێن و ویستی هەلکاتە سەر گیلانی بیەپەس کە بە دەس ئەمیر حیسامەددینەوە بوو. بەلام بە تکای شێخ «نەجم»ی گەیلانی زێڕینگەر لەو تەمایەی پەشیمان بۆوە. لەم شوێنە جولبانبەگی خەلخالی گیرا و چزێندرا.

لە ئاخری سالدا میرزا سولتان حوسێن دنیای نەمانی بەرەو سەرسەرای ژیان بەجێهێشت. ئەو پادشایەکی بەختەوەری تێر تەمەنی بە دەسەلات بوو. گەلێکی چاو بە سەر زانایان و مامۆستایانەوە بوو و چی لە دەستی هاتبا خۆی لێنەدەبوارد. فەقێ و مەلا لە سەردەمی ئەوا زۆر تێر و تەسەل بوون و حوجرەی لەسەر شەقامی شاری هیرات بۆ ساز کردوون و بالەخانەیەکی وای هەلخستووە کە نەک هەر ئێران و تووران بەلکوو زۆربەی دنیا شتی وای بە خۆیەوە نەدیوە.

لە سەردەمی ئەودا دوازدەهەزار سوختە و فەقێ و مەلا و شاعیر و نووسەر و سەنعەتکار لە شاری هیرات ژیاون. تەواوی میران و وەزیران و خودی پادشاش ئەرکیان لە ئەستۆ بووە. خوراسان لە ڕۆژگاری وی‌دا ئەوەندەی گەشە کردووە کە هیچ دەورەیەک ئاوا بە ئاوەدانی نەدیتراوە.

لە باژێری هیرات باغ و باغاتی لێداوە و کۆشک و بالەخانەی چاکی ساز کردووە، بەتایبەت باغی مراد کە کەوتۆتە نێوان شار و «گازەرگا». لەوێ گەلێک کاروانسەرا و قەسرۆکەی زێڕئاژنی داناون. زانایانی بەرزەجێ و هۆنەرانی سەرناس لە تاریفاتی خانووبەرە و کۆشکەلانی‌دا گەلێک قەسیدەی بەپێز و هۆنراوەی جوانیان هۆنیوەتەوە. لەبەروەی زۆری کەیف بە سازکردنی مال و بالەخانان بزووتووە، میران و وەزیران و پیاوماقوولانی ئەو سەردەمی، کەوتوونە دانانی بناغەی بینای هەرەباش و سەرسەرای دلگر کە وەک بەهەشت ڕازاونەوە. بەتایبەت سەروەستا و نژیاروانی دادەوانی گەورە نیزامەددین

عەلیشێر لەو شارەدا گەلێک قوتابخانە و مزگەوت و تەکیە و نەخۆشخانە و باغ و خانووبەرەی ساز کردووە.

سوڵتان حوسێن لە بەرەبەری تافی لاوی‌دا جارجارە دەچووە خزمەت میرزا سوڵتان ئەبووسەعید لە ئەوبەرڕووبار و دەمدەمەش لە ڕکێفی میرزا ئەبولقاسم بابوردا لە خوراسان دەهات و دەچوو. کاتێک میرزا ئەبولقاسم بابور مرد، میرزا شامەحموودی کوڕی و میرزا برایمی کوڕی میرزا عەلائودەولە بوو بە دەمەقاڵەیان و پێکهەڵپڕژان. جیهانشامیرزای کوڕی قەرەیۆسف لە عێراقەوە بە مەبەستی گرتنی ئەستەراباد داوەری و سوڵتان ئەبووسەعیدمیرزاش لە هەرێمی ئەوبەرڕووبارەوە بۆ داگیر کردنی خوراسان بزووت. جیهانشامیرزا ئەستەرابادی لە میرزا برایم ئەستاند و پاراستنی وێندەرێی خستە سەر شانی حوسێنی سەعدلوو. لەو جەنگەدا میرزا سوڵتان حوسێن هەڵمەتی بردە سەر حوسێنی سەعدلوو و شکاندی و ئەستەرابادی گرت. کاتێک سوڵتان ئەبووسەعیدمیرزا هەرێمی خوراسانی خستە ژێر چۆکی، ئەستەرابادیشی دابڕی و سوڵتان حوسێنی پەڕەوازە کرد. میرزا سوڵتان حوسێن بۆ ماوەی دە ساڵێک لە بیابانەکانی خارەزمدا بە ئومێد و چاوەڕوانییەوە ژیا و دژایەتی سوڵتان ئەبووسەعیدی کرد. کاتێک هەواڵی کوژرانی سوڵتان ئەبووسەعیدی لە ئەبیوەرد پێگەیی، چەند سەرۆک و سەرکردەیەکی ناردە ئاگاداری و پاراستنی مەشەدی پیرۆز و نەیشابوور و خۆی بەرەو مەرو ڕۆیی و لەوێوە چووە هیرات و بوو بە فەرمانڕەوا. وەک پێشتر قەڵەمی نەخشینی خۆشڕاوێژ لە نێوبەندی ڕووداوەکانی ساڵی ٨٧٥دا باسی کرد، یادگار محەممەدمیرزا بە پاڵپشت و کۆمەگی ئووزوونحەسەن لەسەر فەرمانڕەوایەتی خوراسان مەڕشەی پێ‌فرۆشت و ماوەیەک لە مەیمەنە و فاریاب و سەحراکانی بادغەیس و لێوارەکانی مورغابدا ڕۆژگاری تێپەڕ کرد. هەتا شەوێک هەلی بۆ ڕەخسا و لە «بابائیلاهی»ڕا بە سەرڕەو کوتای و بەری‌بەیانی گەیشتە باغی

زاغانی هیرات و یادگار محەممەدمیرزای لەوێ کوشت. پاشان بوو بە پادشای سەربەخۆی خوراسان و سی و هەشت ساڵ و چوارمانگ سەربەستانە فەرمانڕەوایەتی کرد. بەڵام لە ئاخری ڕۆژگاری پادشایەتی ئەودا شیبەکخانی ئۆزبەک چاوی بڕیە خوراسان و خۆی لێخۆش کرد و بەرەو هیرات بزووت. میرزا سوڵتان حوسێن بە ئامانجی هەسدانەوەی لە هیرات دەرکەوت و پاش بڕینی چەند قۆناخێک، فریشتەی پێمردنێ بە تەقڵەکوت کەوتە شوێنی و لە ناوچەی بابائیلاهی سەر بە بادغەیس، کاتی بوولێڵەی ئێوارەی ڕۆژی دووشەممۆی یازدەی مانگی قوربان، چووە بەر دلۆڤانی خودا. دوای چوار ڕۆژ تەرمەکەیان بردەوە هیرات و لە ژێر ئەو گومبەزەی کە بۆ ناشتنی خۆی سازی کردبوو، ناشتیان. حەفتا ساڵ ژیا و لە ئاخری ئەمەنیدا شەپلە وای لێدابوو کە نەیدەتوانی پێ بنێتە ڕکێف و بە کەژاوە دەیانگواستەوە. چووبۆوە سەر تەبیاتی تافی منداڵی و هەمیشە خەریکی کایە و گەمە بوو لەگەڵ قۆچ و کۆتر و کەڵەشێر. بەڵام دیسانیش هەرگیز خافڵ نەبوو لە چاوەدێری کردنی زانایان و خوێندەوارانی زیرەک و ورد و وشیار. لە سایەی ئەوڕا پیاوانی چازان و وەستاکاران گەیبوونە پلەی پوختەیی و پەڕپەڕۆچکەی سەربەخۆیی و هەرکام لە کاری خۆیاندا ببوونە سەرگوڵ و سەرتۆپی ڕۆژگار. بۆ وێنە بەڕێزان مەولانا نوورەددین ئاڕەحمانی جامی و ئەمیر عەلیشێری نەوایی دەسپەروەردەی ئەو پادشا خاوەنشکۆیەن.

دوو شاهید هەن کە لێرەدا وەبالم بۆ بکێشن

بەڵام لە ئاخریدا کوڕەکانی بەو جۆرەی کە شایانە بە قسەیان نەدەکرد و بە لاساری دەجووڵانەوە و هەر بۆیە دەسەڵاتی ئەو خانەدانە تەشک و داوێنی هەڵوێزنی. کوڕەکانی ئەوەندەی خەڵک دەیانزانێ چاردە کەسن و بریتین لە:
١-بەدیعوززەمانمیرزا ٢-موزەففەر حوسێنمیرزا ٣- کۆپەکمیرزا

٤- ئەبولموحسين‌ميرزا ٥- فەرەيدوون‌حوسێن ميرزا ٦- محەممەد مەعسووم ٧- فەرروخ حوسێن ٨-حەمەحسێن ٩- برايم حسێن ١٠- شاغەريب‌ميرزا ١١- محەممەد قاسم ١٢- ئەبووتوراب ١٣- ئيبنووحوسێن ١٤- حەيدەر محەممەد. ئەم گەلەكوڕە حەوتيان لە سەردەمی ژيانی باوكيان‌دا مردوون و حەوتيان ماون.

## سالّی ٩١٢ / ١٥٠٦ _ ٧

لە سەرەتای ئەم سالەدا ميرزا بابوری كوڕی عومەرشێخ كوڕی سولتان ئەبووسەعيدی كوورەگان، وەختايەک لەسەر كەوشەنی غەزنەين و كابول هەوالّی مردنی ميرزا سولتان حوسێنی بيست و لێی روون بۆوە كە شيبەک‌خان چاوی تەمای بڕيوەتە گرتنی هەرێمی خوراسان و لە مەلبەندی ئەوبەرڕووبار دلنيايە، گوتی ئەگەر بێتوو هەر ئێستا توخم و تۆرەمەی مير تەيمووری كوورەگان يەكتر نەگرن و نەكەونە بەرەنگاربوونەوەی سپای ئۆزبەک و خوراسان وەک بيلبيلەی چاويان نەپارێزن، بێ‌گومان هێندەی پێناچێ كە شيبەک‌خان خوراسان داگير دەكا و خاشەی خانەدانی مير تەيمووری كوورەگان دەكێشێ. دوای بيركردنەوەيەكی زۆر هاتە سەر ئەو بڕوايە كە خێرا بەرەو هيراتی پاتەخت بزوێ و لەگەلّ كوڕانی ميرزا سولتان حوسێن بدوێ و سەبارەت بە بەربەرەكانی ڕێچارەيەک بدۆزنەوە. بۆ بەڕێوەچوونی ئەم سەفەرە پێی‌نايە ڕكێفی كەحێلی خۆشبەزی فريارەسی يەزدانی و لە كابولەوە بەرەو خوراسان بزووت. وەختايەک بەديعوززەمان‌ميرزا و موزەففەر حوسێن‌ميرزا ئەم هەوالە ئۆخژنبەخشەيان بيست، بووژانەوە و چوونە پێشواز و بەخێرهێنانی و ڕێوڕەسمێكی شكۆمەنديان بۆ بەجێهێنا. ميرزا بابوريان بردە مالّی ئەمير عەلی‌شێر و لەوێی ڕكێف بەتالّ كرد و هەركام لە براكان بە جوێ كەوتنە ميوانداری كردن و ڕازاندنەوەی خوانی ميرانە. لەم وەختەدا تەتەر لە بالّی بەلخەوە هاتن و ڕايانگەياند كە شيبەک‌خان لەشكرێكی زۆر و زەوەندی بە قەدرايە دەنک و دلۆپی باران كۆكردۆتەوە و لە ڕووكاری بەلخ هۆردووبەزی

کردووە و شارەکەی گەمارۆ داوە. بەدیعوززەمانمیرزا و موزەففەر حوسێنمیرزا دوای بیستنی ئەم هەواڵە لەگەڵ بابورمیرزا و سەرۆک و سەرکردە ئازا و بوێرەکان کەوتنە باس و ڕاوێژ و لەسەر بەربەرەکانی و لێدانی شیبەکخان ساخ بوونەوە. پاشان گەلێک پیاو و ڕاسپاردەیان ناردنە ناوچە و مەڵبەندەکانی خوراسان و داوایان کرد کە تێکڕای شازادان کۆوە بن.

هەرسێک برا، میرزا بەدیعوززەمان و موزەففەر حوسێنمیرزا و محەممەد قاسم وێڕای بابورمیرزا لە هیراتی پایتەختەوە دەرچوون و کاتێک گەیشتنە «چل دوختەران»ی بادغەیس، ئەبولموحسینمیرزا لە مەروەوە هات و پاڵی وێدان. لە قەراخ مورغاب ئیبنووحوسێنمیرزا لە قایینەوە شان بە شانی سەرۆکان و گەردنکەشانی خوراسان گەیشتە هۆردووگای برایان. کۆپەکمیرزا لەبەر خەیاڵی خاوی لە بنکەی شان و شەوکەتی کە مەشهەدی پیرۆز بێ وەدەرنەکەوت و هیچکەسیشی نەنارده هاواری براکانی. هەر بۆیە کوچکی ناکۆکی و چەندبەرەکی شووشەی یەکانگیری برایانی شکاند و سستی و کەمتەرخەمی باڵی ئەنگاوت. بابورمیرزا وەختایەک ئەم بارودۆخەی چاو پێکەوت، ملی ڕێگای کابولی گرت و هەرکام لە میرزاکان گەڕانەوە ناوەندی دەسەڵاتی خۆیان.

هەر لەم ساڵەدا شاسمایل چووە هەوارگەی «قید»ی سوڵتانییە و پایزەهەوار و خێڵبەزی بردە خۆی ئازەربایجان. پاشان لەشکری ناردە سەر سارمی کوردی موکری کە بیتەزێنێ. عەبدیبەگی شاملوو و ساروو‌عەلی مۆرداری کردنە سەرکردەی سپا و هەڵمەتیان برد و هەرتکیان بە دەست کوردان کوژران. هەزارەزیلەی کلاوسووران بە خەسارباری و ڕاکەڕاکە گەڕایەوە.

## ساڵی ٩١٣ / ١٥٠٧ ـ ٨

سەرەتای مانگی محەڕرەمی ئەم ساڵە شیبەکخان لەشکری بردە سەر خوراسان. بەدیعوززەمانمیرزا و موزەففەر حوسێنمیرزا بە هەموو هێز و توانای

خۆیانەوە چوونە بەرەنگاربوونەوەی و لە «مەراڵ»ی ناوچەی بادغەیس تووشیان بە تووشی یەکتر بۆوە. ئەمیر زوننوون کە میری‌میران و هەمەکارەی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی بەدیعوززەمان بوو کوژرا. هەردوو برا بە ئابڕووتکاوی و شانشکاوی ڕایانکرد و تازە هەرگیز چاویان بە تەختی دەسەڵات نەکەوتەوە و موزەففەر حوسێن کەوتە ئەستەراباد و هەر لەم ساڵەدا مرد. بەدیعوززەمان بە ئومێدی پێزانین و ئەمەگداری شوجاع‌بەگی کوڕی ئەمیر زوننوون کە حاکمی قەندەهار بوو، چوو بۆ ئەو مەڵبەندە و وەختایەک شوێنەواری بێوەفایی و سەرساردی بە ئاکارییەوە بینی، گەڕاوە ئەستەراباد. شیبەک‌خان چووە هیرات و لەسەر تەختی میری پاڵی داوە و خێرایەکی تەیموورسوڵتان و عوبەیدیللاسوڵتانی کوڕی مەحموودسوڵتانی گاڵ دان بۆ هەڵبڕین و ڕەتاندنی کۆپەک‌میرزا و ئەبولموحسین‌میرزا. قۆشەنی سەرداران لە «سەنگ‌بەست»ی دوو فرسەقی مەشەد لەگەڵ کۆپەک‌میرزا و ئەبولموحسین‌میرزا تێکهەڵچوون و هەردک شازادە لەو هەڵلایەدا بەرگی مەزنایەتی شەهیدبوونیان بە باڵای بڕا. تەواوی وڵاتی خوراسان کەوتە چنگ شیبەک‌خان و جوغتای با بە دەست کەوتەوە.

هەر لەم ساڵەدا شاسمایل بە مەبەستی گرتنی هەرێمی مەرعەش و دەرپەڕاندنی خێڵی زولقەدر کەوتەخۆ. لە دەوروبەری قەیسەرییە عێلی زولقەدر هەڵدەکەنە سەریان و زەبرێکیان لێدەوەشێنن. پاشان دەکشێنەوە کێوەکان و نایەنەوەبەریان. شاسمایل هەتا تووران‌تاغی دەڕوا و لەوێوە دەگەڕێتەوە و قەڵای خارپووتی ژێر دەسەڵاتی زولقەدران دەگرێ. لەم جەنگەدا ئەمیرخانی مووسڵلووی حوکمڕانی دیاربەکر بە خۆی و هۆز و خزمانییەوە سەر وەبەر فەرمان و چەڵەمەی شاهی دێنێ و دیاربەکر دەداتە دەست زلەپیاوانی میری. ئەمیرخان بە سۆزی شاهانە و لاواندنەوەی میرانە دەسخۆشانەی لێدەکرێ و هەرێمی دەسەڵاتیشی دەبێتە باربووی خان محەممەدی کوڕی میرزابەگی

ئۆستاجلوو و شاسمایل لەوێوە ئەسپی تیژبەزی بەرەو زستانەهەواری خۆی دەهەژێنێ.

عەلائوددەولە کە شاسمایل ئاوا دەبێ، ساروووقەپلانی کوڕی خۆی دەکاتە سەرهێز و دەینێرێتە شەڕی خان محەممەدی ئۆستاجلوو کە لە ناوچەی ئەرزەن خێڵی خستبوو. گڕی ئاگری شەڕ لە بەینیاندا دەتەنێتەوە و قاسمبەگ کە لەبەر ئەوپەڕی چاونەترسی و ئازایەتی و پاڵەوانەتی بە ساروووقەپلان ناسرابوو، لەو شەڕەدا وێڕای پۆلێک لە پیاوماقووڵانی زولقەدر دەکوژرێ. خان محەممەد سەری براویان دەنێرێتە شارۆکەی خۆی بۆ لای شاسمایل.

هەر لە ئاخری ئەم ساڵەدا عەلائوددەولەبەگ لەبەر بزووتنی غیرەتی جارێکی تر کۆر شاروخ و ئەحمەدبەگی کوڕانی بە چاردەهەزار سواری چەنگ بە خوێنی نێزەوەشێنەوە دەنێرێتە زگ خان محەممەد بۆ دیاربەکر. خان محەممەد هۆردووگای خۆی بۆ خەنیم خۆڕایی دەکا و بەرەو باڵێک تێدەکشێ. خێڵی زولقەدر بێ ترس و سام دەچنە نێو هۆردووبەز و دەس دەکەن بە ڕەشەدزی و تالانوبڕۆ. لەم کاتەدا خان محەممەد چەشنی شێری ژیان و بەوری بەیان لە بۆسە دەردەپەڕێ و شیریان تێدەنێ و لە چاوترووکانێکا سەری کوڕانی عەلائوددەولە گۆشاوگۆش دەبڕێ و پڕیان دەکا لە کا و بەڕێیان دەکاتە دەرانەی میزی. هێزی زولقەدر خۆیان بۆ ڕاناگیرێ و هەریەکەی بە لایەکدا باڵیان لێدەڕوێ و دەفڕن.

## ساڵی ٩١٤ / ١٥٠٨ ـ ٩

شاسمایل بە ئارمانجی گرتنی عێراقی عەرەب بەرەو بەغدا دەبزوێ و سەرەتا بازیکبەگی پورناک کە سوڵتان مرادی کوڕی سوڵتان یاقووبی لە شیرازەوە بردبووە بەغدا و کردبوویە میر، سەری وەبەرهێنا و کڵاوی دوازدە قۆزاخەی سۆفییانی کردە سەری. بەڵام دواتر کە هێز و شان و شەوکەتی پادشایەتی وەدەرکەوت و ترووسکایەوە تۆقی و سوڵتان مرادی هەڵگرت و چووە

لای عەلائوددەولەی زولقەدر. حوسێنبەگی لالە(لەلـە) کـە بـە بریکـاری شـا داندرابوو، وەک پێشەنگی لەشکری قزڵباش پێی نایە بەغدا و سکە و خوتبەی بە ناوی لێدا. دوابەدوای وی شاسمایل گەیشتێ و لـە چوارباغی بەغـدا دابـەزی و پاشان چووە زیارەتی مەزارگـەی ئیمامـان. دواتـر رووی کـردە عەرەبـەکانی دەشتەکی و چووە ڕاوی شێران و بێئەوەی کەسی لە پشت بێ چەند دڕندەیەکی بە شیر و تیران گەوزاند. لەم کاتەدا هەر کـەس شـوێنی شـێری بـۆ دۆزیبایـەوە ئەسپێکی بە ڕەخت و زینەوە خەڵات دەکرد. هەمیشە دەچووە شـەڕی شـێران و دەسەڵاتی بەغدای دایە دەس خانمبەگی تالش و ئەمیر نەجمی کـردە بریکـار و یارئەحمەدی خووزانی ئیسفەهانی لە پلەی وەزیری دانـا و بەشـی دارایـی بـە مەولانا شەمسەددینی ئیسفەهانی ئەسپارد. کاروباری میری کەوتە سەر سکەی خۆی و تورک دەستیان لە حیساباتی پادشایەتی کورت کرایەوە.

ئەمجار هەڵیکردە سەر عەرەبەکانی موشەعشەع و بە کەڵەزەڕی و زۆرەملی دەستی بە سەر خاکی ئەوانیش داگرت و بە ڕێگای کۆهگیلۆیەدا بەرەو شـیرازی ناوەندی دەسەڵات ئاژاوتی. بەیرامبەگی قەرامانی و ئـەمیر نـەجم و لالەبـەگی ڕاسپاردن کە هەڵکەنە سەر خێڵ و ماڵی شارۆستەمی لوڕ.

### ساڵی ٩١٥ / ١٥٠٩ ـ ١٠

سەرەتاکانی ئەم ساڵ شاسمایل لـە شـیرازەوە ڕووی کـردە ئێـراق. لـەو سەروبەندەدا ئـاکـاری نـالـەبـار و دزێـوی قـازی محەممـەدی کاشـی کـە مەزنەمەلایەتی و حوکمـڕانێتی لێکـدابوون بـۆ پادشـا تـەواو ڕوون بـۆوە و بوغزاندن و دوژمنایەتی ئەمیر نەجمیشی هاتە سەر و لە مانگی سەفەردا کوژرا. هەر لەو چەند ڕۆژەدا ئەبداڵبەگی دەدە زولقەدری حاکمی قەزوێن و ساوخبولاغ و ڕەی و خار لێخرا و زەینەڵخانی شاملووی لە جێی داندرا. پلەی سـەرۆکایەتی زانایان (مەزنەمەلایەتی) بە شـێوەیەکی سـەربەخۆ بەخـشرا بـە سـەرگەلەی سەیدانی وەجاخزادە میر سەید شەریفی کوڕی میر تاجەددینعەلی کـوڕی مـیر

مورتەزا ئەستەرابادی بە ڕەسەن شیرازی کە یەکێک بوو لە نەوە و نەتیژەکانی میر سەید شەریفی بلیمەت. حوسێنبەگی لالە شاملوو کە هەرەگەورەی سەردارانی قزلباش بوو لابرا و محەممەبەگی سفرەچی (خوانسالار) ئۆستاجلوو کە لە ئاخریدا بە چایانسولتان ناودێر کرا، شوێنی گرتەوە. ئەمیر نەجمی بریکار (وەکیل) لە خومەینەی شەبستەر بە نەخۆشی سەتلوجەم مرد و جێگای ئەویش درا بە میر یارئەحمەدی خووزانی و نازناوی نەجمی دووەمی درایە. «ئومێدی»ی شاعیر چەند قەسیدەیەکی ڕێک و پتەوی بۆ داناوە و لە یەکیاندا گوتوویەتی:

پێموایە نەجمی دووەم لە دوو دنیا تای نابێ
لە جێی دیکە گەر هەبێ تەنیا خودا دەزانێ

لە ئاخری ئەم ساڵەدا شاسمایل هەڵیکردە سەر قەڵای شیروان و شێخشای حاکمی وێ پەنای بردە قەڵای بێغەرد (بێگەرد). قەڵای باکۆ و شابێران بە دەستی هێزەکانی شا گیران و سەرۆکایەتی ئەو دژانەی دایە دەس لەلەبەگی شاملوو. میرزا بەدیعوززەمانی کوڕی سولتان حوسێنمیرزاش لەم ساڵەدا نەیتوانی خۆی لە حاند لەشکری زۆر و زەوەندی ئۆزبەک ڕابگرێ و لە ئەستەرابادەوە هانای هێنایە ژێردەرانەی شاهی و گەلێکی ڕێز لێگیرا و لە کۆڕی میریدا خرایە سەرووی وەزیر و نێو جەللەی شازادانەوە.

## ساڵی ٩١٦ / ١٥١٠ ـ ١١

لەم ساڵەدا کابرایەک بە ناوی شەیتانقولی لە خێڵی قزلباش ڕاپەڕی و کەوتە سەربزێوی و گەلێکی ئاژاوەگێڕا و کاری ناشیاوی کردن. سولتان بایەزید عەلیپاشای مەزنەوەزیری نارد کە پنجی هەڵکەنێ، بەڵام گەیشتە پلەی بەرزی شەهید بوون.

ڕۆژی دوازدەی مانگی قوربان لە کوێستانی خەڕەقان (خەرەقان) شاسمایل گوێبیست بوو کە قۆشەنی دنیاتێکدەری ئۆزبەک پەلاماری چەند ناوچە و مەڵبەندێکی کرمانی داوە و تاپۆی کردووە. سەرەڕای ئەمەش جارێک قازی نووروڵڵای برازای قازی عیسای سەدر و جارێکی تر شێخ محێدینی مەشهوور بە شێخزادەی لاهیجی نارده لای شیبەکخان و لێی ڕاسپارد کە وا چاکە دەست لەو کارە ناحەز و نالەبارانە هەڵبگرێ. شیبەکخان کەڕەتی دوایی ئەمیر کەماڵەددین حوسێنی ئەبیوەردی بە کاخەزێکەوە دەنێرێتە بارەگای میری و تێیدا لووتبەرزی دەنوێنێ. شا ئەم کارەی لە دڵی گران دێ و ئەو کوێستانە بەرەو خوراسان بەجێدێڵێ. کاتێک دەگاتە دامغان ئەحمەدسوڵتانی زاوای شیبەکخان لەوێ و خواجە ئەحمەدی قۆنقورات لە ئەستەراباد بازرە دەبن. هەروەها دارۆغەکانی شیبەکخان زۆربەی ناوچەکانی خوراسان چۆڵ دەکەن. شاسمایل دوای زیارەتی مەرقەدی ترووسکەداری ئیمام ڕەزا - درووود و سلاوی لەسەر بێ- دەڕوا بۆ سەرەخس. شیبەکخان لە کۆتایی مانگی ڕەجەبدا هەڵدەچێ و وەک گڕالک دەرهەڵدەبێ و لە هیراتی شانشینەوە بەرەو مەرو دەبزوێ. دانا محەممەدی ئەفشار لەگەڵ پۆلێک سەرسووری مێرخاس دەبنە پێشەنگ و دەڕۆن و لە دەوروبەری تاهیراوا تووشی تاقمێکی ئۆزبەکان دەبن و دانا محەممەد دەکوژرێ، بەڵام قزڵباش (سەرسوور) ئۆزبەکان هەتا زارکی حەوشەی مەرو هەڵدەبڕن. لەو جەنگەیەدا قۆشەنی شاسمایل دەگاتێ و وەک بازنە دەورەی باژێر دەدا. لەبەروەی شەڕی دەوری شوورەی شار دەسکەوتێکی نابێ، هێزەکانی میری ئێوارەی ڕۆژی چوارشەممۆی ۲۸ی کوڵەمانگ رووکاری مەرو چۆڵ دەکەن و لە چۆمەڵی مەحموودی دەپەڕنەوە کە هەتا شار سێ فرسەخی نێوانە و لەوێ خێڵ و باریان دەخەن. ڕۆژی پێنجشەممۆ و شەوی هەینی دەمێننەوە و کاخەزێکی پڕ سەرکۆنە لە شیبەکخان دەنووسێ و بە تەتەرێکی باوەڕپێکراودا دەینێرێ. بەیانی هۆردووی دەنگ دەدا و بەرەو تەڵختان دەڕوا. ئەمیرخانی مووسڵی لەسەر

زارکی پردێ بەجێدێڵێ و دەستووری پێدەدا کە هەرکات ڕەشایی سپای دوژمن دەرکەوت، ڕامەوەستە و بەرەنگاری مەبەوە و بەرەو هۆردوو بکشێ. شیبەکخان کە ئاوای چاو پێکەوت هەڵخەڵەتا و بە پازدەهەزار سوارەوە بەپڕتاو هاتەدەر و ڕەوینی ئەمیرخانی بە لاوازی قۆشەنی میری دانا و لە چۆمەڵی مەحموودی تێپەڕی. لەم وەختەدا هێزەکانی میری گەڕانەوە و لە تاریک و ڕوونی بەیانیڕا هەتا تاوپەڕی ئێوارێ شەڕێکی قورس و سامناک قەوما. لەبەرەوەی شیبەکخان تەنگی پێهەڵچندرا بە خۆی و پێنسەد سوارەوە پەنای بردە نێو کاولێکی بێدەرەتان و بۆرووونسولتانی تەکەلوو و چەند سەرکردەیەکی قزڵباشان پەلاماریان دان و پاڵەوانانی ئۆزبەک لە ترسان وەکوو تەرمەک و لیژە بە سەریەکتردا کەوتن و شیبەکخانیان وەژێر خۆیان دا و جیقوفیقیان دەرهێنا و پشووی لێبرا. سەریان بڕی و بردیانە هەوێڵ پادشا و هەر ئەو کاتە فەرمانی دا قاپێلکی سەریان داماڵی و لە زێڕیان گرت و شەرابی سووریان پێخواردەوە.

خواجە مەحموودی ساغەرچی وەزیری شیبەکخان کە لە ڕاستیدا شیعە بوو، کلیلی مەروی ناردنە ژێر پێچکەی فەرمانڕەوا. بە لوتف و دەهندەیی شاهانە خەڵات کرا و کەوتە نێو لیزگەی وەزیرانەوە. ئاڵای سەرکەوتننیشانی لەوێڕا بەرەو هیرات هەڵدا و ڕۆژی ٢٠ی مانگی ڕۆژوان پێینایە ئەم شارەوە و لەوێ بنەیخست. جڵەوی حکوومەتی هیراتی دایە دەس لەلەبەگی شاملوو و مەرویشی ئەسپاردە دەدەبەگ. لە شوێنی خێڵبەز شێخولئیسلامی خوراسان مەولانا سەیفەددین ئەحمەدی کوڕی یەحیا کوڕی مامۆستا و پێشەوای دین و ئایین مەسعوود تەفتازانی کوشت و بەرچاوتەنگی مەزەبی و فیتی بوغز لە زگان ئەم کارەی پێکرد. هەر لەوێ میرزا سولتان وەیسەی ناسراو بە خانمیرزای کوڕی میرزا سولتان مەحموود کوڕی ئەبووسەعیدی کوورەگان بە خزمەت پادشا گەیشت و زۆر چاک لاوێندرایەوە و بە کامڕەوایی گەڕایەوە سەر جێگا و ڕێگای خۆی کە حەساری شادمان بێ.

## ساڵی ٩١٧ / ١٥١١ ـ ١٢

لە وەرزی بەهاردا شاسمایل لە شانشینی هیراتەوە ڕووی کردە هەرێمی ئەوبەرڕووبار. کاتێک ناوچەی مەیمەنە و فاریاب ڕەشماڵ و خێوەت و بارگای هێزە هەمیشە سەرکەوتووەکانی لێهەڵدرا، خاتوونانی ئۆزبەک کە دوای کوژرانی شیبەکخان لە ئەوبەرڕووبار بەیداخی حکوومەتیان هەڵدابوو، کەوتنە لالانەوە و پاڕانەوە و چەند پیاوماقووڵێکی داموودەزگای دەسەڵاتیان کردنە تکاکار و خواجە مەحموودی ساغەرچی بوو بە کەیخودا و گرێکەی ڕەها کرد و کۆتایی بە کێشەکەیان هێنا. هەر بۆیە شای بەرزەجێ دەسەڵاتی بەلخ، ئەندخوود، شۆبۆرغان، چیچەکتوو، مەیمەنە، فاریاب، مورغاب و غورجستانی کردە باربووی بەیرامبەگی قەرامانلوو. پاشان سەری ولاغی وەرسووڕاند و بەرەو عێراق گەڕایەوە و وەختایەک گەیشتەوە دەوروبەری ڕەی بیستی کە نیزیکەی پازدەهەزار تەکەلوو لە ڕۆم ڕاپەڕیون و چەند جارێک لەگەڵ میرانی عوسمانی لێکیانداوە و لە ناوچەی ئەرزەنجان کاروانێکی پتر لە پێنسەد کەسییان ڕووت کردووە و پاشان قەڵتوبڕیان تێخستوون و جووقەواریان لێبڕیون. بۆیە فەرمانی سزادانی سەرکردەکانیان دەرچوو کە بکوژرێن و هەر کەسێکی لەگەڵیانە بە سەر میرانا دابەشی بکەن و دەست لە ماڵ و سامانیان نەگێڕنەوە.

هەر لەم ساڵەدا شاسمایل زستانەهەواری بردە قوم. لەم خێڵبەزە میر عەبدولکەریم و ئاغا محەممەدی ڕووزئەفزوون کە هەوساری حکوومەتی مازندەرانیان بە دەستەوە بوو، بە کۆڵێک دیاری و پێشکەشەوە هاتنە بارگای شایەتی و بۆ هەموو ساڵێ سیهەزار تەمەن دراوی برەوداری عێراقیان خستە سەر شانی خۆیان کە بیدەن بە خەزێنەی دارماڵی میری. میر سەید شەریف دەستی لە کاری خۆی کێشایەوە و چووە زیارەتی مەزارگەی ئیمامان. ئەو پلە بەرزەی کە بریتی بێ لە مەزنەمەلایەتی لە مانگی قوربانەدا درا بە ئەمیر عەبدولباقی. لەم دەمەدا هەواڵی لادانی بابورمیرزا و تلاسابوونی لە ڕێگای ڕاست

بە گوێی موبارەکی شاسمایل گەیشت کە خۆی یارمەتی دابوو هەتا دەسەلاتی بە سەر ئەوبەرڕووباردا بشکێتەوە. شا، ئەمیر نەجمی دووەمی ڕاسپارد کە بڕوا و هەرێمی دەسەلاتی لێبستێنێ و هەموو میرانی خوراسانیشی خستنە بەرفەرمانی و کلکەی مانگی قوربان لە خێڵبەزی قومەوە بەرەو ئەو قۆڵە بزووتن.

هەر لەم ساڵەدا سوڵتان سەلیمخان بە دنەی سپای یەگیچەری (یەنیچەری) و قۆشەنی ڕۆملی بە مەبەستی بە دەستەوە گرتنی جڵەوی حکوومەت چوونە جەستەی باوکی مەزنی کە سوڵتان بایەزیدخان بێ و لە شوێنێک بە ناوی چوورلی شەڕ و کوشتاریان لە مابەینیدا قەوما. دوای کێشمەکێش و لێدانێکی زۆر، لەشکری کوڕ شکا و سوڵتان سەلیم هەڵات و بە سواری کەشتی بەرەو کەفە خوشی.

## ساڵی ٩١٨ / ١٥١٢ ـ ١٣

سەرەتای ئەم ساڵە وەزیران و کارگێڕانی باڵای حکوومەتی سوڵتان بایەزیدخان گوتیان چونکە سوڵتان سەلیمخان لە کەفەوە گەڕاوەتەوە ڕۆملی و چەکدارێکی زۆری لە خۆی هاڵاندووە و دەیهەوێ دیسان شەڕ بە باوکی بفرۆشی، وا چاکە بگوێزرێتەوە بۆ ئیستانبووڵ و بکرێتە فەرمانڕەوا. بەدزی پیاویان نارده خزمەتی و ڕووڕاستی و نیازپاکی خۆیان لێ ڕوون کردەوە. بۆیە سوڵتان سەلیمخان لە ڕۆمئیلی (ڕۆملی)ڕا گەڕاوە ئیستانبووڵ و لە ئەدرنە قەپووسی (دەروازەی ئەدرنە) تەشریفی ڕکێفی بەتاڵ کرد. هەموو میران و وەزیران و کاربەدەستان چوونە پێشوازی و شەرەفی سەرپەنجە ڕاموسانیان پێبڕا و بەوپەڕی ڕێز و شان و شکۆوە بردیانە کۆشکی فەرمانڕەوایەتی. سەرەتا چووە دەس ماچ کردنی باوکی هێژای و شانازی و سەربەرزی پێبڕا و هەر ئەو ڕۆژە نایانە تای کەژاوە و بەریانکردە ئەدرنە و تەشریفی موبارەکی ڕۆنیشتە سەر کورسی فەرمانڕەوایەتی. سوڵتان بایەزید لەبەر هرووژمی دەرد و پەژاران دیقی

کرد و دڵی تۆقی و شانشینی لەشی لە شەوکەتی سوڵتانی ڕووح داماڵی و ڕووی نایە بەر دەرگای ڕەحمەتی یەزدانی.

سوڵتان بایزخان لە تەمەنی سی ساڵیدا لە پاڵپشتی پادشایەتی پاڵی داوەتەوە و سی و دوو ساڵی فەرمانڕەوایەتی کردووە. ئاکار و کرداری چاکی چوونەوە سەر ڕەوت و ڕێبازی سۆفیگەری و لەسەر دەستی شێخ محێدینی باوکی موفتی سەردەم ئەبوومەسعوود ئەفەندی تۆبەی کردووە و لەگەڵ وی کەوتۆتە خەڵوەنشینی و لارەملبوونی بەردەرانەی یەزدانی. منالانی پاکسرشتی ئەو میرە خودابەشیوە بریتین لە: ١- سوڵتان شاهەنشا ٢- سوڵتان عەلەمشا ٣- سوڵتان ئەحمەد ٤- سوڵتان سەلیم ٥- سوڵتان قورقود ٦- سوڵتان مەحموود ٧- سوڵتان عەبدوڵلا ٨- سوڵتان محەممەد. سوڵتان قورقود نەبێ کە بزر بووە، تەواوی ئەوانی دیکە بە دەس سوڵتان سەلیمی برایان کوژراون. نۆزدە گەورەوزیر لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەودا گەیشتوونە پلەی وەزارەت و گەلێک کۆشکەڵ و باڵەخانە و شوێنەواری خێر و خێراتی وەک مزگەوت و حوجرەی فەقێیان و خوێندنگا و تەکیە و خانەقای خۆش و ئاوەدانی لە پاش بەجێماوە.

پارەکە کە ئەمیر نەجمی دووەم وێڕای میران و بەگلەرانی خوراسان ڕووی کردە ئەوبەرڕووبار و گەیشتە ڕووکاری بەلخی قوبەی ئیسلام، بیست ڕۆژ لەوێ بنەی داکوتا. لەوێوە میر محەممەدیۆسف کە لە هیراتەوە وێڕای خۆی هێنابووی لەسەر داوای بابورمیرزا ناردی بۆ حەساری شادمان. مانگی ڕەجەب بە ڕەوگەی تێرمێد (تێرمێز)دا تێپەڕی و لە چێکچەک کە پێیدەگوترێ دەربەندی ئاسنین، دەگاتە دیداری بابورمیرزا و پێکەوە دەڕۆن بەرەو قەڵای خوزار. ئاقپۆڵا سوڵتانی حاکمی وێندەرێ لەبەرەوەی دەروەستیان نەدەهات هاتەدەر و پەنای خواست و گیرا. هۆلقوتوو بەهادوری سەرلک لەو دژەدا دەکەوێتە بەرەنگاری و وێڕای کۆمەڵێکی زۆر لە ئۆزبەکان دەکوژرێ. دواتر دەچنە سەر قەرشی و شێخمیرزای حاکمی ئەوێ بەرامبەریان دەوەستێ و پاش سێڕۆژ بە زۆرداری دەیگرن و

گەورە و بچووک دەدەنە بەر دەمی تیژی شیران و کەس ناپارێزن. بۆ وێنە تاقانەی زەمان و کەسایەتی پوختەدەروونی دەوران، مەولانا بەنایی کە پێم وایە لەوەتی دنیا بە دنیایە بلیمەتێکی ئاوا چازانی هەموو بوارانی بە خۆیەوە نەدیوە، لەو هەڵلا سامناکەدا بە دەستی تاقمێک دڵڕەقی خوێنڕێژ شەهید دەکرێ. لە نێو خەڵکدا وا بلاو بۆتەوە ڕۆژایەک کە لەشکری دنیاتێکدەری قزڵباش بە سەر شاری قەرشیدا سەرکەوت، مەولانا بەنایی ئاتەگی پڕ کردبوو لە بەرد و چووبووە سەر بانێکی بەرز و دەیهاویشتنە خەنیمان و ئەوانەی دەیانویست بیکوژن. وەختایەک تاقە بەردێکی پێمابوو یەکێک لەو بۆرەپیاوە سەرسوورانە نێزەیەکی تێهەڵدەکا و ئەویش ئەوەندە دەترسێ کە دەستی ناگێڕێتەوە و بەردەکەی پێدادەدا و ئەم شێعرەی بە زمانیدا دێ.

یاریم دەوێ لە میری مەزنی عەرشی
هەر بەردێکە و سەربانی بەرزی قەرشی

میسرەعی دووەم لە هەرێمی ئەوبەرڕووبار و خوراسان و عێراقا بۆتە پەندی باو.

بەکورتی ئەمیر نەجم دوای کوشت و کوشتار و تالانی قەرشی لەوێوە لەشکری دەجووڵێنێ و لە دوو فرسەخی بوخارا خێوەتی قۆشەنی هەڵدەدا. لەوێ دەبیستێ کە عوبەیدخان(؟) ڕووی کردۆتە بوخارا، بۆیە بەیرامبەگی قەرامانلوو وێڕای کۆمەڵێک چەکداری ئازا دەنێرێتە بەرەنگاربوونەوەیان. ئۆزبەک چونکە خۆیان بۆ ڕاناگیرێ پەنا دەبەنە بەر شوورەی غۆجدۆوان. ئەمیر نەجمی دووەم هەواڵی پێدەگا و لەگەڵ پاشماوەی هێزەکانی دەڕوا و گەمارۆی دەدا. چەند ڕۆژێک لە دەورەی دژ دایدەکوتێ و هەرچەندی بابورمیرزا و خواجە مەحموودی ساغەرچی کە زۆر چاک لە بارودۆخی ناوچەکەیان دەزانی و پێیاندەگوت وا

باشە لێرە بڕۆین، جوابی نەدانەوە. هەتا وای لێهات کە بەیانی ڕۆژی سێشەممۆی ٣٠ی مانگی ڕەمەزان جانیبەگخان و عوبەیدخان لە بوخارا دەرکەوتن و ئۆزبەکانی ژوورەوەی قەڵا دایانە پاڵیان و هەر ئەو کاتە شەڕ هەڵگیرسا. یەکەم کەسێکی کە لەو هەڵلایەدا کوژرا بەیرامبەگی قەرامانلوو بوو. سایری میران و سەرکردان کە پێیان شەرم بوو بکەونە ژێرڕکێفی ئەمیر نەجم، سەری هەوساری ڕەوینیان وەرسووڕاند. میرزا بابور ملی ڕێی حەساری شادمانی گرت و میر نەجم و ئەمیر زەینولعابیدینی سەفەوی و گەلێک لە قزڵباشان کوژران و بە دیل گیران. جانیبەگ سوڵتان دوابەدوای تێشکاوان چووە هیرات و تەشریفی لە ئۆلەنگی کەهدستان دابەزی. عوبەیدخان پاشی وی گەیشتێ و لە دەشتی ساقسولەیمان خێوەتی هەڵدا و تاوڵ و ڕەشماڵی سەرسەرای سەریان لە پەرپەرۆچکەی ئاسمان ساوی. ماوەی دوو مانگ سەرداری ئۆزبەکان ئابلۆقەی هیراتی دا و چی بۆ نەکرا و ئەم هەواڵە تاڵ و سامناکانە لە ئیسفەهان بە گوێی شاسمایل ئاشنا کرا و ئەویش سەرلەنوێ بڕیاری دا هێرش بەرێتەوە سەر خوراسان.

سوڵتان بایەزیدخان خودا لێیخۆش بێ، شوێنەواری خێر و چاکەی زۆر بوون و بریتین لە: ١- سازکردنی مزگەوتی گەورە، حوجرەی فەقێیان، قوتابخانە، کاروانسەرا، خانەقا و میوانخانەی هەرەباش لە ئاماسییە. ٢-هەڵبەستنی پردی نۆزدە کڵی لە شارۆچکەی عوسمانجق لەسەر ڕووباری قزڵئیرماق. ٣- لێدانی پردێکی چاردە کڵە لە شارۆکەی کێوە لەسەر چۆمی قەیسەرییە. ٤- سازکردنی پردی نۆزدە کڵە لە هەرێمی ساروخان لەسەر چەمی گەدووس. ٥- هەموو ساڵێ دراوێکی زۆری لە خەزێنەی دەوڵەمەندیڕا دەنارد بۆ موفتی زەمان و مامۆستایانی دەرسوێژ و پیاوانی گەورەی چازان و بەرزەجێ و جگە لەمەش هەموو ساڵێک بڕی دەهەزار درەمی زێوی دەنارد بۆ جەنابی مەولانا ئارەحمانی جامی و جلەوکێشانی نەقشبەندی لە بوخارا.

زانایان و شێخانی هاوچەرخی سوڵتان بایزخان بریتی بوون لە:
١- مامۆستا موسلیحەددین کە سەرەتا بۆتە قازیلەشکری ڕۆملی و پاشان بە مووچەیەکی کەم خۆی خانەنشین کردووە. ٢- مەولانا محەممەدی سامسۆنی کە لە پێشدا کراوەتە قازیئەسکەری ڕۆملی(؟) و دواتر لێخراوە. ٣- مەولانا برایم کە هەوەڵێ بۆتە قازیقۆشەن و دوایە کراوەتە وەزیر. ٤- مەولانا عەلائەددین فەناری کە گەیوەتە پلەی قازیئەسکەری ڕۆمئیلی و ئاناتۆلی. ٥- مەولانا حاجی حەسەنزادەی ئیمام عەلی کە بە هەزار کوێرەوەری و دەردەسەری بۆتە قازیلەشکری ڕۆملی. ٦- مەلا ئەخیزادەی جەعفەر چەلەبی کە لە خوێندنخانەی مەحموودپاشادا بۆتە مامۆستا، بەڵام لەبەر خەتخۆشی و پاراونووسین بۆتە میرقەڵەم. ٧- مەولانا یۆسفی تووقاتی کە پیاوێکی خوێندەواری فرەزان بووە و لە زۆربەی بوارەکاندا خاوەنی نووسینی گران و سەنگینە. بۆتە وانەوێژی سەمانییە و ڕۆژێ هەشتا ئاقچەی بۆ بڕاوەتەوە. ٨- مەولانا عوزاری کە مرۆیەکی زانا بووە و لێکدانەوەی لەسەر «حاشیەی مەواقێف» نووسیوە و بە تورکی و فارسی شێعری چاکی هۆنیوەتەوە. ٩- مەولانا سنانچەلەبی عەجەمی کە ناسراوە بە بەردەعیزادە. سەرەتا لە ئاماسییە بۆتە مامۆستا و سەرەنجام گەیوە پلەی بەرزی فتوادان. لێکدانەوەیەکی لەسەر «مەواقێف» نووسیوە و پەراوێزی بۆ «تەجرید» داناوە. ١٠- مەولانا زیرەک(؟) کە یەکێک بووە لە گەورە مامۆستایانی ڕۆم. لە پێشدا بۆتە قازی ئیستانبووڵ و پاشان گەیوەتە پلەی قازیئەسکەری ڕۆملی و ئاناتۆلی. ١١- سەرتۆپی خوێندەواری و پوختەیی و نووسەری کۆمەڵێک کتێب و نامیلکەی بواری خوداناسی و کارزانی پلە و قۆناخەکانی جیهانی نیهانی و دۆزەرەوەی نەهێنییەکانی بەستێنی باڵای یەزدانی، پیتۆلی فرەزان ئیدریسی بدلیسی. دیارە باس و لێداون سەبارەت بە ئاکاری جوان و لەباری ئەو مەزنە بۆ من بووز ناخوا. ١٢- مەولانا شوجاعەددینی کووسەج کە سەرەتا مامۆستا بووە لە خوێندنگای سەمانییە و پاشان بۆتە قازی لە بوورسا.

١٣- مەولانا عەبدوڕڕەحمان کە زۆرتر لە خزمەت سوڵتاندا ژیانی تێپەڕ کردووە و یەکێک بووە لە هاودەمانی. لێکدانەوەی لەسەر «مەتالع» کردووە و چەند ڕەخنەیەکی لە نووسەرەوە و شیکەرەوە گرتووە کە زانایان بە دڵیانە. ١٤- مەولانا میروم چەلەبی کە بۆتە ڕاوێژکاری پادشا و لە زمان و ئەدەبی عەرەبی و زانستی ئەستێرەناسیدا مامۆستا بووە و نامیلکەی ئەستێرەگەری کوورەگانی کردۆتە فارسی. ١٥- حەکیم شامحەممەد کە لە قەزوێنەوە ڕووی کردۆتە ئیستانبووڵ و لە بواری فرەزانی بەتایبەت لە پزیشکیدا لێزان بووە و سەرەنجام بۆتە پزیشکی پادشا. ١٦- مەولانا موزەففەرەددینی شیرازی کە لە ئەستێرەناسیدا کەس تۆزی نەشکاندووە. ١٧- مەولانا قوتبەددین ئەحمەد کوڕی مەولانا نەفیسی(؟) کە لە پزیشکیدا بۆخۆی «لوقمان»ێک بووە و هەمیشە بە خزمەت فەرمانڕەوا گەیشتووە. لە بواری زانستی پزیشکیدا کتێبێکی چاکی نووسیوە. لە ڕۆژگاری ئەو سوڵتانە زانستپەروەرانەدا شاعیران لە هەموو لایەکەوە شێعریان پێداهەڵداوە. بۆ نموونە مەولانا نوورەددین ئاڕەحمانی جامی – ڕەحمەتی خودای لێبێ – چەند قەسیدەیەکی دەربارەی نووسیوە و لە خوراسانەوە بۆی ناردووە. بەرگی سێهەمی «سیلسیلەتوززەهەب»ی کە ناودێرە بە «دەفتەری عەدڵ» لەسەر ناوی ئەم میرە پایەبەرزە تۆماری کردووە. ئەم چەند شێعرە لەو کتێبە وەرگیراون:

| | |
|---|---|
| ئەی خۆزگە مابا میر نۆشیرەوان | عەدڵی هەڵدەچوو پتر لە جاران |
| بەڵام لە عەدڵا دەبووە شەرمەندە | لە ئاست میری ڕۆم ملکەچ و بەندە |
| کانگای گەورەیی و مەزنییە سوڵتان | بایز ئیلدروم پادشای دەوران |

## ساڵی ٩١٩ / ١٥١٣ ـ ١٤

بەیانەی ڕۆژی هەینی ٣٠ی مانگی محەررەم میرانی ئۆزبەکان لەسەر قەڵاتی هیرات ڕابوون. جانیبەگ سوڵتان لە ڕووباری جەیحوون تێپەڕی، بەڵام عوبەیدخان لە ناوچەی مورغاب دایەپاڵ تەیموورسوڵتانی کوڕی شیبەکخان کە دەچوو بۆ خوراسان. پێکەوە بەرەو مەشەدی پیرۆز ڕۆیشتن و بە زۆرەملی و کەڵەزەڕی مەرویان هەتا ئیسفەراین داگیر کرد. لەبەرەوەی هیرات پاشەکەوتێکی کەمی خورد و خۆراکی لێمابوو، حوسێنبەگی لەلە و ئەحمەدسوڵتانی سۆفی ئۆغڵی مانەوەیان بە بەرژەوەند نەزانی. بە ڕێگای تەبەس و سیستاندا چوونە عێراق و کەسانێکی دەمارگرژی هیرات وەک خواجە ئەبولوەفا و ئاوالانی، پیاویان ناردە لای تەیموورسوڵتان و بانگهێشتنیان کردە وێندەرێ. محەممەد تەیموورسوڵتان ئەم خەبەرەی بە سەرکەوتنێکی گەورە دانا و زۆر بەپڕتاو بەرەو ئەوێ باڵی گرت و لە باغی جیهانئارا ڕکێفی بەتاڵ فەرموو. جەماوەری سوننی هیرات کۆمەڵێکی بەرچاوی شیعانیان کوشت و سەرەنجام بە هەوڵ و تێکۆشانی میر محەممەدی میریۆسف دەستیان هەڵگرت.

شاسمایل بە مەبەستی پەلاماردانی خوراسان چووە ڕەی و لە ساروقامیش پلەی بریکاری و سپاسالاری دا بە میر عەبدولباقی و لەوێوە بەرەو خوراسان بزووت. کاتێک کوێستانی کالپووس بە هۆبە و ڕەشماڵی لەشکری خاوەنشکۆ ڕازایەوە، خەلیل سوڵتانی حاکمی شیرازی وەک بەرایی قۆشەن بەڕێکرد و وەختایەک دەنگ و ئاوازەی ئالاکانی ئەم سەردارە پێشڕەوە باڵی ئەنگاوت، عوبەیدخانی ئۆزبەک لە مەشەدی پیرۆزەوە ڕایکرد و بە ڕێگای «شیروشتر»دا چووە بوخارا. هەروەها محەممەد تەیموورسوڵتان دەستی لە هیرات بەردا و هەڵات بۆ سەمەرقەند. ئالاکانی بەختەوەری لە کالپووسەوە بەرەو ئۆلەنگی ڕادکان شەکانەوە و لەبەرەوەی دەدەبەگ مەروی ڕەها کردبوو، بۆ چاوترساندن و تەمێگرتوویی خەڵک، جلی ژنانی کردەبەری و بە سواری کەر گێڕای و ئابڕووی

برد. هۆردوو دەنگ درا و دارایی هیراتی باربووی زەینەڵخانی شـاملوو کـرد و حوکماتی بەلخ و ناوچەکانی دەوروبەری بەخـشی بـە دێوسوڵـتانی ڕۆملـوو. ئەمیرەسوڵتانی مووسڵی شانازی وەرگرتنی پلـەی حکوومـەتی قـاینی پێبـڕا. قۆشەنی میری بەرەو کوێستانی باباخاکی بزووت و لەوێوە گەڕایەوە ئۆلەنگی کەهدستان. کاروباری خوراسانی بە جوانی ڕێکخست و مامزەی بەرەو ئیسفەهان کوتا.

## ساڵی ٩٢٠ / ١٥١٤ ـ ١٥

ڕۆژی یەکشەممۆی پازدەی مانگی محەررەم سوڵتان سەلیمخان بە ئامانجی گرتنی ئێران ڕووی کردە کەوشەنی ئەرزەنجان و کاتێک ئەم هەواڵە لە ئیسفەهان بە گوێی شـاسمایل گەیـشت، بـە مەبەسـتی شـەڕ و بەرپـەرچدانـەوەی لـە ئازەربایجانەوە بزووت. هێزی فەرمانڕەوایان لە چالـدران تێکهەڵـەنگووتن و پاش شەڕ و لێکدانێکی قورس و بەگەرمە، زۆربـەی سـەرۆک و سـەرکردەکانی قـزڵباش وەک میـر عەبدولباقی، میـر سەید شەریف محەممـەدی کەموونـە، خانمحەممەدی ئۆستاجلووی حاکمـی دیـاربـەکر، وەلیجانبەگی قەزەقلووی تورکمان، ساروپیرەی فـەرمـانـدە هێـزی ئـۆسـتـاجلـوو، حوسـێنبـەگی لەلە شاملوو، سوڵتان عەلیمیرزا ئەفشار، پیرعومەربـەگی شـیرەچیباشـی (میرمەیگێڕ) و نیزیکەی پێنجهەزار سوار کوژران و قۆشەنی سەرسووران شـکا. شاسمایل بوو بە ڕێبواری ڕێی ڕاکردن و هەتا دەرەگەزین و هەمەدان ڕانەوەستا و ئاوڕی نەدایەوە و یەکبین کوتای. دوابەدوای ئەو سوڵتان سەلیمخان پێینایـە تەورێزی بنگەی دەسەڵات و چەند ڕۆژێـک لـەوێ بنـەی خـست و لەبـەرووەی خواردەمەنی و خۆراک لەوپەڕی کەمیدا بوو، مانەوەی بە بەرژەوەند نـەزانی. بۆیە هەستا و سوڵتان بەدیعوززەمانمیرزای کوڕی حوسێنمیرزا کە شـاسمایل بڕەخەرجێکی نەمرنەژی بۆ بریبـۆوە و ئـەو پاشـازادەیە ڕۆژگـارێکی تـاڵ و ناخۆشی ڕادەبوارد، لەگەڵ خۆی هەڵیگرت و دەستی ڕێزی لێنـا و هێنـای بـۆ

قوستەنتەنییەی پایتەخت. بەڵام تەنیا دوای چوار مانگ کاری سوڵتان بەدیعوززەمان کۆتایی پێهات. میرزا محەممەدزەمانی کوڕی کە وێڕای باوکی سەری وەبەر ڕکێفی شاسمایل هێنابوو، وەختایەک کە ئەو میرە بەرەو شەڕی سوڵتان سەلیمخان بزووتبوو، دەستەیەک چووبوونە کەڵیشەیەوە و لە خشتەیان بردبوو. بۆیە لە جەللەی هاوڕکێفانی میری ترازابوو و یەکسەر چووبووە سەر ئەستەراباد و گرتبووی و پاشماوەی لەشکری جوغتای لێی کۆببوونەوە. خواجە موزەففەر تەبەکچی وێڕای سەردارانی خوراسان چوونە سوێی و بەیانەی ڕۆژی شەممۆی ١٦ی ڕەمەزان، میرزا محەممەدزەمان بەزێندرا و ڕەوی و بە ڕێگای چۆل و بیابانی ئەیبوەردا بەرەو غورجستان کشا و شانبەشانی میر ئۆردووشای حاکمی وێندەرێ کە یەکێک بوو لە یارانی باپیری بە مەبەستی گرتنی ناوچەی بەلخ ئەسپی لینگ دا. بە هەڵکەوت ڕاست لەم کاتەدا دێوسوڵتان، میر محەممەدی بەهارلووی لە بەلخ کردبووە بریکاری و خۆی چووبوو بۆ خزمەت شاسمایل. میرزا محەممەدزەمان هەر بە تۆزە هەوڵ و هەڵسووڕانێک بەلخی گرت و ماوەی دە ساڵ بە کۆمەگ و یاریدەی بابورمیرزا بە سەربەخۆیی حوکماتی کرد. سەرەنجام سەردەمی میرزا هومایوون و لە جەنگەی کێشە و هەرای شێرخانی ئەفغاندا کەوتە ئاوی ڕووباری «گەنگ» و خنکا. تازە لە توخم و تۆرەمەی میرزا سوڵتان حوسێن کەس نەما و وەجاخی ئەو خانەدانە بە وی کوێر بۆوە. شاسمایل دوای گەڕانەوەی سوڵتان سەلیمخان لە دەرەگەزینەوە ڕووی کردەوە تەورێز و بنەی لێخست. پلەی سەرۆکایەتی سەرکردان درا بە چایانسوڵتان و چاوەدێری دەرک و دیوان خرایە سەر شانی شاحوسێن و مەزنەمەلایەتی وڵات درایە دەس سەید عەبدوڵلای کوڕی سەید ئەحمەدی لالە. دوای چەند ڕۆژێک سەید عەبدوڵلای لێخست و میر جەمالەددینی شێرەنگی لە جێی دانا.

## ساڵی ٩٢١ / ١٥١٥ ـ ١٦

لەم ساڵەدا سوڵتان سەلیم دەستی بە سەر قەڵای کۆماخ و بایبۆرت داگرت. عەلائوددەولەی زولقەدری حاکمی مەرعەشی ڕاونا و عەلیبەگی کوڕی شاسواربەگی کردە سەرۆکی تیرەی زولقەدر. تەواوی هەرێمەکەیان کەوتە چنگ کاربەدەستانی دامودەزگای میری.

هەر لەم ساڵەدا ئەمیرەسوڵتانی حاکمی قاین لە ئەردەوێڵ چووە خزمەت شاسمایل و هێندێک باسی بارودۆخی نالەباری خوراسانی پێڕاگەیاند. دێوسوڵتانیش لە بەلخەوە گەیشتێ و بۆ پشتیوانی و وەباڵ بۆ کێشانی وتەکانی، قسەی کرد. سەرەڕای ئەم هەلومەرجە حکوومەتی خوراسانی دایە تەهماسبمیرزای کوڕی و ئەمیرەسوڵتانی مووسڵی بۆ کردە دەمڕاست و نازناوی ئەمیرخانی پێبەخشی. بەپەلە و بێڕاوەستان ئەوانی بەرەو خوراسان بەڕێکرد و خۆی زستانەهەواری بردەوە تەورێز.

## ساڵی ٩٢٢ / ١٥١٦ ـ ١٧

سەرەتای ئەم ساڵە سوڵتان سەلیمخان بە ئامانجی گرتنی ئێران تەشریفی لە ئیستانبووڵەوە ڕووی کردە ئێسکوودار و پێوقەدەمی بە شەوکەتی لەوێ دانا. ئەمجار مەلا زیرەکزادە و قەرچەپاشای وەک باڵوێز ناردنە لای قانسووی حوکمڕانی میسر. پاشان هەوساری ئەسپی خۆشبەزی بەرەو عەرەبستان وەرسووڕاند. قانسووش بە مەبەستی بەربەرەکانی و بەرەنگاربوونەوەی سوڵتان هەتا ناوچە و مەڵبەندەکانی حەلەب و ئەلبۆستان هاتە بەرەگە لێبرینەوەی. لە شوێنێک بە ناوی مەرەج تابوق هێزەکانیان گەیشتە یەکتر. قانسوو لەو شەڕەدا کوژرا و قەڵاکانی مەلاتییە، دیوورێگ، دڕندە، بێهسەنی، عینتاب، کۆرەک، کاختە و بێرەچووک (بیرەجووک) کەوتنە دەس مەزنەبەرپرسانی دەرک و دیوانی سوڵتانی. لەم وەختەدا گەورەسەیدانی بەرزەجێ و مەزنەمامۆستایانی هێژا لە حەلەب و شامەوە خۆیان کوتا بۆ لاشیپانەڕامووسانی سوڵتانی گەردوونبارەگا.

سەرۆکان و شێخانی عـەرەبان وەکـوو ئیبنووخـەرفووش، ئیبنووحەنـەش و ئیبنووسەعد و شێخەکانی جەبەل نابلۆس، ئیبنوو‌ئیبڕاهیم، ئیبنووسـەوالم و ئیبنووعەتا و پێشەوایـانـی سەففە، ڕەملە، قودسی موبـارەک و غــەززە بـە ڕایەخ‌ڕامووسانی سەریان بەرز بۆوە. پاشان سولتانی پایەبڵند بـەرەو گرتنـی قاهیرەی میسر بزووت. لە بەینی ڕێگادا قەڵای سەفەد کەوتە دەس سەرجەلەکانی دەسەڵاتی باڵادەستی میری و سولتان چوو بۆ زیارەتی قودسی پیرۆز.

## ساڵی ٩٢٣ / ١٥١٧ ـ ١٨

لە سەرەتای ئەم ساڵەدا تومان‌بای چرکەسی حوکمڕانی میسر کـە لەبـەر ئـازایەتی لـە داوێنـی هـەرەخوارەوەی دەســەڵاتەوە هــەتا پلـەی بـەرزی فەرمانڕەوایەتی پێهەڵاچووبوو، تەواو بە سەربەستی لـە میـسر حکـوومەتی دەکرد. پاشماوەی هەزارەزیلەی چەکدارانی چرکەسی ناکەسی لـە ژێـر ئـاڵای خۆیدا کۆکردبۆوە و دابوویە لاڕێی و لاساری. وەختایەک چۆنیەتی کار و ئاکاری نالێک و بزۆزانەی بە پێچکی تەختی جێی هاوار و بانگانی ڕاگەیەندرا، قۆشەنی دەنگ دا و مزلاومزڵ کـوتـای و بـە یـازدە قـۆنـاخـان گـەیشتـە ڕیدانییـە. «تومان‌بای»یش هەتا ئەو شوێنە هاتە بەرەوپیری هێزە باڵادەستانی سولتانی و بەرەی تەنی. سەرەتا سنان‌پاشای وەزیر لەو هەرایەدا خۆشاوی شـەهیدبوونی نۆشی. پاشان شکست کەوتە لەشکری چرکەسان و تومان‌بای کوژرا. ڕۆژی ٢٣ی مانگی محەررەم وڵاتی باش و بەپیتی میسر کەوتە دەست پیـاوانی داموودەزگـای سولتانی و حکوومەتی چرکەسان لەم سەرکەوتنەدا خاشەی کێشرا و بڕایـەوە. خێربەگی چرکەس کە سەری وەبەرفەرمانی فەرمانـڕەوا هێنـابوو حکوومـەتی میسری باربوو کرا. کەوکەبەی شکۆداری سولتانی لـەوێوە گـــەڕایەوە شـام و خێڵبەزی کرد.

## سالّی ٩٢٤ / ١٥١٨ ـ ١٩

سولّتان سەلیمخان لە سەفەری عەرەبستان گەڕایەوە قوستەنتەنییەی پایتەخت.

هەر لەم سالّەدا شاسمایل هەواری بردە سوورلق و خێلّ و خێزانی ئەسپاردە دەستی میرزا شاحوسێن و بەرەو قومی بەڕێ کرد. خۆشی بە مەبەستی ڕاو ڕۆیی بۆ لای چەمچەمالّ و چیای بێستوون و لەوێوە بۆ هۆردووبەز بەرەو قوم بزووت. دوورمیشخان و زەینەلّخانی شاملووی بە ئامانجی گرتنی مازندەران و ڕۆستەمدار ناردن . حاکمانی مازندەران و ڕۆستەمدار و هەزارجەریب داوەرین و هاتن و سەریان وەبەرهێنا و لە نیزیک ئیسفەهان بە ڕایەخڕامووسانی پادشایەتی شانازییان کەوتە سەر شانی و پاشان هەموو گەڕانەوە سەر جێگاوڕێگای خۆیان.

## سالّی ٩٢٥ / ١٥١٩

لەم سالّەدا سیخوڕان و هەوالگران باسی سەرپێچی و لاساری ئەمیرە دیباجی حوکمداری گیلانی «بیەپەس»یان بە گوێی شاسمایل ڕاگەیاند. کارکیا سولّتان ئەحمەدی حاکمی گیلانی «بیەپیش»ی وێڕای حوکمدارانی مازندەران و ڕۆستەمدار و دوورمیشخان و زەینەلّخانی شاملووی ڕائەسپاردن بۆ مەلّبەندەکانی ژێردەسەلاتی. ئەمیرە دیباج سەری لێشێوا و کارکیا سولّتان ئەحمەد کەوتە نێوان و لە ئۆلەنگی هەمەدان بە خزمەت ڕکێفی فەرمانڕەوا گەیشت و بە چاوی بەخشینی شاهانە لاوێندرایەوە و نازناوی سولّتان موزەففەری درایە. هەر ئەم سالّە بوو بە زاوای خاوەنشکۆ.

## سالّی ٩٢٦ / ١٥١٩ ـ ٢٠

لەم سالّەدا سولّتان سەلیمخان ڕۆژایەکی کە بۆ گەشت و سەیران چووبووە ئەدرنەی نیزیک چوورلی بە نەخۆشی گولی کە پەلێکە لە تاعوون و بە شێرپەنجە ناسراوە، لەم خانووە ڕووخەکەی دنیاوە نوێنوبانی ژیانی ڕاگواست

بۆ ماڵی قایمی هەرمان و لەوێ بنەی یەکجارەکی خست. وەزیرانی گەورە و بەڕێز ماوەی دە ڕۆژان تەرمی ئەم سوڵتانە بەهەشتەلانەیان شاردەوە. ناردیان سوڵتان سولەیمانیان لە مەغنیساوە هێنا و کردیانە فەرمانڕەوا و پاشان مەیتی ئەو پایەبەرزەیان بردە ئیستانبووڵ و ناشتیان. تەنیا سوڵتان سولەیمانی وەک پاشەوار لە پاش بەجێمابوو. پەنجا و چوار ساڵ ژیا و ماوەی هەشت ساڵ و نۆ مانگ و دە ڕۆژی پادشایەتی کرد. دە کەس بوونە مەزنەوەزیری و هەشتیان بە فەرمانی توورەیی خۆی کوژراون و دووەکەی دیکە هەروا مردوون.

هەر لەم ساڵەدا شاسمایل کۆر سلێمانی قۆرچی نـاردە شیراز و ئـەویش سوڵتان خەلیلی حاکمی ئەوێی لە دیوەخانی خۆی کوشت و سەرەکەی لە ئیسفەهان گەیاندە خزمەت میر. خاوەنشکۆ دەسەڵاتی شیرازی بەخشی بە عەلیسوڵتانی چیچەکلوو. چەند کەس لە میرانی شاملووی وەکوو دوورمیشخان و زەینەڵخانی بۆ یاریدەی شازادە تۆماسبمیرزا و ئەمیرخانی مووسڵی ناردنە خوراسان و ئەسپی بەرەو هاوینەهەوارەکانی سوڵتانییە ئاژاوت.

با بێینەوە سەر سوڵتان سەلیم و باسی شوێنەواری خێر و چاکەی بکەین کە بریتین لە: ١- چاک کردنەوەی مەزارگەی ترووسکەداری پیری تاقانەپەرستی پایەبەرز شێخ محێدینی عەرەبی کە لە شاری دەمیشقە و مزگەوتی چاک و گەورەی لە پەنا داناوە. ٢- هێنانی ئاوێک لە ڕێگایەکی زۆر دوورەوە لە شاری قوونییە بۆ سەر گڵکۆی بەرزەشانی زەمان مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی، گۆڕەکەی پڕ بێ لە نوور. ٣- ساز کردنی مزگەوتێک لە ئیستانبووڵ لەگەڵ حوجرەی فەقێیان و خانەقایەک. قەبری موبارەکی لە نیزیک ئەو شوێنەیە.

گەورەمامۆستایان و شێخانی هەڕەتی دەسەڵاتی سوڵتان سەلیمخان ئەم کەسانە بوون: ١- مەولانا سۆفی چەلەبی کە سەرەتا موفتی ڕۆژگار بووە و پاشان خۆی خانەنشین کردووە و ڕۆژانە دووسەد ئاقچەی بۆ براوەتەوە. ٢- مەولانا موئەییەدزادە عەبدوڕڕەحمان ئەفەندی کە سەرەتا وەختایەک

سەفەری کردووە بۆ نێو عەجەمان بۆتە قازیقۆشەنی ڕۆملی. پاشان ئەویش بە ڕۆژانە دووسەد ئاقچە قنیاتی هێناوە و دەستی لە کار کێشاوەتەوە و بە دوورەپەرێزی ژیاوە. ٣- مەولانا کەماڵ پاشازادە شەمسەددین ئەفەندی کە بە بڕوای زانایان و ئاقڵمەندانی ڕۆم، پیاوێکی ئاوا خوێندەوار و پڕ و تەواو لە ڕۆمدا خۆی نیشان نەداوە. نووسراوەی زۆرن و گەلێک شێعری مەزەداری عەرەبی و تورکی لە پاش بەجێماوە. سەرەنجام بۆتە موفتی سەردەم و بە موفتی جنۆکە و ئادەمی ناوبانگی ڕۆیشتووە. لە ئاخریدا دەستی لەم کارە بەرداوە و بۆتە مامۆسای خوێندنگای سوڵتان بایەزیدخان. ٤- مەولانا حەلیم چەلەبی قەستەموونی کە ئادەمیزادێکی فرەزان و هەرەباش و ئاکارچاک و سەروڕووخۆش و بە دەم و ڕاوێژ بووە. زۆربەی زۆر هەر لەگەڵ پادشا هەستاوە و دانیشتووە. ٥- مەولانا ڕوکنەددین زیرەکزادە کە لە پێشدا بۆتە قازیلەشکری ڕۆملی و سەرەنجام ڕۆژێ بە سەد ئاقچە خانەنشین کراوە. ٦- مەولانا محێدینی چەلەبی فەناریزادە کە بۆتە مامۆستای سەمانییە و پاشان بۆتە قازیئەسکەری ڕۆمئیلی. ٧- شێخ عەلوانی کە لە بواری دنیای بەدی و نەبەدیدا کەسێکی پوختە و ماڵی لە حەما بووە. ٨- شێخ محەممەدی بەدەخشی کە لە وەختی گیرانی شامدا شا چۆتە زیارەتی و ماوەیەکی زۆر شێخی دواندووە. ٩- شێخ لامعی چەلەبی کە لەسەر ڕەوت و ڕێبازی شێخان کەس لە سەردەمی خۆیدا تای نەکردووە و بۆ شێوەی نووسینی پەخشان و هۆنینەوەی شێعر سەرتۆپی ڕۆژگار بووە. کتێبی چاکی نووسیون و ژیاننامەی شاعیرانی تورکی ڕێکخستووە. نامیلکەی «دەمەتەقەی زستان و بەهار»ی ڕەوان و مامۆستایانەیە و بە لای پیاوانی زاناوە زۆر بەنرخە.

##ساڵی ٩٢٧ / ١٥٢٠ ـ ٢١

ئەم ساڵ یەکێک لە سەرکردەکانی چرکەسان بە ناوی جان بێردی لە میسر یاغی دەبێ و تۆڕ و داوێ هەڵداوێ. سوڵتان سولەیمانخان، فەرهادپاشای وەزیر

دەکاتە سەرکردەی لەشکر و دەینێرێتە جەستەی. لە خاکی شام هێزەکانیان پێکدادەدەن و چرکەس دەڕەون. جان بێردی لەو هەڵلایەدا دەکوژرێ و کاژەڵاکی دەنێرنە بارگای میری.

هەر لەم ساڵەدا شاسمایل، دێوسوڵتانی ڕۆملوو دەکاتە سەرهێز و دەینێرێتە سەر هەرێمی گورجستان. حاکمانی لۆند و داود و غەرغەرە پێملی دەبن و بە گەلێک دیاری و پێشکەشییەوە دەچنە بارگای و تاوانانەی لادینی و باج و خەراج دەخەنە سەر شانیان.

ڕۆژی نۆزدەی مانگی جیمادی دووەم عوبەیدخانی ئۆزبەک دەچێتە گەمارۆدانی هیرات و ڕۆژی هەینی دووی ڕەجەب دەگەڕێتەوە ئەوبەرڕووبار.

ئەمیرخانی مووسڵی کە لەلە (پێشکار)ی شاتۆماسب بوو، لەبەروەی لە دڵی خۆیدا بڕێک میر محەممەدی میر یۆسف کە یەکێک بوو لە سەیدە و جاخزادەکانی خوراسان دەیدزی، تۆماتی لاگیری کردنی بابورمیرزای پێوەبەست و ڕۆژی سێشەممۆی ڕەجەب گرتی و ناردی بۆ قەڵای ئیختیارەددین و بۆ بەیانی ئەو سەیدە بەرزەشانەی کوشت. کاتێک ئەم هەواڵە لە هۆردوودا بە گوێی پادشا ئاشنا کرا، گڕی گرت و پڕیشکاندی و خێرایەکی ئەمیرخانی لە حوکمڕانێتی خوراسان و لەلەیەتی خست و بە مەبەستی کۆڵینەوە لە کوژرانی میر محەممەد بانگیهێشتە هۆردوو. حکوومەتی هیراتی دایە دەس دوورمیشخانی شاملوو. شێخشای حاکمی شیروان هاتە هاوینەهەوارەکانی «سەهەند»ی ئازەربایجان و زۆری ڕێز لێگیرا و بە دڵخۆشی فەرمانی حکوومەتی شیروانی وەرگرتەوە و گەڕایەوە شوێنی خۆی.

لە بنەبانی ئەم ساڵەدا سوڵتان سولەیمانخان بە نیازی گرتنی هەرێمی ئەنکرووس لەشکری دەنگ دا و قەڵاکانی بۆکووردێلن (بوودین)، زێمین (زێموون)، ئێسلانقەمێن (سالانکامین)، کەرپنەک، ئیلووق و ئیرەشوەی گرتن.

هێزی پەلاماردەری ناردە هەرێمی خۆروات و یەخسیرێکی زۆر کەوتنە چنگ غەزاکەرانی بالادەست.

هەر لەم سالەدا ئەسکەندەرناوێکی ئاژاوەگێڕ لە یەمەن سەری هەلدا و حوکمدارانی ئەو ولاتەی لێخستن، بەلام هێندەی پێنەچوو کە خۆی و دارودەستەی قەلاچۆ کران. وەختایەک ئەو ناوچەیە بەرەورووی بۆشایی دەسەلات بووە و پادشای سەربەخۆی لێ نەما، سولتان سولەیمانخان، ڕۆستەمپاشای نارد و ئەویش گرتی و خوتبە و سکە بە ناوی ناوداری فەرمانڕەوا لێدران.

هەر لەم سالەدا شازادە سولتان مەحموود و سولتان مراد مردن و سولتان سولەیمانخان بۆ زستانەهەوار گەڕایەوە ئیستانبوول.

## سالی ٩٢٨ / ١٥٢١ ـ ٢٢

سەرەتای ئەم سالە سولتان سولەیمانخان بە مەبەستی گرتنی بەشێک لە خاکی فەڕەنگ لە ئیستانبوولەوە تەشریفی بردە ئێسکوودار و لەوێوە بەرەو ڕوودس بزووت و لە پێشدا گەمارۆی قەلای بەرزی دا کە سەری دەگەیشتە ئاسمان.

شاسمایل وەرزی زستانی ئەم سالە لە تەورێز بنەی دانا و بۆ چوونە هاوینەهەوار ڕووی کردە کوێستانی سەهەند. شازادەی کامڕەوا تۆماسبمیرزا لە خوراسانەوە بە خزمەت باوکی پایەبەرزی گەیشت و ئەویش بە دیداری ڕۆلەی خۆشڕوخساری گەشایەوە. ئەمیرخانی مووسلی تووشی نەخۆشییەکی سەخت بۆوە و شەوی یەکشەممۆی دوازدەی مانگی شابان بارگە و بنەی دنیای نەمێنی بۆ جیهانی هەرمان تێکنا.

## سالی ٩٢٩ / ١٥٢٢ ـ ٢٣

سولتان سولەیمانخان لە سەرەتای ئەم سالەدا پاش چوار مانگ گەمارۆی قەلاتی ڕوودس، بە هێزی شانوپیلی ئەم دژەی گرت و بە پشتیوانی خوا کافرانی

ئاوەژوو کردەوە و ئۆخژنی خستە دەروونی مسوڵمانان. دیارە لێرە بەم لاوە هەرچەند جارێکی ناوی سوڵتانی غازی هاتەگۆڕ مەبەست لە سوڵتان سولەیمانخانە. پاشان چەند قەلایەکی دیکەش لەم وڵاتە کەوتنە چنگ هێزەکانی میری.

ڕۆژێکی کوڕی شاسواری زولقەدر کەوتە سەربزێوی و دژی دەسەڵاتی سوڵتان ڕاپەڕی. فەرهادپاشای وەزیر کرایە سەرهێزی لەشکری باڵادەست و هەڵیکردە سەری و کوشتی و کاژەڵاکی ناردە ئاستانەی میری.

هەر لەم ساڵە «جانم» چرکەسی حوکمداری هەرێمی ڕۆژهەڵاتی میسر و ئینالی حوکمداری ڕۆژاوا، کەوتنە سەرهەڵدان و ڕاپەڕین. مستەفاپاشای وەزیر کە لەو خاکە بوو سپای لێ دەنگ دان و شەڕێکی قورسیان لە نێوانیدا قەوما. سەرەنجام کوشتنی و سەری براویانی ناردە کۆشک و سەرسەرای بەرزی کە شانی لە شانی ئاسمان دەساوی.

هەر لەم ساڵەدا شاسمایل لە تەورێز بنەی خست. شاقوڵی عەرەبگیرلووی مەیتەر، لەبەر ناخۆشەویستی و بوغزاندنی میرزا شاحوسێنی وەزیر، ڕۆژێک دوای تاریکان کە میرزا لە کۆشکەڵی هەشت بەهەشت لە خزمەت شاڕا دەگەڕایەوە مزڵی خۆی، لە پشتەوەڕا هەلینگی دایە و خەنجەرێکی لە مووغەرەی پشتی دا و هاواری کرد کە شا فەرمانی داوە قۆرچی ئەم بێژووە گۆڕەهوو کەن. لەڕێوە چەکدارانی بارگای میری دەرپەڕین و هرووژمیان بردە سەری و لەتوپەتیان کرد. شاقوڵی مەیتەر هەڵات و دوای چەند ڕۆژان گرتیانەوە و بە سزای ئەم کارە چەپەڵە کوشتیان. چایانسوڵتانی سەرۆکی سەردارانی شاهی مرد و خواجە جەلالەددین محەممەد جێی گرتەوە.

## ساڵی ٩٣٠ / ١٥٢٣ ـ ٢٤

ڕۆژی پێنجی جیمادی یەکەمی ئەم ساڵ شاسمایل لە زستانەهەواری نەخجەوانەوە بە مەبەستی ڕاوی کەرەکێوی ڕووی کردە شەککی و داگەڕا بۆ

ئەردەوێڵ و هاوینەهەواری بردە سۆلان. هەرەتی پایز دوای زیارەتی مەرقــەدی باب و باپیرانی خانەدانی خۆی، بەرەو تەورێز کشا. کاتێک گەیشتە «گریــوەی سایین»ی سەر بە سەراب، نەخۆش کەوت و حاڵی موبارەکی شێوا و تێکهەڵگلا و دەوا و دەرمانی گەورەحەکیمان چی بۆ نەکرا و بەرەبەیانی ڕۆژی دووشــەممۆی نۆزدەی مانگی ڕەجەب لەم کەپرۆکەی نەماوە ڕووی کردە سەرسەرای هەرمان.

میرێ کە چەشنی هەتاو بـاڵ و پــەڕی هەڵــداوە
تــۆز و غوبــاری زوڵــمی لـــە دنیــا وەلاداوە
بۆ ڕێکەوتی وەفاتی ئــەو پادشــای شــێرگەوزێن
لە لای پادشاهی دین «خوسرەوی دین»[1] نووسراوە

شازادە تۆماسبمیرزای یازدە ساڵانە کە لە ڕکێفی باوکیدا بوو، لە پاڵپشتی پادشایەتی پاڵی دایەوە. ئەویش چ پاڵدانەوەیەکی بەختیارانــە کــە نیزیکــەی شێست ساڵ بــە سەربەســتی فەرمانڕەوایــەتی کــرد. ئــەم شــازادەیە ڕۆژی چوارشەممەی ٢٦ی مانگی قوربانی ساڵی ٩١٩ی کۆچی لە «شائاباد»ی ئیسفەهان پێینابوویە جەغزی ژیان و ئەســتێرەی بــەختی لــە کــەلووی کــاوڕدا ســەری وەدەرنابوو. نابێ لە بیرمان بچێ کە وشەی «ظـل» بە حیسابی ئەبجەد لەگــەڵ ڕێکەوتی بە پادشا بوونی تۆماسبمیرزا ڕێکدێتەوە.

بەکورتی وەختایەک قۆشەنی چەشنی ئاسمان بێسنوور و بەشەوکەتی لە گریوەی ساییینەوە ڕووی کردە کوێستانی ســەهەند بــە تــەگبیر و ڕای میرانــی قزڵباش خواجە جەلالەددین محەممەدی وەزیــر و خواجە ئەدهەمی میرقەڵــەم

---

١ - «خسرو دین» بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە ٩٣٠.

کوژران. قازی جیهانی قەزوێنی کە یەکێک بوو لە گەورە سەیدەکانی سەفی حوسێنی قەزوێنی، شانازی پلەی بەرزی وەزیرایەتی بە بالای بڕا. میر قەوامەددینی حوسێنی، مەزنی مەزنانی ئیسفەهان و میر سەید جەمالەددینی شێرەنگی ئەستەرابادی بە جووتەسوارە بوونە سەرۆکی زانایانی ئایینی وڵات. دوای نەمانی شاسمایل، بایەزیدسوڵتانی کوڕی چایانسوڵتان کە لە جێی باوکی ببوو بە ئەمیریئەمیران مرد و مستەفابەگی مامی کە بە کۆپەکسوڵتان ناسراوە، لە پلەی بریکاریدا کرایە شەریکی دێوسوڵتانی ڕۆملوو.

## ساڵی ٩٣١ / ١٥٢٤ ـ ٢٥

سوڵتان سولەیمانخان بە خاترجەمی لە ئیستانبووڵی پایتەخت پاڵی دابۆوە و بە کەیف و نەهەنگ و شادمانی ڕایدەبوارد.

شاتۆماسب بنەی زستانەهەواری لە تەورێز و هاوینەهەواری لە سەهەند خست. دێوسوڵتانی ڕۆملوو کە بە بیانووی دەنگ و هەرای ئۆزبەکان چووبووە خوراسان، لەبەر ترسان و دڵەڕواکەی سەبارەت بە میرانی ئۆستاجلوو، ڕووی کردە ئێراق و لەوێ گەورەپیاوانی قزڵباشی وەک چووهاسوڵتانی تەکەلووی حاکمی ئیسفەهان، عەلیسوڵتانی زولقەدری حوکمداری شیراز، قەراجەسوڵتانی تەکەلووی حاکمی هەمەدان و بروونسوڵتانی حوکمڕانی مەشهەدی لەگەڵ خۆی کردنە هاودەنگ و گەڕایەوە تەورێز. کۆپەکسوڵتانی ئۆستاجلوو بە مەبەستی خۆگنخاندن شلەی دایە و هەتا «تورکمانکەندی» گەرمڕوود چوو بە پێشوازی میرانی ناوبراوەوە و وێکڕا ڕوویان کردە دەرانەی پادشایەتی. لە چەرەنداب شەرەفی پێوپلڕاماوسانی فەرمانڕەوایان پێبڕا و دوای دوو ڕۆژ قارنجەسوڵتانی ئۆستاجلوو و نارینبەگی قاجار کوژران. قازی جیهان لەسەر کارەکەی خۆی لادرا و لە قەڵای «لووری»دا خرایە سیاچاڵەوە و میر جەعفەری ساوجی کرایە وەزیر. وەختایەک کۆپەکسوڵتان بە کەتن و کەینەوبەینەی میرانی زانی بە بیانووی چوونە غەزای گورجستان خۆی لە بارگای میری قوتار کرد و

چووهاسولتان جێی گرتەوە و مۆری لەسەر حوکمان خۆی نواند. دوورمیش‌خانی حاکمی خراسانیش لەم ساڵەدا مرد.

## ساڵی ٩٣٢ / ١٥٢٥ _ ٢٦

لەم ساڵەدا سولتان سولەیمان‌خان بە مەبەستی گرتنی وڵاتی ئەنکرووس لە ئیستانبووڵ دەرکەوت و قەڵاکانی ئاونیک، پێترۆواردین و ئیلووقی بە چیرەچیڕ و زۆرەملی گرتن. دەبێ لە بیرمان بێ کە قەڵای ئیلووق (ئیلووک) ئەوەندە بڵیند تێهەڵچوو بوو کە شانی لە گومبەزەی شینەی ئاسمان دەدا. دژی «ئووسک»یش کە کەوتۆتە لێواری ڕووباری توونە گیرا. لە بەرینایی چۆمی دراوێ پردێکیان بە لۆتکەی تێکخراوی زنجیرکراو هەڵبەست و بەرەو بوودینی (پایتەختی مەجارستان) پەڕینەوە. قەڵاکانی ڕاچە، غەراغوریجە، بەرقاس، دیمترۆفجە، نۆکای، سووتین، لیقوار و ئۆروور گیران. قەراڵی ئەنکرووس (مەجارستان) بە مەبەستی بەرەنگاری و بەرپەرچدانەوەی سولتانی غازی لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر و زەوەندی کافرانی قوڕ بە سەر کەوتەڕێ و لە دەشتی مووهاچ هێزەکانیان بەرەوڕووی یەکتر بوونەوە و شەڕێکی بەگەرمە قەوما. سەرەنجام سروەی سەرکەوتن و باڵادەستی ئاڵاکانی سەرکەوتن‌نیشانی میری گیانفیدای غەزاکەری شەکاندەوە. قەراڵی بریندار سەری جڵەوی وەرسووڕاند و ڕەوی، بەڵام بەهەڵکەوت بە سەر ڕەوگەیەکی قوڕ و لیتەدا کەوت. قەراڵ گلی و کەوتەبەر هرووژم و پێخوستی لەشکری زاڵی سولتان و لاشەی ناپاکی وەبەر جەنجەڕی ڕۆژگار کەوت و بەرەو هەرێمی چارەڕەشی و مەینەتباری وزاقی بەست. دۆست و دوژمن لە یارانی ئیسلام و تاقمی تاریک‌پەرستان سەر و سۆراغیان نەدۆزییەوە.

دوای ئەم سەرکەوتنە مەشهوورە، قەڵای بۆدوون (بوودین)ی پایتەختی فەرمانڕەوایانی ئەنکرووس بە هەموو دەورانپشتییەوە کەوتە چنگ پیاوانی سولتان. هۆردووی نەپساوەی دنیاداگری بە سلامەتی و بە دەسکەوت و خەنیمەتەوە گەڕاوە شوێنی شەوکەتی.

هەر لەم ساڵەدا وەختایەک کۆپەکسوڵتان ون بوو لە چاوان، میرانی ڕۆملوو و تەکەلوو هەڵوێستی خۆیان گۆڕی، بۆیە کۆپەکسوڵتان بە ئامانجی دەمکوت و تەزاندنیان قلیجخانی کوڕی محەممەدی ئۆستاجلوو، مەنتەشاسوڵتانی شێخلەر، بەدرخانی شەرەفلوو و کوردبەگی شەرەفلووی لە دەورەی بەیداخی خۆی گرد کردنەوە و ڕووی کردە خەڵخاڵ. لە چێشتەنگاوی چاردەی شابان، لە شوێنێک بە ناوی سەکسەنجووک قۆشەنیان بەرەوڕووی یەکتر لە سان دا. قەراجەسوڵتان و برووونسوڵتانی تەکەلوو کوژران. خێڵی ئۆستاجلوو تەقورەویان تێکەوت و بەرەو تاروم ڕەوین و لەوێش ڕانەوەستان و پەنایان بردە بەر حاکمی ڕەشت. عەولاخانی ئۆستاجلوو وێڕای ئەحمەدبەگی کوڕی سۆفی و قازی جیهانی وەزیر کەوتنە دژایەتی کردنی تەکەلوو. ئاخرییەکەی ڕیزەکانیان لێکهەڵوەشا و قازی جیهان بۆ لای گیلان ڕۆیی و عەولاخان و سەرکردەکانی تر بەرەو خار و سمنان تێیانتەقاند. جارێکی دیکە سەرۆکانی ئۆستاجلوو یەکیان گرتەوە و لە گوندی «خەرزەویل»ی سەر بە تاروم بەرەوڕووی میرانی تەکەلوو بوونەوە، بەڵام خۆیان بۆ ڕانەگیرا و گەڕانەوە گیلانی بیەپەس.

زستانی ئەم ساڵ شاتۆماسب لە قەزوێن خێڵبەزی کرد.

### ساڵی ٩٣٣ / ١٥٢٦ ـ ٢٧

لەم ساڵەدا زوننوون ئۆغلی زولقەدر لەگەڵ سوڵتان سولەیمان کەوتە کەڵەوەکێشی و لێیهەڵتەزییەوە و لەو وڵاتە خراپەی زۆری کرد و بە مەبەستی چوونە خاکی قزڵباش بەرەو ئەرزەڕۆم کشا. یاقووبپاشای ئەمیریئەمیرانی ڕۆملی کەوتە شوێنی و لە ناوچەی پاسین گەیشتە سەری و کوشتی و سەری براوی ناردەوە ژێردەرانەی میری.

هەر لەم ساڵەدا «قەلەندەرشا»ناوێکی توخم و تۆرەمەی حاجی بەکتاش سەری بەرز کردەوە و داوای فەرمانڕەوایەتی کرد و کۆمەڵێکی بەرچاو

لێی کۆبوونەوە. برایمپاشای مەزنەوەزیر لەگەڵ قەپووخولقی هەڵیانکردە سەری و خاشەیان کێشا و متەقیان لێبڕی.

شاتەهماسب بە ئامانجی پەلاماردانی خوراسان گەیشتە ساوخبولاغ و میرانی ئۆستاجلووی بنەگری گیلان داوەرینە ئەردەوێڵ و بادنجانسوڵتانی ڕۆملووی حاکمی ئەوێیان کوشت و لەوێوە بەرەو نەخجەوان و چۆخوری سەعد کوتایان و خێڵ و باری دێوسوڵتانیان تالان کرد. کاتێک ئەم هەواڵانە لە ساوخبولاغ بە گوێی پادشا ئاشنا کران، لە پێشدا دێوسوڵتان و چووهاسوڵتانی بەرەو ئازەربایجان گاڵ دا و لە چۆمی ئارپەی دەوروبەری نەخجەوان لێیان بوو بە شەڕ. کۆپەکسوڵتان بە گوللەی گەرم ئەنگوا و گۆڕەهوو بوو. سەرکردەکان لەوێڕا گەڕانەوە کوێستانی گوێزەڵدەرەی سوڵتانییە و شەرەفی ژێردەرانە ڕامووسانی میریان پێبڕا. لەبەرەوەی هەوێنی ئەم کەتن و ئاژاوە و دووبەرەکی و نەحاوانەوەی قزڵباشان دێوسوڵتان بوو، چووهاسوڵتان دنەی شاتۆماسبی دا کە وەختایەک دێو پێی‌نایە دیوان بە تیرێک بیئەنگێوێ و سایری دەستوپێوەندەکان بە شیر و خەنجەران بکەونە وێزەی و لە خاکی ڕەشی نەمانی وەردەن. دەبێ هاوار بکا هەرکەسێکی دەوڵەتخوای منە نابێ لە کوشتنی دێودا خۆی کەنار بدا و کەترەخەم بێ. وا هەڵکەوت کە تیری تەگبیر، سەری چارەنووسی خوێندەوە و هەرکە دێو گەیشتە سەرسەرای کۆشکی پادشایەتی، شاتۆماسب تیرێکی تێهەڵکرد و سینگی پێکا و ئەگەرچی هێزێکی وای دەبەردا نەبوو، بەڵام هەتاکوو کلکەی ڕۆچوو. وەک پێشتر قسەی لێکرابوو بە لەبزی گەوهەرباری پیاوەکانی تێیوەرووکان و دێویان بە زەبری کێرد و شیران ڕیزاڵ بە ڕیزاڵ کرد. دەسەلاتی وی لەگەڵ حکوومەتی ڕەی بەخشرا بە سولەیمانبەگی ڕۆملووی میردیوانی دێو.

هەر لەم ساڵەدا ئەخیسوڵتانی تەکەلوو و دۆمەریسوڵتانی شاملوو لە ڕووکاری بەستام بەرەوڕووی عوبەیدخانی ئۆزبەک ڕاوەستان و کوژران.

حوکماتەکەی ئەخیسولّتان درا بە محەممەدبەگی کوڕی شەرەفەددین کە یەکێک بوو لە هاوڕێیانی چووهاسولّتان و نازناوی سولّتانی باربوو کرا. شا خێلّبەزی بردە قەزوێن.

## سالّی ٩٣٤ / ١٥٢٧ ـ ٢٨

لەم سالّەدا فەرمانفەرمای جیهان سولّتان سولەیمانخانی غازی بەوپەڕی خاترجەمی و سەرسووکی و ئۆخژنەوە، بەبێ دەرد و پەژارە و شاد و بەکەیف بەهار و زستانی سەردەمی پیرۆزی ژیانی لە قوستەنتەنییەی پایتەخت ڕابوارد و ڕێکوپێکی داموودەزگای میری و ئاوەدانی وولاتی ڕەچاو کرد.

ڕۆژی چوارشەممۆی نۆزدەی ئەم سالّە[1]، شاتەهماسب لە زستانەهەواری قەزوێنەوە ڕووی کردە هاوینەهەواری خەررەقان. زەینەلّخانی شاملوو یەکێک لە گەورەپیاوانی قزلّباش کە لە قەزوێن و هیرات و ئەستەراباد حکوومەتی دەکرد، لە کوێستانی فیرووزکۆ بنەی دانابوو. زینەش بەهادوری ئۆزبەک بە سەری دادا و لەگەلّ جگەرگەسولّتانی شاملووی حوکمداری سەبزەوار و مستەفاسولّتانی ئەفشاری حاکمی ساوە وێکڕای کوشتن. کاتێک ئەم هەوالّە بە گوێی موبارەکی پادشا ئاشنا کرا، کۆچاوکۆچ بەرەو خوراسان بزووت. چووهاسولّتانی تەکەلوو لە سولّتان مەیدانی دامغانەوە کەوتە پەیکەردەی زینەش بەهادور و لە نێو قەلّای دامغاندا گەیشتە سەری و کوشتی و سەری بڕاوی بەڕێکردە ژێردەرانەی فەرمانڕەوایەتی و ئالّاکانی میری ڕوو لە خوراسان شەکانەوە. دەشت و سەحرای جام چادر و چیغی هۆردووبەزی پیرۆزی چەتری لێئەنگاوت.

ڕۆژی چاردەی ڕەمەزانی ئەم سالّە زولفەقاربەگی کوڕی عەلیبەگ کە بە نۆکەسولّتان دەناسرا و ئەو دەمی حاکمی کەلّهوڕستان بوو، هێرشی بردە سەر برایمخانی مامی کە حکوومەتی بەغدای دەکرد و لەو کاتەدا بە شان و شەوکەتەوە

---

[1] - مانگەکەی دیاری نەکردووە، ڕەنگە مەبەستی یەکەم مانگی کۆچی بێ.

بە خۆی و دەهەزار سواری خەنجەروەشێنی پەنجە بە خوێنی تورکمان لە سەحرای ماهیدەشت، هۆرووبەزی کردبوو. لە جەنگەی قرچەقرچی نیوەڕۆدا کە جەماوەر لەبەر تین و بلێسەی گەرما لە ژێر خێوەت و سەیوانان‌دا خەریکی حەسانەوە و سەرخەو شکاندن بوون، بە سێسەد سوارەوە گەیشتە سەریان و برایم‌خانی لەگەڵ کۆمەڵێکی نیزیکانی لەتوپەت کرد و جڵەوی حکوومەتی بە دەستەوە گرت و ئاڵای هێز و دەسەڵاتی گەیاندە پۆپەی خۆر و مانگ. ئامۆزاکانی کە هەرکام حوکمڕانی یەکێک لە ناوچە و مەڵبەندەکانی بەغدا بوون، خۆیان بۆ ڕانەگیرا و بە ڕاکەڕاکە و هەوسارپساو پەنایان بردە بەر شووره و حەساری قەلاتی بەغدا. زولفەقار دوای سەرکەوتن و دەست بە سەر داگرتنی ماڵ و دارایی مام و ئامۆزاکانی بە خەیاڵی ئاسوودەوە لە ڕووکاری بەغدا خێوەتی هەڵدا و ئامێزی تێوەراند. وەختایەک ماوەی گەمارۆ گەیشتە چل ڕۆژ، کەیخودا و ڕیش‌سپی کەوتنە نێوان و وایان بڕیار دا کە زولفەقار دەس لە کۆڵ ئامۆزاکانی بکاتەوە و خوێنیان نەڕێژێ و ئەوانیش قەڵاکەی بە دەستەوە بدەن. پایەبەرزترینی گەمارۆدراوان کە سوڵتان مەعسوومبەگی کوڕی ئەمیرخان بوو لەگەڵ ئامۆزاکان هاتەدەر و چوونە دیداری زولفەقار و قەڵایان ڕادەست کرد. هەر ئەو ڕۆژە چەند نۆکەرێکی باوەڕپێکراوی پرچەکی خۆی لە ماڵێک حەشار دابوو. یەک‌یەک ئامۆزاکانی بە بیانووی خەڵات کران دەناردنە ئەو ماڵە و ڕاسپێراوەکان دەیانخنکاندن. نیزیکەی بیست کەسیان ئاوا کوژران و هیچیان بە هیچیان نەزانی و بۆسۆیان لە خانەدانی هەستا. بێجگە لە مەلیک قاسم کە باوکی لەبری خۆی بە مۆرداری حکوومەتی دانابوو و لە کوڕانی ئەمیرخانیش محەممەدیبەگی دە ساڵانە کە برای شیری شاتۆماسب بوو و وێڕای دایکی لە خزمەت ڕکێفی میری‌دا دەژیا، تایفەی گولابی‌لوو، نێرەوەزیان نەما.

## ساڵی ٩٣٥ / ١٥٢٨ ـ ٢٩

لە سەرەتای مانگی جیمادی یەکەمی ئەم ساڵەدا، خونکاری ئاڵمان و نەمچە(نەمسا) بە مەبەستی گرتنی وڵاتی ئەنکرووس(مەجارستان) لەشکری دەنگ دا و قەڵای بوودینی گرت. سوڵتان سولەیمانخان بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی لە ئیستانبووڵەوە پێینایە ڕکێف و تەشریفی سەرکەوتووانە گەڕایەوە ناوەندی دەسەڵاتی.

هەر لەم ساڵەدا عوبەیدیللاخان و تێکڕای میرانی ئۆزبەک بە ئامانجی بەرەڕووبوونەوەی شاتۆماسب و گرتنی هەرێمی خوراسان و ئەوبەرڕووبار بزووتن. شاتۆماسبیش بە مەبەستی پێدادانیان ئەسپی خۆشاژۆی بەرەو خوراسان ئاژاوت. کاتێک گەیشتە مەڵبەندی جام لە گوندی عومەراوا، ڕۆژی شەممۆ یازدەی مانگی محەررەم هێزەکانیان تێکهەڵەنگووتن. هەردک تاقم وەکوو کێو لە بەرامبەر یەکتردا ڕاوەستان. سەرەتا قۆڵی ڕاست و چەپی لەشکری قزڵباش شکستی تێکەوت و چووهاسوڵتان و ئەمیرانی ئەفشار سەری جڵەویان هەڵەنگاوت و هەڵاتن و ئۆزبەک کەوتنە دوویان. عوبەیدیللاخان لەگەڵ ژمارەیەکی کەم چەکدار شەڕەکەی بەجێنەهێشت. کاتێک تەپوتۆزی سپای شەڕخواز نیشتەوە، قزڵباش تەماشایان کرد کە ئۆزبەک کەوتوونە پەیکەردەی قۆشەن و عوبەیدیللاخان وێڕای پۆلەسوارێک بەرەوڕووی جەماوەری بەرچاوی سەرسووران ڕاوەستاوە. دلێرانی قزڵباش بەجارێک هرووژمیان بردە سەری و لە جێی خۆیان هەڵکەند. یەکێک لە چەکدارانی میری گەیشتە سەر عوبەیدیللاخان و شیری داهێنایە کلاوزرێی و لێی ڕەت بوو و نەیزانی. هێزەکانی دیکە کۆمەڵی ئۆزبەکانیان هەتا سفیدکۆ(کێوەسپی) هەڵبڕی و گەڕانەوە. دین قلیچی بەهادور و هاوڕێیان و چەند خانێکی ئۆزبەک، عوبەیدیللاخانیان لەو هەڵلایە دەرباز کرد و هەتا مەرو لە هیچ جێیەک وچانیان نەدا. وەختایەک شاتەهماسب ئەم سەرکەوتنە گەورەی وەچنگ هێنا، بۆ ماوەی مانگێک لە ئۆلەنگی شەقابادی جام

كە ناوی بە ساروقامیش ڕۆیشتووە، لەنگەری خست. لەوێوە تەشریفی بەرەو ئێراق ڕۆیی و وەرزی زستان لە قوم بنەی داکوتا. سەرەبەهارێ بە مەبەستی دەمکوتی زولفەقار کە زۆری شوو لێهەڵکێشابوو و بانگەشەی فەرمانڕەوایەتی دەکرد، بەرەو بەغدا پێی‌نایە ڕکێف. هەر ئەوەندەی هێزی قزڵباشان ئاڵای سەرکەوتنیان گەیشتە ڕووکاری بەغدا، خێرایەکی ئابلۆقەی شاریان دا. پاش چەند ڕۆژ گەمارۆ قۆشەنی سەرسووران لەبەر تین و بڵێسە و برژەبرژی گەرما حەجمینیان لێهەڵگیرا و میران و سەرۆکانی دامودەزگای پادشایەتی ڕۆیشتن و نەمانەوەیان بە بەرژەوەند زانی و بڕیاریان دا کە گەمارۆ بخەنە وەرزی پایز و زستان و ئێستا بچنە کوێستانان. بەڵام لەم جەنگەدا «عەلی‌بەگ»ناوێکی نەتیژەی سۆفی خەلیل کە یەکێک بوو لە باوەڕپێکراوان و مەزنانی زولفەقار ئەو شەوە وێڕای دووسەد کەس لە داروودەستەی خۆی کە پاراستنی حوکمڕانی لە ئەستۆ بوو، لەگەڵ ئەحمەدبەگی برای دەستی تێکگرت و لە شیرن‌خەودا سەری زولفەقاری بڕی. پاشان دەروازەکانی بەغدای خستنە سەر گازەرای پشت و چووە خزمەت شاتۆماسب. هەموو تیرە و تایفەکانی تورکمان سەریان وەبەر هێنا و تاقمێکی کەم لە خزمانی نیزیکی زولفەقار ڕایانکرد. حکوومەتی ئەو هەرێمە درایە دەست محەممەدخانی تەکەلووی کوڕی شەرەفەددین. لە کاتی گەڕانەوەدا عەلی‌بەگی کوڕی مەلیک‌بەگی خۆیی کە بە شاترعەلی ناسرابوو لە چیمەنی فارسچینی ئەبهەری عێراق سزادرا. عەلی‌بەگی تۆرەمەی سۆفی خەلیل پلە و دەسەڵاتی درایە و بە عەلی‌سوڵتانی زولفەقارکوژ ناودێر کرا.

## ساڵی ٩٣٦ / ١٥٢٩ ـ ٣٠

سوڵتان سولەیمان‌خانی غازی بە کەڵەمێردی و ئازایەتی قەڵای بوودین و بوتاق‌حەساری داگیر کرد و ئەسپی تیژبەزی بەرەو قەڵای بەچ تاو دا. خونکاری بە ڕەگەز نەمساوی (ئۆتریشی) لە «بەچ»ی ناوەندی دەسەڵاتی هاتەدەر و پاراستنی ئەو دژەی ئەسپاردە دەستی کۆمەڵێک و بۆخۆی بەرەو لایەکی وڵات

ڕۆیی. بەڕاستی گەمارۆی قەڵاکە دەستی نەدەدا، چونکە ڕووبارێکی گەورەی دووقۆزاخە چەشنی خەندەک باوەشی تێوەراندبوو و چەند شوورەیەکی پێچاوپێچ بە دەورەیدا لێهاڵابوونەوە. دوای پازدە ڕۆژ مانەوە لە ڕووکاری قەڵا، لەبەرووەی هیچ شوێنەواری سەرکەوتن و گیران خۆی نەنواند و پەلاماری لێکدالێکدای کافرانی چارەڕەش تەنگیان بە هێزەکانی سوڵتان هەڵچنی و قۆشەنی سەرماوسۆڵ سەری لە سوێکە وەدەرنا، بەناچار سوڵتانی غەزاکەر دەستی لەم کێشەیە هەڵگرت. فەرماندەیەک بە ناوی قاسمبەگ کە سەرکردایەتی هێزێکی دوازدەهەزار کەسەی «ئاقنجی» تورکی ڕۆملی دەکرد، کرایە بەرپرسی تاڵان و دامالینی مەڵبەندی بەچ و خۆی بەختیارانە گەڕایەوە پایتەخت. تەواوی کافران کەوتنە هەڵچنینی قاسمی ویووده(فەرماندە) و کەس دەستی نەکردە هێزە باڵادەستەکان، بەڵام قاسم و هاوڕێیانی بوونە بەردی بن گۆم.

هەر لەم ساڵەدا ئەمیرانی ئۆستاجلووی وەک بەدرخانی شەرەفلوو، مەنتەشاسوڵتانی شێخلەر و هەمزەسوڵتانی ناسراو بە قازق هەمزە کە لە گیلانی بیەپەس سەریان وەبەر دەسەڵاتی سوڵتان موزەففەر هێنابوو، بە دڵخۆشیدانەوەی چووهاسوڵتان لە شەرەفاوای قەزوێن گەیشتنە ژێردەرانەڕامووسانی شاتۆماسب. هەرکەس لە پێی خۆی بە سەرکرایەوە و ناوچەی دەسەڵات و پلەیان بۆ دیاری کرا. ڕۆژێکی میر قەوامەددین حوسێنی سەدری شێرەنگی ئەستەرابادی (؟) کۆچیدوایی کرد و میر غەیاسەددین مەنسوور جێگای گرتەوە هەتا لەگەڵ میر نیعمەتوڵڵا کارەکان ڕاپەڕێنن. ئاڵاکانی میری بە مەبەستی هەسدانەوەی ئۆزبەکان بەرەو خوراسان هەڵدران و سەرۆکانی ئەم هۆزە کە لە مەرو کۆببوونەوە بە جارێک دەستیان لێکبەردا و بە شپرێوی ڕوویان کردە ئەوبەرووبار. حکوومەتی هیرات بە ناوی بارامیرزا تۆمار کرا و غازیخانی تەکەلوو کرایە لەلەی. هۆردووی پادشایەتی بە ڕێگای تەبەسدا گەڕایەوە عێراق و لە ئیسفەهان بنەی داکوتا.

## ساڵی ٩٣٧ / ١٥٣٠ ـ ٣١

سەرەتای ئەم ساڵە سوڵتان سولەیمانخان بە ئارمانجی گرتنی وڵاتی نەمسا لە ئیستانبووڵ دەرکەوت و لە «حەلقلوو بیکار» ڕکێفی بەتاڵ کرد.

هەر لەم ساڵەدا ئۆلمەی تەکەلوو حەوتهەزار کەسی لە خۆی کۆکردەوە و ویستی کە بە خزمەت شاتۆماسب بگا و لە جێی چووهاسوڵتان ببێتە مەزنەوەزیر. شاتۆماسب بەم لووتبەرزییەی زانی و بەپرتاو کەوتە سەری و ئۆلمە وەختایەک لە هرووژمی میری ئاگادار بۆوە، بەرەو وان ڕەوی و سەری وەبەر دەرگای سوڵتان سولەیمانخان هێنا، هەروەکوو پێشتر لە بەشی چوارەمی[1] سەبارەت بە حاڵوباڵی میر شەرەفدا باسی کراوە.

لە کۆتایی ئەم ساڵەدا میرزا بابوری کوڕی میرزا عومەرشێخ کوڕی میرزا سوڵتان ئەبووسەعیدی کوورەگان کە پادشای سەربەخۆی هیندووستان، غەزنەین، کابول و قەندەهار بوو مرد و میرزا هومایوونی کوڕی جێگەورە و خانەدانی جێی گرتەوە.

## ساڵی ٩٣٨ / ١٥٣١ ـ ٣٢

سوڵتان سولەیمانی غازی هەرێمی بدلیسی بە شێوەی بەگلەربەگی بەخشی بە ئۆلمەی تەکەلوو. وەکوو پێشتر باسی کراوە و کەوتۆتە بەر تیشکەی ڕووناکی[2]، ئۆلمە (ئۆلاماخان) وێڕای سەرۆکی سەردارانی مەرعەش و دیاربەکر هێرشی کردۆتە سەر قەڵای بدلیس و گەمارۆی داوە. شەرەفخانی حوکمڕانی بدلیس پەنای بردۆتە بەر شاتۆماسب و ئەویش لەبەر خاتری وی ڕووی کردۆتە ئەخلات و فیل یاقووبی ئەمیرئەمیرانی دیاربەکر و ئۆلمە تۆقیون و دەوری

---

١ - مەبەستی لە بەشی چوارەمی بەرگی یەکەمە و هەڵبەت بەشی سێهەم دروستە.

٢ - ئاماژەیە بە بەشی سێهەمی بەرگی یەکەم.

قەلاتیان بەرداوە و هەلاتوون و هێزی پادشایەتی گەڕاوەتە تەوریز و لەوێ بارگە و بنەی خستووە.

لە کۆتایی ئەم سالەدا هەوالی گەمارۆدرانی بارامميرزا لە شاری هیرات لە لایەن عوبەیدخانی ئۆزبەکەوە بە گوێی پادشا گەیشت و ئەویش بەرەو خوراسان بزووت.

## سالی ۹۳۹ / ۱۵۳۲ ـ ۳۳

سەرەتای ئەم سالە سولتان سولەیمانی غازی گەمارۆی قەلای «کووسەک»ی دا و خەندەکی دەورەی بە دەستی هێزە هەمیشە بالادەستانی سولتانی بە چرپیوچال و داروبار پڕ کرایەوە و قەلانشینان هاواریان هێنا کە مەمانکووژن و ئامان و سەد ئامان، ئەمەش کلیلی قەلایە.

هەر لەم سالەدا قەلاکانی قابوولنە، پاپووزچە (پاپووچع)، بیلەوار، بەرزەنجە، ئەرشاک، بەلەشکورد، نەشاروار، شێقلووش (شیکلووش) و قەپوورناق سەریان وەبەر دەسەلاتی سولتان سولەیمانخان هێنا. ولاتی نەمسا و خۆرواتی تالان کردن و هەموو ئاوەدانییەکانی سووتاندن و گەلێک غولام و کەنیزی ڕوخساریپەری بە یەخسیر هێنان. مال و سامان و خەزێنە و کەلوپەل و مەڕ و مالات و زێڕ و زێوێکی لە ڕادەبەدەر کەوتە چنگ هێزە ئازاکانی سولتان. لە کاتی گەڕانەوەدا ڕاسپێراوانی خونکاری ئالمان و نەمسا گەیشتنێ و بە تکا و پاڕانەوە بۆ ماوەی سێ سالان سەرانەی لادینانەیان پێوەبەسترا.

ئەحمەدپاشای وەزیر کە بە خۆی و هەشتا لۆتکە و کەشتی چووبووە سەفەری دەریایی، توانی قەلای «قۆروون»ی موورە (موورووە) بگرێ و فەڕەنگی کە بە سواری پاپۆڕان دەورەیان دابوو هیچیان بۆ نەکرا و بە کامڕەوایی گەڕایەوە.

ڕۆژی سێشەممۆی چواری شابانی ئەم سال قومێش ئۆغلانی ئۆزبەک بۆ دۆزینەوەی جێ هۆبە و هەوار و لەوەڕگە ڕووی کردە ناوچەی ڕەی و خێل و مالی

محەممەدخانی کوڕی زولقەدری حاکمی ئەستەرابادی لە مێرگ و مێرغوزاری ساوخ‌بولاغ ڕادا و تالانی کرد و محەممەدخان بە سواری ئەسپێکی ڕووتی بێزین توانی نیوەگیانێک لەم شەڕ و گەڕە دەرباز بکا.

هەر لەم ساڵەدا شاتۆماسب، حکوومەتی شیروانی باربووی ئەلقاس‌میرزای برای کرد و بەدرخانی ئۆستاجلووی کردە لەلەی.

مەحموودبەگی زولقەدری مۆردار لە کاتی ڕمبازێن و تەقڵە و جلیت‌دا لە مەیدانی ساحیب‌ئابادی تەورێز لە سواری ئەسب فڕێدرا و ملی شکا و شاقولی خەلیفەی زولقەدر جێگای گرتەوە. میر حکوومەتی تەورێز و پاراستنی ئازەربایجانی خستە ئەستۆی مووساسوڵتانی مووسڵی و بەهەشتاو بۆ دەمکوت و دەرپەڕاندنی ئۆزبەکان بەرەو خوراسان خوشی. ئۆزبەک چوونە ئەوبەرڕووبار و شا لە هیرات خێڵبەزی کرد. بەهاری ئەم ساڵە بە نیازی چوونە ئەوبەرڕووبار ماوەی چل ڕۆژان لە ئۆلەنگی کەهدستان بنەی خست. هەتا شەوێکی کە ئەو پادشا بڕوا پتەوە ئەمیری مسوڵمانان واتە حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبووتالیب خودای لێ ڕازی بێ، چووە خەوی و پێی‌گوت مەچۆ ئەوبەری ڕووبار، چونکە کاری گرینگی تۆ لەم‌بەرەیە. خۆت لە کاری ناشیاو لادە و تۆبەی بکە و چاوت بە سەر حەقوێردی تورکمانەوە بێ کە یەکێکە لە نەوە و نەتیژەکانی شێخ جونەید. وەختایەک لە خەو هەستا خێرایەکی ڕووی کردە مەرقەدی نوورانی ئیمام ڕەزا، ڕەحمەتی خودای لێبێ و لە دەوری گەڕا و زیارەتی بەجێهێنا. هەر لەوێ تۆبەی کرد لە هەر کارێکی بەرگێڕەوی لەسەر داندراوە و بە چەشنێک ڕابواردن و ئاکاری دژی ئایینی قەدەغە کردن کە فەرمانی دا خواجە شاقولی سەرکردەی قۆرچییان و یەکێک لە ئەمەگدارانی ئەو بارەگایە لەگەڵ مەحموودبەگی ئێشک‌ئاقاسی تورکمان ئەنووک ئۆغلی بگیرێن و لە دار بدرێن و پیالەی شەرابیان بە ئەستۆدا هەڵاوەسرێ. پاشان حکوومەتی هیراتی نایە بەردەستی سام‌میرزای برای خۆی و ئۆغزی‌وارسوڵتانی

کوڕی دۆمەریسولتانی شاملووی کردە دەمڕاستی. حکوومەتی شیرازی لە هەمزەسولتان ئەستاندەوە و بەخشی بە غازیخانی برای سولتان خەلیلی زولقەدر.

## ساڵی ٩٤٠ / ١٥٣٣ ـ ٣٤

لەم ساڵەدا شەرەفخانی حاکمی بدلیس کوژرا و ئۆلمە هەواڵەکەی ناردە ئیستانبووڵ. سولتان سولەیمانخان بە هاندانی ئۆلمە، برایمپاشای مەزنەوەزیری کردە سەرکردەی سپا و ناردی بۆ گرتنی ئازەربایجان. برایمشا هەتا حەلەب بەرەوپێش بزووت و لەوێ هۆردووبەزی کرد.

شاتۆماسب هێشتا لە شاری مەشەدی پیرۆزی ئیمام ڕەزا بوو کە خەبەری کوژرانی شەرەفخان و چوونی ئۆلمە و برایمپاشای بۆ ئازەربایجان پێگەیی؛ هەر بۆیە بە غار بەرەو عێراق و ئازەربایجان سەرەوخوار بۆوە.

## ساڵی ٩٤١ / ١٥٣٤ ـ ٣٥

سولتان سولەیمانخانی غازی بە مەبەستی هاریکاری و یاریدەدانی برایمپاشای وەزیر کە پەیتاپەیتا ڕایدەسپارد شاتۆماسب لە خوراسان گەڕاوەتەوە و بەرەو ئازەربایجان دەبزوێ، قۆشەنی لە ئیستانبووڵەوە دەنگ دا. ٢٩ی مانگی ڕەبیعی یەکەم کە ١٢٣ ڕۆژ لە هاتنەدەرەوەی تێپەڕیبوو، لە کوێستانی ئۆجان سینگی تاوڵ و خێوەتی لەشکری داکوتران. برایمپاشای وەزیر لەگەڵ سەرۆکان و سەرداران بەتایبەت وێڕای سولتان موزەففەری حوکمداری گیلانی بیەپەس کە ئەو کاتی وێڕای پێنجهەزار سوارە و پیادە لە تەورێز دابوویە پاڵ هێزەکانی سولتانی، شانەبەرزەی ڕایەخڕامووسانی فەرمانڕەوایان پێبڕا.

شاتۆماسب، محەممەدقولی خەلیفەی شاملووی ناسراو بە کوڕی خەلیفەی لەگەڵ مەنتەشاسولتانی ئۆستاجلووی پێشەنگی لەشکری بەرەو ئازەربایجان بەڕێکرد و خۆی بیست و یەک ڕۆژ پاشی ئەوان گەیشتە کۆک گونبەدی و چەند ڕۆژێک لەبەر شەکەتی یەکسمان وچانی دا. ئەلقاسمیرزا، بارامیرزا،

حوسێنخانی شاملوو، غازیخانی تەکەلوو، مەلیکبەگی خۆیی، ئەمیرسولتان و سولەیمانسولتانی ڕۆملووی وەکوو بەرایی لەشکر ناردنە ئازەربایجان. خۆی دوابەدوایان بزووت و خێڵ و ماڵی لە قەزوێن دانا و لە قەرئاغاجی ئەبهەر بنەی داکوتا. لەوێوە پێشەنگان خەبەریان بۆ ناردەوە کە سولتانی غازی دوابەدوای برایمپاشا گەیوەتە تەورێز. شاتەهماسب بەرەو سولتانییە ڕۆیی و ئەو دەمی تەنیا حەوتهەزار قزڵباشێک لە خزمەت ڕکێفیدا بوون و تەنیا سێهەزار سەر یەکسمی بەکار لە هۆردووی شاهیدا خۆی دەنواند. سولتان سولەیمانخانی غازی لە تەورێزەوە ڕووی کردە سولتانییە و لە ڕێگادا کە سەرەتای مانگی خەزەڵوەر بوو هەڵیکردە تۆف و بەند و بەفرێکی قورس باری. کەشێکی هێندە ناخۆش پەڕی هەڵدا کە ئەسپ و ماین و یەستر و وشتر و خزمەتکارێکی زۆر کەسیرە بوون و ڕەقهەڵاتن و لەبەر بێتفاقی و بێخۆراکی تێداچوون. قۆشەنی باڵادەستی سولتانی بە زللەی سەرما هێندێک تەزی و تاسا و لە ڕێگەی دەرەگەزین و هەمەدانەوە بەرەو بەغدا ڕۆیی.
محەممەدخانی کوڕی زولقەدری حاکمی تاروم و خەڵخاڵ کە ئەو کاتی وێڕای قەیاسولتانی زولقەدر و حوسێنسولتانی تەکەلووی کوڕی بروونسولتان و سێهەزار سوارێکی قزڵباش لە شاتۆماسب هەڵگەڕابوونەوە و لە خاکی سولتانییە چووبوونە ڕایەخڕامووسانی سولتان، لەگەڵ ئۆلمە و میریمیرانی دیاربەکر پاراستن و ڕاگرتنی ئازەربایجانی پێئەسپاردن. بۆخۆشی بەرەو بەغدا کشا و محەممەدخانی کوڕی شەرەفەددین بەپێی ئاماژەی شاتۆماسب ئەم شارەی چۆڵ کرد و بە ماڵ و منداڵ و دەستوپێوەندەوە بە سواری کەشتی چوو بۆ لای شووشتەر. سولتان سولەیمانخان بێئەوەی تووشی هیچ قڕە و کێشەیەک بێ و کەس دەستی لەبەر بکاتەوە ناوەندی دەسەڵاتی گرت. پیاوماقووڵانی هەرێمەکە لەوێوە چوونە دەرانەڕامووسانی و سەریان وەبەرهێنا. پاش ئەوەی ئاپۆرای بە شان و شەوکەتی سولەیمانی لە

بەغدا خۆی نیشان دا، کلیلی قەڵاکانی شارەبان، هارووننییە، داقووق، کەرکووک و حللە لە لایەن دژدارانەوە کرانە پایەندازی بارەگای میری. ڕۆژی یەکەم کاتێ سوڵتانی غازی و خاقانی مەزن کە گەردوون وەکوو غولامان بۆی دووقەد دەبێتەوە پێی‌نایە شاری هێمنی و بنکەی خەلافەت، چووە زیارەتی مەرقەدی پێشەوای گەلان و ئیمامی گەورە ئەبووحەنیفەی کووفی. پاشان ڕووی کردە تەوافی گڵکۆی ترووسکەداری سەرتۆپی خانەدانی محەممەدی، ڕووگەی پەیڕەوانی عەلی، دوڕ و مەرجانی دەریای ئەوین، مووسا کازمی خواپەسند و گەلێکی خێر و خێرات بە سەر هەژاران و مسکێناندا دابەش کرد و لەوێ بنەی داکوتا.

لەم جەنگەدا شاتۆماسب هەلەکەی بە لەبار زانی و خۆی بە دوژمنی بێگانەوە نەخافلاند و حوسێن‌خانی کوشت کە لەمێژ بوو ناخۆشی دەویست. هێرشی بردە سەر ئۆلمە لە تەورێز و غازی‌خانی تەکەلوو لە وەختی هرووژمەکەدا لە توورەیی شا تۆقی و ڕیزی هاوڕکێفانی میری بەجێهێشت و هەڵات و خۆی گەیاندە ئۆلمە و هەواڵی هەڵمەتی شاتۆماسبی لە لا درکاند. ئۆلمە هەر کە ئەم خەبەرەی بیست بۆسێ‌ودوو تفە دەستەی لێکرد و قەڵای شەنبی غازانی بە چۆڵەواری جێهێشت کە تازە کەڵتە کرابۆوە و بەرەو قەڵاتی وان ڕەوی و لەوێ پەنای گرت. شاتەهماسب دوای بیست ڕۆژان لە تەورێزەوە ڕووی کردە وان و ئۆلامەی دەورە دا. هەتا کلکەی زستان گەمارۆ درێژەی کێشا و هێندەی نەمابوو کە قەڵاکە بگیرێ کە لەپڕ لە لای عێراق و فارسەوە خەبەر هات وا سامیرزا یاغی بووە و سەری وەبەر سوڵتانی غازی هێناوە و فەرمانڕەواش کردوویەتە کوڕی خۆی و حکوومەتی ئێرانی باربوو کردووە و لە سایەی ئەم ڕووداوانەوە هێزەکانی قزڵباش لێکترازاون. بۆیە بەناچار شاتۆماسب دەورەی قەڵای وانی بەردا و ڕووی کردەوە ئێراق.

لە ئاخری ئەم ساڵەدا سوڵتانی خەزاکەر لە هۆردووبەزی بەغداوە هەستا و بە مەبەستی گرتنی ئازەربایجان بزووت. لەم کاتەدا غازیخانی تەکەلوو سەری وەبەر دەرانەی هێنا و ناوچە و مەڵبەندەکانی لوڕستان، کەڵهوڕستان، جزیرە و واست و خاکی عەرەبەکانی موشەعشەع کەوتنە ژێر نیری دەسەڵاتی سوڵتانی و خوتبە و سکەی بە ناوی ناوداری لێدرا. لە مەودای ڕێگادا حاکمی سۆهران (سۆران) چونکە لەگەڵ سەرسووران پەیمانی یەکێتی بەستبوو، سزا درا و کوژرا. لەوێوە بەڕێی «ئاڵتوون کۆپری»دا بەرەو تەورێز تێپەڕی.

## ساڵی ٩٤٢ / ١٥٣٥ ـ ٣٦

سەرەتای مانگی محەررەم سوڵتان سولەیمانخانی غازی پێینایە تەورێزی پایتەخت. شاتۆماسب بە مەبەستی ئاشتی و پێکهاتن کەیخودا و ڕاسپاردەی ناردن. سوڵتان سولەیمان گوێی بە داواکەی نەبزووت و بەرەو ئەرجیش و ئەخلات لەشکری ئاژاوت. وەختایەک شاتۆماسب بیستی کە سوڵتانی غازی لە تەورێز نەماوە و بەرەو ڕۆم کۆچ و باری لێناوە، هاتە مەرەند و خۆی و لەوێوە مەنتەشاسوڵتان، ئەمیربەگی ڕۆملوو، شاقوڵی خەلیفەی مۆردار، بوداقخانی قاجار، سەدرەددینی ئۆستاجلوو و محەممەدئەمینبەگی سفرەچی تورکمانی بە سەرکردایەتی بارامیرزا ناردنی بە شوێن سوڵتانی غازی دا و فەرمووی بکەونە پەیکەردەی. خۆی لە قەرانقوودەرێ سەرقاڵی ڕاوەماسی بوو کە هەر ئەو ڕۆژە خەبەری بۆ هات ئۆلمە لە وانە. بەناچار لەوێوە ئەسپی لینگ دا و لەو دەمەدا تۆزە تینێکی لە جەستەی گەڕا و دوای ڕۆمرکانی تا و یاوی لەشی بۆ وچان یان بۆ نەرمەهەنگاوی بەپارێز لە دەوروبەری خانەقای مەلا حەسەن لەنگەرێکی گرت و قەیاپابەگی قاجار و شێرحەسەنی ئیمووری بە سی سواری دڕ و ئازاوە ناردن هەتاکوو بزانن خەبەر چیە. لە مانەوە هەواڵی بۆ هاتەوە کە ئۆلمە وانی چۆل کردووە و ڕۆیشتووە. بۆ بەیانی کۆچی لێنا و لە ڕووکاری وان ڕکێفی بەتاڵ فەرموو. ڕاست لەو دەمەدا خەبەری بۆ هات کە ئەو میرانەی چووبوونە یاریدەی

بارامیرزا، لەگەڵ حاجیبەگی دونبلی کە دوابەدوای قۆشەنی سوڵتان دەبزووت تێکهەڵچوون و دووسەد و پەنجا کەسیان لێ کوشتووە و بۆخۆشی بە هەزار ناری عەلی گیانی لەو گەرداوە خوێنخۆرە دەرباز کردووە.

سولەیمانخانی غازی، برایمپاشای وەزیری بە سەرکردایەتی سیهەزار سوارەوە ناردە بەرەنگاربوونەوە و سەرکوتی بارامیرزا لە ئەرجیش و پاشا بێ شەڕ و لێکدان گەڕایەوە. پاشان سوڵتانی خەزاکەر محەممەدپاشای میریمیرانی دیاربەکری وێڕای ئۆلمە ساز کرد و ناردی بۆ پاراستنی قەڵاتی وان. شاتۆماسب بە چوونی ئەوانی زانی و لە وانەوە بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەیان بەرەو کواش و ئەختەمار ئەسپی تاو دا. ئۆلمە پێیزانی و وێڕای محەممەدپاشا هەڵات بۆ لای دەرەکیسان و گریوەی کواش کە لەو ڕۆژەوە بە قشوونقڕان ناوبانگی ڕۆیی. قوڵچییەکانی تورکمان کە بەیداخداری سپای شاهی بوون، عوسمان شاقوڵی سەرلک و قەرەسمایل و کۆر شاسوار گەیشتنە سەریان و پۆلێک لە پیاوانی کارامەیان لێ کوشتن و بە دیلیان گرتن. ئۆلمە و محەممەدپاشا بە هاڵۆزکاوی و شپڕێوی لە ئاوایی تاتوانی بدلیس خۆیان گەیاندە هۆردووی سوڵتانی و لەم وەختەدا هێزی شکۆداری میری لە ئەخلاتەوە بە ڕێگای مووشدا دەچوو بۆ لای دیاربەکر.

سوڵتانی غازی حکوومەتی بدلیسی لە میر شەمسەددینی حاکمی ئەو شوێنە وەرگرتەوە و لەجیاتیان دەسەڵاتی مەلاتییەی مەرعەشی باربوو کرد. حوکمات وماڵ و سامانی بدلیسی بەخشی بە ئۆلمە و لە دیاربەکرەوە بەرەو قوستەنتەنییەی پایتەخت بزووت و لەوێی لەنگەر گرت.

شاتۆماسب ناوچەی ئەرجیش و وانی خستە ژێر ڕکێفی و ئەحمەدسوڵتانی ئۆستاجلووی لە قەڵاتی وان کردە دژدار. ئەلوەندخانی ئەفشاری حاکمی کۆهگیلۆیە کە خەریکی سەربزێوی و گوێنەبیستی بوو، گزیری میر کوشتی. مەڵبەند و سپای ژێرفەرمانی کردە خەڵاتی محەممەدیبەگی کوڕی

حەسەنسولتاني كوڕەزاي ئەفشاري مەنسوور و نازناوي شاروخخاني بە بالاي بڕي و گەڕايەوە تەورێز. قازي جيهاني قەزوێني حوسێني كە چەند ساڵێك لە گيلاني ڕەشت گيرابوو، هاتە دەرانەي پادشايەتي و بە لوتفي فەرمانڕەوايانە لاوێندرايەوە و تاجي شانازي كرايە سەري و پلەي بەرزي وەزارەتي پێئەسپێردرا. سولتان موزەففەري حاكمي گيلاني بيەپەس كە ناوي ئەميرە ديباج بوو و لە ترسي هەڵمەتي پادشايەتي بەرەو شيروان ڕەويبوو، لەوێ گيرا و بەڕێكرايە تەورێز. بەپێي فەرماني مير لە قەفەزي دارينەيان پەستاوت و لە منارەي مزگەوتي گەورەي موزەففەرييەوە هەڵيانواسي و نەفتيان پێداكرد و سووتانديان.

مانگي ڕەمەزان برايمپاشاي مەزنەوەزيري سولتاني كە لە سەفەري خاكي عەجەمدا كرابوويە سولتان برايمپاشا، فيز و هەوا لە كۆشكي مێشكيدا ڕەنگي دابۆوە، كاري سەيري دەكردن. بۆ وێنە فەرماني دابوو كە لە خوتبە و سكاندا ناوي شانبەشاني ناوي سولتان بێ. بۆيە شەوێك لەسەر پێوشوێني جاران كە لە سەراسەري ئاوەداني سولەيمانيدا خەريكي بادەنۆشي و ڕاكشان و حەسانەوە بوو، دەرفەتيان لێهێنا و سولتاني غازي لەگەڵ بۆستانچيباشي چوونە سوێي و لە ناخافڵ كوشتيان و مەيتەكەيان لە باخچەي كۆشكا شاردەوە و كەس بە سەر و سۆراغي نەزاني.

## ساڵي ٩٤٣ / ١٥٣٦ ـ ٣٧

لەم ساڵەدا سولتان سولەيمانخاني غازي بە مەبەستي تەمێكردن و گوێباداني ڕەگەزي ئەرنوود (ئەرنيدوو)، خێوەت و سەيواني بڵيند و بەشەوكەتي كە سەريان دەگەيشتە ئاسمان، لە ئيستانبوولي پايتەختەوە وەدەريخستن و بەرەو ئەو مەڵبەندە كشا. لوتفيپاشاي وەزيري لەگەڵ خێرەددينپاشاي دەرياسالار ناردني بۆ گرتني چەند دوورگەيەكي قەڵەمڕەوي فەرمانڕەواي ئيسپانيا.

هەر لەم ساڵەدا شاتەهماسب لە ئۆجانی ئازەربایجانەوە بە مەبەستی پەلاماردانی خوراسان پێی‌نایە قەزوێن. مەولانا ڕوکنەددینی تەبیبی کازێروونی هەڵپێچرا و لەبەرچاوی شا کەوت و سەیدەکانی ئۆسکوو پێهەڵاچوون. میر شەمسەددین ئەسەدوڵلای شووشتەری پلەی سەدارەتی درایە. میرەک شەرەفەددینی کرمانی کە لەمێژ ساڵ بوو میرقەڵەمی دیوانی پادشا بوو، کۆچی‌دوایی کرد و محەممەدبەگی برای میر زەکەریای وەزیر جێی گرتەوە.

ڕۆژێکی سوڵتان حەسەنی حاکمی گیلانی بیەپیش مرد و ملک‌وماش و سامانی بۆ بارام‌میرزا برایەوە کە لە قەزوێن بنەی دانابوو و ئاخری ساڵێ بەرەو ئەو مەڵبەندە بزووت. قەرەمحەممەد و میر هەباس و سەرئەفرازسوڵتانی لەشتێ نێشایی ناسراو بە حەبکەبەند، خان ئەحمەدی مێرمناڵی کوڕی سوڵتان حەسەنیان هەڵگرت و چوونە شاخستانی ئەشکووری ناوچەی گیلان کە چیایەکی یەکجار سەخت و چڕە و سەریان لە حاند فەرمانی میری بادا. بەڵام گەورەپیاوانی تری گیلان داوەرووکان و پێملی بوون و بارام‌میرزا چەند ڕۆژێک لە لاهیجان بنەی خست و خۆی بە کاروباری حوکماتەوە سەرقاڵ کرد.

## ساڵی ٩٤٤ / ١٥٣٧ ـ ٣٨

لەم ساڵەدا سوڵتان سولەیمان‌خان هەرێمی ئەرنیدووی بووڕ و پێخوست کرد و تەشریفی گەڕایەوە ئیستانبووڵ. لوتفی‌پاشای وەزیر سێ قەڵایەکی وڵات و قەڵەمڕەوی قەراڵی ئیسپانیای خستنە ژێر چۆکی. بەڵام چونکە ڕاگرتن و پاراستنیان بووزی نەدەخوارد، تێکیڕووخاندن و بە ساغ و سلامەتی و دەستی پڕەوە بایدایەوە.

هەر لەم ساڵەدا شاتۆماسب بە مەبەستی چوونە خوراسان ڕووی کردە تاران. میر قەوامەددینی نووربەخشی گرت و بەپێی نەریتی میران کوشتی. لەوێوە گەڕایەوە قەزوێن و ڕاست چلەی زستان بەرەو تەورێز بزووت.

خواجە کەلانی مەلیکزادە خەوافی کە نمەکپەروەردەی پادشا بوو، لەبەر خۆ بە زلزانی و غلووری کەوتە سەربادان و بلەوەزی و لەودیوی شووره و قەلای ئاوایی «ئوستاد»ی سەر بە مەلبەندی باخەرز پەنای گرت. قەلای ئوستاد کەوتۆتە پۆپەی چیایەک کە دووسێهەزار گەز بەرزە و جگە لە توولەڕێیەک نەبێ هیچ ڕێگایەکی دیکەی تێناچێ و گەڕیدەکانی دەریا و ویشکانی دنیا قەت دژی ئەوەندە سەخت و قایمیان نەدیوە. کاتێک هەواڵی سەرهەڵدانی گەیشتە گوێی پادشا، وەستا شێخی تۆپچی نارده لای کە هێندێکی ئامۆژگاری بکا، بەڵام مەلیکزادە بە زەبری تیرێک کابرای ڕاسپاردەی کوشت و پشووی لێبڕی. هەر بۆیە ئەمیران و سەردارانی خوراسان بۆ ماوەی یازده مانگ دەورەی قەلایان دا و ڕۆژێکی کوردێکی خێڵی چکنی بە لای ڕۆژهەلاتی قەلادا پێهەلاچوو و کۆمەلێکی بە گوریس هەلکێشان و ئەو پۆلە بەجارێک کردیانە فیکە و هەرا و هاتوهووت. دەستەیەک لە نۆکەرانی خواجە کەلان کە پارێزەری دەروازە بوون، هەلاتن و مەلیکزادە گیرا و بە چۆلەپێچکراوی ناردیانە تەورێز. بەپێی فەرمانی میری لە منارەیەکی مزگەوتی نەسرییەی ساحیبئاباد هەلیانواسی هەتا گیانی دەرچوو. جەماوەری گیلان وێڕای قەرەمحەممەد و براکانی لە بارام‌میرزا ڕاپەڕین و ویستیان نەهێلن کە لە لاهیجان دەرچێ، بەلام میرزا لە لاهیجانەوە بەرەو دەیلەمان ڕۆیی و لەوێش نەوێستا و هەتا قەزوێن گیر نەبوو. لەم کاتەدا عوبەیدیللاخانی ئۆزبەک پێینایە خاکی خوراسان و سۆفییەکانی خەلیفە ڕۆملووی حاکمی هیراتی لە قەلای «عەبدوولئاوا»ی نەیشابووردا قەلاچۆ کرد و شاری هیراتی گەمارۆ دا. وەختایەک ئەم هەوالە بە گوێی موبارەکی پادشا ئاشنا کرا، بە مەبەستی لووت شکاندنی ڕووی کرده خوراسان. هەر ئەوەندەی ئالای پێشەنگانی قۆشەنی فەرمانڕەوا لە دامغان شەکانەوە، عوبەیدیللاخان دەستی لە گەمارۆ هەلگرت و گەڕایەوە ئەوبەرڕووبار. حکوومەتی خوراسانی لە سام‌میرزا

وەرگرتەوە و دای بە سوڵتان محەممەدمیرزای کوڕی خۆی و محەممەدخانی کوڕی شەرەفەددینی تەکەلووی کردە لەلە و دەمڕاستی.

هەر لە زستانی ئەم ساڵەدا بەیداخی پادشایەتی بەرەو نێسا و ئەبیوەرد هەڵدران و لەبەر سۆزەی سەرما و بەفر و کرێوە و باکوت گەلێک تووشی دەرد و مەرەد و کوێرەوەری بوونەوە. قەندەهار و «زێمین داوەر» خرانە سەر قەڵەمڕەوی پادشایەتی و جڵەوی دەسەڵاتی بەخشرا بە بوداقخانی قاجار و هێزەکانی کۆچاوکۆچ گەڕانەوە عێراق.

## ساڵی ٩٤٥ / ١٥٣٨ ـ ٣٩

لەم ساڵەدا سوڵتان سەلیمخان بە مەبەستی دەمکوتی حاکمی بوغدان[١] هەنگاوی نا کە وێڕای خونکارانی فەرەنگ و ئەلمان – ڕەبی ئاور و غەزەبیان بە سەردا ببارێ – دەیانویست سووکایەتی بە مسوڵمانان بکەن و خۆیان لە دانی باجی لادینانە بپارێزن. سوڵتان سەرەتا قەڵای سەجاو (سەچاو - سووجیوا)ی سەر بە بوغدانی گرت. قەراڵی بەدگووزی لاڕێ خۆی بۆ ڕانەگیرا و هەرێمەکەی چۆڵ کرد و ڕەوی. خەڵکی وڵاتەکە خۆیان هاتن و پێمل بوون و حوکمڕانێکی تازەیان دانا و تاوانانەی لادینی و باج و خەراجیان وەستۆ گرت و دەستەبەر بوون کە هەموو ساڵێ بڕی هەشتاهەزار غرووش (قرووش) بنێرنە خەزێنەی دارماڵی میری. دوای ئەم سەرکەوتنە سوڵتانی جیهانگیر بە خۆشی و کامەرانی گەڕایەوە ئیستانبووڵ.

هەر لەم ساڵەدا شاتۆماسب ئەلقاسمیرزای بە ئامانجی شکاندنی شاروخی کوڕی فەرروخیەساری حاکمی شیروان گاڵ دا و ئەویش لە قەڵای سەختی بێغەرد (بێگەرد) پەنای گرت. شاتۆماسب دوابەدوای ئەلقاسمیرزا ڕۆیی بۆ شیروان و بە ئاشتی و ڕێککەوتن قەڵای بێگەردی گرت. شەشسەد کەسێک لە

---

١ – حوکمڕانی بوغدان پێترۆ ڕارش بووە.

قەڵانشینان وەبەر تیغی تیژی قزڵباشان کەوتن و کوژران. تەنانەت خودی پادشاش بە تۆڵەی خوێنی سوڵتان حەیدەری باپیری چەند پیاوماقووڵێکی شیروانی قەڵتوبڕ کردن. ناوچەی شیروانی دا بە ئەلقاس‌میرزا و گەڕایەوە تەورێز و لەوێ خێڵی خست.

حەمەساڵەی نەتیژەی خواجە موزەففەری تەبەکچی لە ئەستەراباد کەوتە کەلەوەکێشی لەگەڵ سەدرەددین‌خانی حوکمڕان و لە جێی خۆی هەڵیکەند و دەریکرد. سەدرەددین‌خان لەناکاو تەپی دایە سەری و گرتی و قۆڵبەستە ناردی بۆ ئاستانەی میری. بەپێی فەرمانی فەرمانڕەوا لە منارەیەکی نەسرییەی تەورێزەوە هەڵیانداشت و تۆرەمەی تەبەکچی لەوێڕا بڕایەوە.

## ساڵی ٩٤٦ / ١٥٣٩ ـ ٤٠

لەم ساڵەدا سوڵتان سولەیمان‌خان، سولەیمان‌پاشای وەزیری بە ڕێگای دەریای «عومان»دا بۆ گرتنی هیندووستان بەڕێکرد. خێرەددین‌پاشا لەگەڵ دەریاسالار «ئاندرێ دووریێ»ی فەڕەنگی لە دەریادا تێکگیران و شەڕێکی قورسیان لە مابەینی‌دا قەوما. ئاندرێ دووریێ (ئاندرێ ئادووریا) قەڵای «نۆوە»ی داگیر کرد و کافری دانان بۆ پاراستنی. سەرلەنوێ خێرەددین‌پاشا پەلاماری قەڵاکەی دایەوە و بە هەڵمەتێکی سەرکەوتووانە ئەستاندییەوە و هەموو لادینانی لێ قەڵاچۆ کرد و مسوڵمانانی دانان بۆ ڕاگیرکردنی.

هەر لەم ساڵەدا عوبەیدخانی ئۆزبەک لە بوخارا مرد و عەبدوڵلاخانی کوڕی کوچونجی‌خان کوڕی ئەبولخێرخان جێی گرتەوە و بوو بە پادشای سەربەخۆی ئەوبەرووبار و تورکستان. شاتۆماسب وەختایەک هەواڵی مەرگی عوبەیدیلاخانی بیست گەلێکی خێر و خێرات لە نێو هەژاران و بەلەنگازان‌دا بەخشییەوە و ئۆخژنی لە دەروونی گەڕا و کردی بە خۆشی و شادی.

ڕۆژێک غازیخانی حاکمی شیراز لە هۆردوودا کۆچیدوایی کرد و جێگاکەی باربووی برایمخانی کوڕی کوجەلبەگی زولقەدر کرا. هەروەها نەخۆشی چاوقولکە تەورێزی تەنییەوە و خەڵکێکی زۆری پێتێداچوون.

## ساڵی ٩٤٧ / ١٥٤٠ ـ ٤١

سوڵتان سولەیمانی غازی بە هەوای شکاندنی «فەرەندووش»ی خونکاری نەمچە (نەمسا - ئۆتریش) و گرتنی وڵاتی ئەنکرووس (مەجارستان) دەرکەوت و قەڵای بوودینی دەورە دا. پێشتر باسی کرا کە وەختایەک بوودین گیرا، حکوومەتەکەی بەخشرا بە بان ئەردەڵ. دوای مردنی ئەردەڵ، دەسەڵاتی وێ باربووی بان ئێستیفان کرا. فەرەندووش پەلاماری ئێستیفانی دا و محەممەدپاشای وەزیر بەر لە گەیشتنی کاروانی شکۆداری سولەیمانی، بە قۆشەنی ڕۆملییەوە چووە یاریدەی بان ئێستیفان.

غازیخانی تەکەلوو لەم ساڵەدا ڕووی لە دەرگانەی سوڵتانی غازی وەرگێڕا و بە خۆی و شەشهەزار سوارێکەوە لە هاوینەهەواری سوورلغ (سوورلق) سەری وەبەر ئاستانەی پادشایەتی هێنا و چەند ناوچەی شیروانی وەک سالیان و مەحمووداوا و باکۆی خەڵات کرا. خودی شاتۆماسب هرووژمی بردە سەر گورجستان و مەڵبەندی تفلیسی ژێردەسەڵاتی لۆراسبی گورجی تالان کرد و گەلێک یەخسیر و خەنیمەتی وەدەس هێنا و لە تەورێز خێڵبەزی کرد.

## ساڵی ٩٤٨ / ١٥٤١ ـ ٤٢

لەم ساڵەدا محەممەدپاشای وەزیر کە بەر لە کاروانی شکۆداری سوڵتانی گەیبوویە بوودین، فەرەندووش (فێرناندۆ کۆرتێژ) وێڕای دەس هەڵگرتن لە گەمارۆ بە دەورەی هێزەکانی داهات و شەڕگەی دیاری کرد. هەموو دەراندەری شوێنی تێکهەڵچوونی خەندەک لێدا و بە عارەبانە و داروبار گەڕانگەڕی تەنی و تۆپ و زەبرزەنەی تێکخستن و حەساری قایم و پتەوی دابەست و لەم حەوشەیەدا

حارز و ئامادە بۆ بەرەنگاری چەقی کە خۆیان پێی‌دەڵێن قایمە. محەممەدپاشا لەگەڵ کافرانی ماڵ کاول شەڕی هەڵگیرساند و فەرەندووشی قەراڵ شکستی بە ئەستۆی دابڕا و لەو حەسارە دەرپەڕی و کۆمەڵێکی زۆر لە هێزەکانی کافران بە لەپەشیری خەزاکەرانی بالادەست تێداچوون. قەلای «پوشتە»ش هەر لەم ساڵەدا گیرا و جەنابی سوڵتانی غازی گەڕایەوە قوستەنتەنییە.

ڕۆژێکی محەممەدخانی حاکمی شەککی وێڕای ئەلقاس‌میرزا لە کوێستانی سەهەند چوونە خزمەت ڕکێفی پادشا و چۆن چاکە ئاوا لاوێندرانەوە و ئیزنی گەڕانەوەیان درا. پادشا زستانەهەواری بردە تەورێز. عەبدوڵلاخانی کوڕی کوچونجی‌خان کە دوای نەمانی عوبەیدیللاخان حکوومەتی ئەوبەرڕووباری بە دەستەوە گرتبوو، مرد و عەبدولعەزیزخانی کوڕی عوبەیدخان لەوێ ئالای فەرمانڕەوایەتی هەڵدا.

## ساڵی ٩٤٩ / ١٥٤٢ ـ ٤٣

سوڵتان سولەیمان‌خانی غازی وەرزی بەهار و زستانی لەوپەڕی خۆشی و شادی و کامەرانی‌دا ڕابوارد و کات و ساتی موبارەکی تەمەنی لە پایتەخت بەخت کرد.

هەر لەم ساڵەدا میری ئۆزبەک واتە کۆستەن قەرەسوڵتانی کوڕی جانی‌بەگ‌خانی حاکمی بەلخ، جان چێهرەی بەهادوری وەک باڵوێز ناردە دەرگای شاهی و عەبدولعەزیزخانی کوڕی عوبەیدخانی حاکمی بوخاراش خودابێردی بەهادوری بەڕێکرد. شاتۆماسب حاجی‌ئاغای میهمانداری ڕەگەڵ خستن و بە خۆشی و کامەرانی مەرەخەس کران. پادشا لە هەڕەتی پایزدا ڕووی کردە خووزستان؛ دزفوول و شووشتەر و هەموو ناوچەکانی هەرێمەکەی گرت و حکوومەتی دزفوول و شوشتەری بەخشی بە ئەبولفەتح‌بەگی ئەفشار و گەڕایەوە ئێراق و لە قوم خێڵبەزی کرد.

## سالّی ٩٥٠ / ١٥٤٣ ـ ٤٤

لەم سالّەدا سولّتان سولەیمانی غازی بە مەبەستی گرتنی ولاّتی بەچ و شکاندنی قەرالّی ویندەرێ قۆڵی هەلّمالّی و پشتێندەی بەرەنگاری پەیت کرد و خێوەتی چەشن گەردوونی لە ئیستانبوولّەوە هەلّدرا و سەری گەیشتە عەویقی ئاسمان و وەکوو بورجی قایم و بلّیند تێکتەندرا.

خاچ و کلیسا نەمان لە سایەی شیری تیژی
هەرجێیە شوێنی کوفرە بە میحراب و مینبەرە
براوە زەنازەنا و هاواری ڕێ ونبووان
ئێستە خرۆش و گوڕە و نەڕەی ئەلاّوئەکبەرە

هەر لەم سالّەدا شاتۆماسب لە زستانەهەواری قومەوە ڕووی کردە هاوینەهەوارەکانی سەربەندی هەمەدان. لە دەوروبەری نەهاوەند حالّی موبارەکی شێوا و خۆی بۆ ڕانەگیرا و نەخۆشی شانی گرت. بژیشکانی چازان و حەکیمانی ورد و وریا خواردن و خواردنەوەی چاک و پێویستیان بۆ ڕێکخست و دوای چەند ڕۆژان وردەوردە نەخۆشییەکەی پەڕی و شوێنەواری خۆشبوونەوەی وەدەرکەوت. سەرۆکان و سەردارانی قزلّباش کە تووشی گێژی گێژاوی دلّەڕاوکە ببوون، شوکری خودایان بەجێهێنا و بە نەزر و خێران نەداران و هەژارانیان بە سەر کردەوە. عەولاّخانی ئۆستاجلووی حاکمی هەمەدان و شاعەلی سولّتان کرانە ڕاسپاردەی پەلاماردانی خێلّ و بار و مەڕ و مالاّتی کەلّهوڕان. دوو سەرکردەکە ئەرکی خۆیان ڕاپەڕاند و خاکی کەلّهوڕانیان تالاّن و پێخوست کرد و بە سلامەتی و بە دەستی پڕەوە گەڕانەوە. غازیخانی تەکەلوو کە چەند جارێک شوێنەواری دووڕوویی و دووبەرەکی لێ دەرکەوتبوو، بەگوێرەی فەرمانی پادشا لە شیروان وێڕای براکانی کوژرا و خێلّبەزی میری لە قەزوێن لەنگەری خست.

## ساڵی ٩٥١ / ١٥٤٤ ـ ٤٥

پادشای ڕۆم و سولەیمانی ئەو خاک و نیشتمانە ڕۆژگاری بە دڵی خۆی و بە دەسەڵاتداری لە ئیستانبووڵ تێپەڕ کرد.

شای عەجەمان بە مەبەستی چوونە کوێستانەکانی ئازەربایجان لە قەزوێنەوە دەرکەوت. لەم سەروبەندەدا میرزا هومایوون کوڕی میرزا بابور کوڕی میرزا عومەرشێخ کوڕی میرزا سوڵتان ئەبووسەعید کوڕی میرزا سوڵتان محەممەد کوڕی میرزا میرانشا کوڕی میر تەیمووری کوورەگان لەبەر دژایەتی سەرۆکان و سەرکردەکان بەتایبەت گێچەڵی میرزا کامرانی برای و شێرخانی حاکمی هیندووستان، خۆی بۆ ڕانەگیرا و دەستی لە خاک و هەرێمەکانی هیندووستان هەڵگرت و بۆ دیداری شاتۆماسب بەرەو ئێراق و ئازەربایجان بزووت. لە مێرگ و چیمەنی ئەبهەر چاوی بە پادشا کەوت و کۆمەڵێک دیاری گرانبایی پادشاهانەی بردە خزمەتی. بۆ نموونە کوتە ئەڵماسێکی چوارمسقاڵی گەورەی خستە بەرچاوی فەرمانڕەوا کە لەوەتی دنیا بە دنیایە شتی ئاوای نەدیبوو، نە بیستبووی. شاتۆماسبیش چۆن چاکە ئاوا دەستی ڕێزی لێنا و چەند ڕۆژێک لە کوێستانی سوورلغ جێژن و میوانداری شاهانەی پێکهێنان و ڕاوی بە کۆمەڵی دابەشی و سەرڕاو و بەرڕاو باسک و تەڵان و لاپاڵ و دۆڵ و پێچ و گەوەیان تەنین. لە جەنگەی ڕاوێدا ڕووداوێکی سەیر و دەگمەن قەوما و تیرێک سەری کرد و ئەبولقاسمی خولەفای قاجاری پێکا و متەقی لێبڕی. بەڵام دەبێ بزانین کە شاتۆماسب هێندێک جاران خۆی لە کوشتنی میرزا هومایوون خۆش کرد، کەچی سەرەنجام بە کەیخودایەتی «سوڵتانم» خانمی خوشکی دەستی لە کۆڵ کردەوە و لە ڕووی چاکە و پشتیوانی شەشهەزار سوارێکی قزڵباشی بە سەرکردایەتی بوداقخانی قاجاری ڕەگەڵ خست و بەرەو هیندووستان گاڵی دا. میرزا هومایوون شێرخانی بەزاند و جارێکی تر دەسەڵاتی ئەو هەرێمەی بە دەستەوە گرتەوە. لە چاکەی شاتۆماسب مەڵبەندی قەندەهاری

خستە سەر قەڵەمڕەوی میری و لەودەمیڕا هەتا ئێستا ناوچەی قەندەهار کە داهاتی ساڵانەی چلهەزار تمەنە بە چنگ پادشای قزڵباشەوەیە.

## ساڵی ٩٥٢ / ١٥٤٥ ـ ٤٦

لەم ساڵەدا خونکاری جیهانگیری ڕۆم سوڵتان سولەیمانخان بە خەیاڵی ئاسوودەوە لە ئەدرنە و ئیستانبووڵ خەریکی ڕاو و شکار بوو. لە هیچ دەروویەکەوە شتی ناخۆش کە بتوانێ بیری موبارەکی بشەمزێنێ ئاسۆگی نەدا.

شاتۆماسب لەبەر بلاوبوونەوەی تاعوون لە تەورێز بەرەو عێراق کۆچ و باری لێنا و هەتا عەلیبولاغی سەر سنووری خوراسان ڕۆیی و گەڕایەوە قەزوێن و لەوێ هۆردووبەزی کرد. لەم کاتەدا ڕاپەڕین و سەرهەڵدانی ئەلقاسمیرزا بە فیتی تاقمێک ئاژاوەگێڕی قزڵباش و خەڵکی شیروان بە گوێی پادشا ئاشنا کرا.

## ساڵی ٩٥٣ / ١٥٤٦ ـ ٤٧

سەرەتای ئەم ساڵە شازادە سوڵتان محەممەدخانی کوڕی سوڵتان سولەیمانخان لە مەغنیسا (مانیسا) دەستی لە دنیا بەردا و مەیتەکەیان هێنایەوە ئیستانبووڵ و مزگەوتێکی هەرەباشیان لەسەر گۆڕەکەی ساز کرد و دایانپۆشی. میریمیرانی بەغدا، بەسرە و جەوازەر و واستی گرت و وەسەر قەڵەمڕەوی سوڵتانی خستن. لە ئاستانەی بەرزەوە بەگلەربەگ و سەرۆک بە مەبەستی پاراستن و ڕاگرتنیان دیاری کران.

شاتۆماسب لە زستانەهەواری قەزوێنەوە ڕووی کردە کوێستانەکانی ئۆجان. خانبەگی خاتوونی دایکی ئەلقاسمیرزا لەگەڵ سوڵتان ئەحمەدمیرزای کوڕی بە مەبەستی تکا و لێخۆشبوونی هەڵلای ئەلقاسمیرزا چوونە ڕایەخڕامووسانی پادشا و ئەویش قەڵەمی بەخشینی بە سەر تاوانەکانیدا کێشا. پاشان چەند سەرکردە و پیاوماقووڵێکی قزڵباشی وەک سەیدبەگی کەموونە، بەدرخانی ئۆستاجلوو، شاقوڵی خەلیفەی مۆرداری زولقەدر، سۆندووکبەگی قۆرچیباشی

ئەفشار، مەعسوومبەگی سەفەوی و میرزا برایمی قازیئەسکەری وێڕای دایکی بەڕێکردنە شیروان کە بچن و دڵی ئەلقاسمیرزا بدەنەوە و سوێندی دادەن کە لەوەی بەولاوە بەپێچەوانەی ویستی پادشا نەجووڵێتەوە و لە ڕێگای ڕاست و پێملبوون لانەدا.

ئەمجار خودی شا ڕووی کردە خەزای گورجستان و ئەلقاسمیرزای بە ڕێی دەربەندی شیرواندا ناردە خەزای چرکەسان. شاتۆماسب بە ناوچەی شۆرکەل و پەنێکدا ڕابرد و پێینایە گورجستان. بەشی زۆری ئەو زستانە سەرقاڵی گرتنی ئەو خاکە و ڕەتاندنی کافرانی سەر بەگێچەڵ بوو. لەوێوە گەڕایەوە قەرەباغی ئەرران و ڕۆژی یازدەی مانگی قوربان بە ڕەوگەی قۆیوونئۆلمی ڕووباری کوڕدا تێپەڕی و پێینایە مەڵبەندی شیروان و لەوێشەوە چوو بۆ عەلی چووپان.

## ساڵی ٩٥٥ / ١٥٤٨ ـ ٤٩

ئەلقاسمیرزا هەمیشە دەچوو دە بن سوڵتان سولەیمانی غازییەوە و بە گوێیدا هەڵدەخوێند ئەگەر بێتوو خونکاری بەرزەجێ سەری ڕکێفی بەرەو ئێران وەرسووڕێنێ تەواوی مەزنەپیاوانی قزڵباش لە توماسبی برام هەڵدەگەڕێنەوە و سەر وەبەر ڕکێفی موبارەکی سوڵتانی دێنن. هەر بۆیە سوڵتانی غازی لە خانەمیری قوستەنتەنییەوە بەرەو ئازەربایجان بزووت و هەتا تەورێزی ناوەندی دەسەڵات ڕانەوەستا، بەڵام هیچکەس لە پیاوانی قزڵباش نەچوونە پێشوازی کاروانی بەشەکەوتی سوڵتانی. تەنانەت هاوڕکێفانی ئەلقاس کە لە شیروانەوە لەگەڵی چووبوونە ڕۆم، ڕوویان لێوەرگێڕا و دایانە پاڵ شا. بەم چەشنە سوڵتانی غازی ماوەی چوار ڕۆژ لە تەورێز بنەی دانا و کەوتە حەسانەوە، بەڵام هێزەکانی نەیانتوانی لە جێی خۆیان پەل ببزێون و بە زۆرەملی پەڕەکایەک لە خەڵک و دانیشتووانی تەورێز و دەوروبەری بستێنن. جەماوەری فرۆشەری بازاڕ هەموو ڕۆژێ لەسەر پێوشوێنی جاران دەرگای دووکانەکانی خۆیان دەکردەوە و سەرقاڵی کاری خۆیان دەبوون. لەم بارودۆخەدا

لەشکری هەمیشه سەرکەوتەی سولتانی غازی بەرەو وان گەڕایەوە و ئەو قەڵا بەرزەی سەری گەیوەتە ئاسمان دەورە درا و بە زەبری تۆپ و بەرداویژ و مەنجەنیق تێککوترا. شاعەلی سولتانی حوسێنی کە لە ژووری قەڵادا پەنای گرتبوو، ئامانی خواست و دژەکەی بە دەستەوە دا. وان، وستان، ئەرجیش و عادلجەواز کەوتنە چنگ کاربەدەستانی حکوومەتی باڵادەست. وەختایەک سەبارەت بە چۆنیەتی قەڵاداری سولتان خاترجەم بوو، ڕووی کردە زستانەهەواری حەلەب و لە بەندی ماسی تێپەڕی و بەرەو ئەرجیش و خەنەس بزووت. شاتۆماسب لە پاسین و ئاونیک بنەی دانابوو کە سیخوڕان خەبەریان بۆ هێنا ئەوە سولتانی غازی بە تەمای پەلاماردانی ئێوەیە و بە سەرڕەو دێ و ئەویش خێرایەکی بەرەو ئەرزەنجان ڕایکرد. بە خزمەت سولتانیان ڕاگەیاند کە شاتەهماسب سەرەڕێی گرتووە و دەیهەوێ قۆشەنی ئیسلام تووشی نەهامەتی و خەساربارى بکا. سولتانی غازی ڕێی کلا کرد و لە ئەرجیشەوە چووە مووش و لەوێوە بەرەو بدلیس جمی و لە دەربەند تێپەڕی و هەتا دیاربەکر ڕانەوەستا و ڕۆیی بۆ حەلەب. شاتۆماسب دوابەدوای وی پێی‌نایە بدلیس و مووش و خارپووتی ئاور تێبەردا و لەشکری قزڵباش هەتا کووک مەیدانی بدلیس وڵاتێکی زۆریان خاپوور کرد و لەوێوە چوونە سوێی قەڵای وان و ئابلۆقەیان دا.

سولتانی غازی ئەلقاس‌میرزای بە مەبەستی پێخوست و تالانی هەرێمی ئێراق بەرەو بەغدا و شارەزوور نارد و لەوێ خێڵبەزی کرد. لە وەرزی بەهاردا سولتانی غازی زستانەهەواری حەلەبی جێهێشت و بە نیازی شەڕ و لێکدان لەگەڵ شاتۆماسب ڕووی کردە دیاربەکر و لە کوێستانی ئالماڵوو (سێواوێ) چەند ڕۆژێک وچانی دا . پادشا لەم وەختەدا هەواڵی چوونی ئەلقاس‌میرزای لە بەغداوە بۆ عێراق و تالان کردنی خێڵ و باری بارام‌میرزای برای و چراغ‌سولتانی ئۆستاجلووی لە هەمەدان و بە دیل گرتنی ژن و منداڵی ئەوانی پێگەیی. خەبەرەکە دەیگوت کاتێک ئەلقاس‌میرزا گەیشتۆتە هەرێمەکە کەیخودا و گەورەپیاوانی

قوم و کاشان و ئیسفەهان تێکڕا چوونە خزمەتی و سەریان وەبەرهێناوە. بۆیە شاتۆماسب لەڕێوە دەستەیەک لە میران و سەرۆکانی وێڕای بارام‌میرزا وەک پێشەنگ بەرەو عێراق گاڵ دا و خۆی دەستی لە کۆڵ قەڵای وان کردەوە و بەرەو قەرەباغ ڕۆیی. بە لێواری ڕووباری کوڕدا گەڕایەوە و بە ڕێگای ئەردەوێڵ و خەڵخاڵدا بەرەو قەزوێن داوەری. بەرلەوەی کاروانی بە تەنتەنە و سەنسەنەی پادشایانەی بگاتێ تاقمێک لە سەرۆکان و سەرکردەکانی بە مەبەستی پاراستنی قۆشەن و ژن و زارۆکی قزڵباشان بەڕێکردن کە لە هەرێمی عێراقا بە پرش‌وبلاوی کەوتبوونەوە.

کاتێک دەنگ و ئاوازەی داوەرینەوەی قۆشەنی فەرمانڕەوا لە ئیسفەهان گەیشتە گوێی ئەلقاس‌میرزا، بەرەو خاکی خووزستان بزووت و دەستی بە سەر قەڵای «ئیزەدخواست» داگرت و قەڵتوبڕی تێخست. لەوێوە چوو بۆ لای شووشتەر و دزفوول و دەورەی قەڵای شووشتەری دا و هەرچی کردی و کراندی هیچی بۆ نەکرا. بە هەوڵ و تێکۆشانی کوڕانی میر شەمسەددین ئەسەدوڵڵای میر زەینەددین سەید عەلی و وەجیهەددین عەبدولوەهاب کە پیر و پێشەوای خەڵکی ئەو مەڵبەندەن، پیاوانی ڕۆم هرووژمیان دەکردە سەر هەر قەڵا و شوێنێک، جەماوەر لێیان ڕادەپەڕین و بەرەنگاریان دەبوون و هەسیان دەدانەوە. ئەوەندەی هاتن و چوون جیهادەکەیان بڕی نەکرد و سەرشکستە و خەساربار گەڕانەوە دزفوول و لەوێش چیان بۆ نەکرا و بە ڕێی قەڵای «بەیات»دا بەرەو بەغدا کشان.

## ساڵی ٩٥٦ / ١٥٤٩ ـ ٥٠

لە سەرەتای ئەم ساڵەدا سولەیمانی غازی، ئەحمەدپاشای مەزنەوەزیری کردە سەرکردەی سپا و لە هەوارگەی «ئاڵماڵوو»ڕا بە ئامانجی لێدانی شاتۆماسب ناردی بەرەو گورجستان. ئەگەرچی هێشتا مزڵێکیان مابوو هێزەکانیان بگەنە یەکتر، ئەحمەدپاشا ترسا و خۆی لە شەڕ پاراست و چەند

قەلایەکی هەرێمی شووشادی گرت و گەڕایەوە هۆردووی جیهانگیری سولتان. لەو ماوەیەدا سولتانی خەزاکەر گەڕایەوە کۆشکی شکۆداری فەرمانڕەوایەتی.

شاتۆماسب خێڵبەزی بردە قەزوێن و لەوێوە ڕووی کردە کوێستانی خەررەقان. لەو شوێنە بە خزمەتیان ڕاگەیاند کە ئەلقاسمیرزا لەبەر هێندێک بارودۆخی نالەبار کە باسێکی دوور و درێژە لەبەرچاوی سولتان کەوتووە و ڕۆستەمپاشای وەزیر دەیبوغزێنێ و دوژمنایەتی دەکا ؛ هەر بۆیە ئەلقاسمیرزا داوەریوەتە شارەزوور و دەیهەوێ لەگەڵ برای ئاشت بێتەوە. شاتۆماسب بەم هەواڵە کەیفی بزووت و شادی لە دەروونی گەڕا و کۆچاوکۆچ بەرەو کوردستان جمی و میر عەبدولعەزیمی پەردەداری بارگای ئیمام ڕەزای خوداڵێخۆشبووی ناردە دڵدانەوەی ئەلقاسمیرزا. میرزا هێشتا بۆ وڵامدانەوەی ڕاسپاردەکەی پادشا تێمابوو کە لەناکاو لەشکری ڕۆم پەلاماریان دا و هۆردوویان لێ تالان کرد. میرزا لەگەڵ پۆلەسوارێک هەڵات و خۆی گەیاندە کەژ و کۆی قەڵەمڕەوی سورخاببەگی حاکمی ئەردەڵان. شاتۆماسب سۆندووکبەگی سەرتفەنگداری لەگەڵ دەستە چەکدارێک نارد و دەورەی قەلایان دا و چۆنیەتی بارودۆخەکەیان بە پێچکی تەختی بەرزی میری ڕاگەیاند. پادشا میرُ نیعمەتوڵلای دووەمی بە مەبەستی ئامۆژگاری کردنی ئەلقاسمیرزا بەڕێکرد و ئەویش گەلێکی وەبەرهەڵخوێند و دڵخۆشی داوە و لەگەڵ بیست کەس لە هاوڕکێفانی هێنایە دەرگای میری. دوای دوو ڕۆژ گیرا و نێردرایە قەلای قەهقەهە و تەمەنی لە بەندا کۆتایی پێهات. بۆ ئەوەی پەیمان و بەڵێنەکە نەشکێ بە شێوەیەک لە قەلاوە هەڵیانداشت و متەقیان لێبڕی.

ڕۆژی پازدەی مانگی ڕەمەزان بارامیرزای برا چووکەی شا بە مردنی خۆی مرد و سولتان حوسێنمیرزا و برایممیرزا و بەدیعوززەمانی بە هەتیووی لە پاش بەجێمان.

لە ئاخروئۆخری ئەم ساڵەدا کەسێک بە ناوی بورهان لە تۆرەمەی میرانی شیروان سەری هەڵدا کە زۆربەی هەرێمی شیروانی خستە ژێر دەسەڵاتی. شاتۆماسب حکوومەتی شیروانی دا بە عەولاخانی ئۆستاجلوو کە بڕوا و بورهانیش دەربپەڕێنێ. کاتێک عەولاخان لە ئاوی کوڕ پەڕییەوە وەک ڕووداوێکی سەمەرە بورهان هەر ئەوەندە بلێی یەکودوو سەری نایەوە. خەڵکی شیروان کەسێکی دیکەیان بە ناوی میحراب لە جێی دانا و عەبدوڵلاخان هەڵیکردە سەری و ئەویش باشاری نەکرد و هەڵات و سەرلەنوێ هەرێمی شیروان کەوتەوە بن دەستی هێزەکانی قزڵباش.

## ساڵی ٩٥٧ / ١٥٥٠ ـ ٥١

سوڵتان سولەیمانخان بناغەی مزگەوتێکی مەزنی دانا و لە ماوەی هەشت ساڵاندا تەواوی کرد و بە سولەیمانییە ناودێرە. بۆ ناوبانگ و گەورەیی بەڕێز کەوتۆتە دوای مزگەوتی ئەیاسۆفییە و بەنئۆمەییە.

هەر لەم ساڵەدا شاتەهماسب لە قەزوێنەوە ڕووی کردە کوێستانی سوڵتانییە و لەوێشەوە بەرەو ئازەربایجان بزووت و خێڵ و خێزانی ناردە عێراق و هاوینەهەواری بردە قەرەباغی ئەرران.

## ساڵی ٩٥٨ / ١٥٥١

لەم ساڵەدا سوڵتان سولەیمانی غازی، ئەحمەدپاشای مەزنەوەزیری بە سەرکردایەتی هێزێکی بێژمار و یەنیچەری و قەپووخوڵقی و میریمیرانی ڕۆملی ناردن بۆ گرتنی قەڵای تۆمشوار. ئەو دژە حەوشەیەک بوو لە پەنا مەحمییەی ئیسلامییە کە فەرماندەیەکی کافر بە ناوی «لوسانجە» حکوومەتی بە سەردا دەکرد. ئەم قەڵایە بۆ بەرزی و سەختی تای قەڵای ئاسمان دەهاتەوە و پۆپەی لە پەرپەرۆچکەی خێوەتە شینەی جیهان دەدا. لوسانجە هەمیشە خراپەی دەکرد لەگەڵ دانیشتووانی سەر خاک و ئاوی مسوڵمانان. ئەحمەدپاشا بەپرتاو هەڵیکوتایە سەری و دەورەی دا و لەبەر شەپۆلی هێزەکانی وەک

دەریاخورۆشاوی و گرمە و ڕمبە و تەقەی تۆپ و تفەنگی چەشنی هەورەبرووسکە دەتگوت قیامەت ڕابووە. تەوژمی زرموکوت و زبروەشاندن و کوشتار هەوری قەزا و بەلای بە سەر سەری کافرانەوە سووڕاندەوە. قەلای تۆمشوار و سۆلنقحەسار و نۆ دژی تری قەلەمڕەوی ئەم حاکمە کەوتنە چنگ وەزیری ئازا و خرانە سەر هەرێمی دەسەلاتی سولتان. سەرهێز و حوکمدار و قازی بۆ ڕاگرتن و پێڕاگەیشتن و پاراستنی دیاری کردن و گەڕایەوە مەحمییەی ناوەندی دەسەلات.

لەبەروەی شاتۆماسب زۆرجاری سەربادان و ملانەی دەروێش محەممەدخانی حاکمی شەککی لە ئاست خۆی بەدی کردبوو، لەشکری ناردە سەری و بە دەستی زۆر قەلای شەککی بەردەست کرد. محەممەدخان بە جلگۆڕکە هەلات، بەلام کەوتە چنگ کۆسە پیرقولی پیاوی چەرەندابسولتانی شاملوو و ئەویش نەیزانی و کوشتی.

هەر لەم سالەدا شا، قولیسولتانی ئۆستاجلووی لەسەر حکوومەتی مەشەدی پیرۆز وەلابرد و حوکماتی «چۆخوری سەعد»ی پێئەسپارد. جلەوی حکوومەتی مەشەد باربووی عەلیسولتانی زولقەدری تاتی ئۆغلی کرا. لە بنەبانی سالدا ڕاسپاردەیەک لە لایەن قەرالی ئیسپانیاوە بە ڕێگای هۆرمزدا گەیشتە خزمەت پالشا. دواتر «قولیمحەممەد بەهادور»ناوێکی هاورکێفی دینمحەممەدخانی ئۆزبەکی حاکمی خارەزم ڕووی کردە ئاستانەی شاتۆماسب. لە کاتی گەڕانەوەیدا کاتێک گەیشتە سەبزەوار هەوالی مەرگی دینمحەممەدی بیست. ئەویش قازی عەتائوللای برای قازی محەممەدی ڕازی کە لەگەلی نێردرابوو، بەجێیهێشت و شەو ڕایکرد و بەرەو مەرو ڕۆیی. سال نەبڕابۆوە کە چاوقولکە کەوتە نێو هۆردووی قزلباشەوە و شاتۆماسب لەشکری خۆی لێکبلاو کرد و زستانەهەواری بردە قەرەباغی ئەرران.

## ساڵی ٩٥٩ / ١٥٥١ ـ ٥٢

سوڵتان سولەیمانی غازی لە قودسی موبارەک بە لای قیبلەدا لەسەر گرەبەردێک گومبەزێکی بەرزی هەڵخست و دەر و ژووری بە کاشی ڕازاندەوە. مزگەوتی چاک و دڵفەریح و خانەقای خۆش و بلند و بەرفرەوانی لە کووک مەیدانی خاکی شام ساز کردن کە ناسراوە بە «قەسری ئەبلەق». بەرچایی و شێوی شەوانەی ڕێکوپێک و تەواوی دانا بۆ موسافیران و ڕێبواران.

لە مانگی ڕەمەزاندا شاتۆماسب بە ئامانجی گرتنی قەڵای وان بزووت و دەورەی دژی ئەخلاتی دا. لەبەروەی قەڵاکە لەسەر بەردێکی نەرم داندرابوو، کەرێزکەن لە دەوروبەری هاڵان و کەوتنە لێدانی ڕەهۆڵان. قەڵانشین هاواریان لێ‌هەستا و کەوتنە پاڕانەوە کە دەستیان نەکەنێ و قەڵاکە بەردەس دەبێ و شا لێی قبووڵ کردن. جەماوەر لە قەڵا دەرکەوتن و کەسی ڕەگەڵ خستن و بە سلامەتی ناردنی بۆ لای بتلیس و دژەکەی ڕووخاند و داری لەسەر بەردی نەهێشت. لەوێوە ڕۆیی بۆ لای ئەرجیش و فەرمانی گەمارۆدانی قەڵای دەرکرد. سەرسوور بە دەوری قەڵاوە وەربوون و خۆیان دایە قەڵاگیری. کاتێک مەودای گەمارۆ بۆ ماوەی چوار مانگ درێژ بۆوە، زستانی سەخت پەڕی هەڵدا و چەند نوایەک بەفری قورس باری، بەڵام دیسانیش شاتۆماسب کرێوە و باکوت نەیتەزاند و خێوەت و بارەگای کۆنەکردەوە و شێلگیر و پتەو ڕاوەستا و ڕۆژ بە ڕۆژ ئاڵقەی ئابلۆقەی پتر ڕێکدێنا. لە ژووری قەڵادا چەند تیرە و تایفەیەکی بوختی (بۆتانی) پشتیان بە پشتی یەکترەوە دابوو، بۆ وێنە میر برایم گورگیلی بە جڵەودار دادەندرا. کۆمەڵی ڕۆمی ڕازی بوون لەسەر بە دەستەوەدانی قەڵا، بەڵام بۆتانی قنیاتیان نەهێنا و بوونە لەمپەر. سەرەنجام تۆرەمەی ڕۆمی بەدزی سەریان وەبەر پادشا هێنا و چەند قزڵباشیان بە کەندر و گوریسان لە شوورەوە هەڵکێشا و چی بۆتانییە کەوتنە بەر ڕەهێڵەی تیر و فیشەکان و لە دژ تەرە کران و قەڵا درایە دەس میران و بەگلەرانی پادشا. هەزارەزیلە و پاشماوەی

چەکدارەکانی بۆتانی کەوتنە بەر دەستی شاتۆماسب و ئەویش پێستی سەری داماڵین و قوولەی پێکردن. کوڕە خاڵی ئەلقاسمیرزا، بەدیعوززەمانی کوڕی عەلیبەگی تورکمانی جەلیلووی سەرۆک هێزی ئەرجیش کوژرا.

## ساڵی ٩٦٠ / ١٥٥٢ ـ ٥٣

سەرەتای ئەم ساڵە سوڵتان سولەیمانی غازی بە ئامانجی گرتنی ئێران لە ئیستانبووڵی پایتەختەوە دەرکەوت. کاتێک شارۆکەی ئەرگیلی خێوەت و تاوڵ و ڕەشماڵ و بارگای شکۆداری میری سەریان لێبەرز کردەوە، شازادە سوڵتان مستەفای کوڕە گەورەی لە ئاماسییەوە بە لەشکرێکی گەورە و گرانەوە هاتە ئیکلامکێشان و ڕایەخڕامووسانی باوکی. ڕۆستەمپاشای مەزنەوەزیر چونکە لە سام و هەیبەتی دەترسا، سەروبەری کاغەزێکی بە درۆی لە زمانی شاتۆماسبەوە لە ڕێی سەید محەممەدی حاکمی هەکارییەوە وێکخستەوە و نیشانی میری مەزنی دا و ئەویش بە نێوەرۆکی نووسراوەکە کەوتە دڵەڕاوکە و هەر ئەو ڕۆژە شازادەیان گرت و خنکاندیان. یەکێک لە زانایان ڕێکەوتی ئەم ڕووداوەی بە «مەکری ڕۆستەم»[1] بردۆتەوە سەریەک. مەیتەکەیان بردەوە بوورسا و لەوێ ناشتیان و سوڵتان هۆردووبەزی بردە حەلەب.

هەر لەم ساڵەدا شازادە جانگیر لەوێ ئەمری خودای بەجێهێنا و تۆماری تەمەنی پێچرایەوە و تەرمەکەیان گواستەوە ئیستانبووڵ و مزگەوتێکی گەورەیان لە شوێنێکی بەرز لەسەر گۆڕەکەی ساز کرد. سوڵتان سەرەتای بەهاری خۆشفەڕ لە زستانەهەواری حەلەبەوە بەرەو نەخجەوان بزووت. کاتێک ڕووکاری نەخجەوان بوو بە خێوەتگەی هۆردووی سەرەنجام سەرکەوتووی، شاتۆماسب بەرگەی هێرشی نەگرت و بەرەو کوێستانەکانی نەخجەوان بارگە و بنەی پێچایەوە. وەختایەک سەرەدای زستان وردەوردە خۆی نواند و ڕەنگبوو

---

١ - «مکر رستم» بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە ٩٦٠.

شاتەهماسب دەرفەت بێنێ و ڕوو بکاتە هەرێمی ڕۆم و بکەوێتە تێکدان و پێشێلی ئەو خاک و سەرزەمینە، سوڵتان لە نەخجەوانەوە گەڕایەوە ئاماسییە و لەوێ خێڵبەزی کرد.

## ساڵی ٩٦١ / ١٥٥٣ ـ ٥٤

سوڵتانی غازی ئەحمەدپاشای مەزنەوەزیری کوشت و ڕۆستەمپاشای زاوای لە جێی دانا کە کاتی چوونە نەخجەوان لەسەر ڕووداوەکەی سوڵتان مستەفا لێیخستبوو.

شاتۆماسب لە وەرزی پایزدا پێینایە تەورێز و کچی شانیعمەتوڵلای تۆرەمەی میر نیعمەتوڵلای قەهێستانی خوشکەزای خۆی بۆ سمایلمیرزای کوڕی خواست و داوەتێکی گەورەی بۆ کرد.

## ساڵی ٩٦٢ / ١٥٥٤ ـ ٥٥

لەم ساڵەدا میرزا هومایوونی حوکمڕانی هیند کە زۆرجاران لە کاتی ڕۆژاوابووندا پاڵی دەداوە و لە زەردەی تاوپەڕی دەڕوانی، لە سەربانی کۆشکی خۆی کە لە دێهلی سازی کردبوو، بەربۆوە و گیانی دایە دەس گیانپەروەرێنی. سوڵتان جەلالەددین محەممەد ئەکبەری کوڕە گەورەی لە تەمەنی... لە شوێنی باوکی بوو بە فەرمانڕەوا و وردەوردە هەموو هەرێمەکانی هیندووستانی خستە ژێر دەسەڵاتی. هەر ئێستا کە من خەریکی نووسینم ماوەی چل و پێنج ساڵە کە ئەو پادشا دادەوان و زانایە بە تێر و تەسەلی و دەسڕۆیشتوویی لە هەموو هەرێمەکانی هیندووستان خەریکی حکوومەت کردنە. ناوبانگی دادپەروەری و دەستی بدە و بەخشینی گەیوەتە ئەوپەڕەوپەڕی وڵاتانی دنیا. بە بیری کولمدا دەهات کە چۆنیەتی بەسەرهات و ڕووداوەکانی ڕۆژگاری دەسەڵاتی ئەو پادشا دادپەروەرە لەم دەقە دوابڕاوەدا بنووسمەوە و بیدرکێنم، بەڵام لەبەروەی وڵاتی هیند لە دەرەوەی جەغزی مەوتەنی ئێران و توورانە، خۆم لە درێژکردنەوەی

قسان و تێوەدانی خەڵک پاراست و تیژ تێپەڕیم. مەولانا قاسمی کاهی سەبارەت بە ڕێکەوتی کۆچی‌دوایی میرزا هومایوون ئاوای فەرمووە:

هومایوون پادشای ملکی هەبوون بوو
وەبیری نایە هیچ‌کەس پادشای وا
لە بانی کوشکی هەڵدێرا لەناکاو
هەموو عومری عەزیزی کەوتە بەر با
لەبۆ ڕێکەوتی مەرگی کاهی نووسی
هومایوون‌شا لە بان بەربۆوە[1] ئێستا

## ساڵی ٩٦٣ / ١٥٥٥ ـ ٥٦

لەم ساڵەدا سوڵتان سولەیمان‌خان لە کۆشک و سەرسەرای قوستەنتەنییە زەمانی بە خۆشی و کامەرانی و عەیش و نۆش و دیدار ڕابوارد.

شاتەهماسب دەسەڵاتی هیراتی دایە دەس سمایل‌میرزای کوڕی دووەمی خۆی و وێڕای عەلی‌سوڵتانی تەکەلوو ناردی بۆ وێ. محەممەدخانی کوڕی شەرەفەددینی بۆ کردە لەلەیەکی لێوەشاوە. شازادە سمایل‌میرزا ئەسپاردبووی کە سوڵتان محەممەدمیرزا ببرێتە خزمەت پادشا و بەپێی فەرمان عەلی‌سوڵتان، سوڵتان محەممەدمیرزای لە کوێستانی دەریاوکی قەزوێن گەیاندە دەرانەی فەرمانڕەوا. ئەو کاتەی کە عەلی‌سوڵتان وێڕای سمایل‌میرزا پێی‌نایە هیرات، تاتارسوڵتان و عەلی‌بەگی کوڕی محەممەدخان و چەند کەسێک لە ئەمیرزادەکانی تەکەلوو بەتایبەت شەرەفەددین‌بەگی کوڕی وەیسەسوڵتانی

---

١ - همایون پادشاه از بام افتاد، دەبێتە ٩٦٢.

برازای محەممەدخان زۆریان سووکایەتی بە محەممەدخانی لەلە کرد و تەنانەت ویستیان بیکوژن. محەممەدخان دوابەدوای عەلیسولتان چۆنیەتی هەڵوێستی نالەباری ئەو تاقمەی بە درێژی گەیاندە پێچکەی تەختی پادشایەتی. وەختایەک عەلیسولتان شەرەفی ڕایەخڕامووسانی میری پێبڕا، دوای چەند ڕۆژێک لەبەر بوغزاندنی محەممەدخان لە مێرگ و چیمەنی ساوخبولاغ کەوتەبەر شەپۆلی تووڕەیی فەرمانڕەوا و لە بەردەرانەی دیوان کوڕانی گولبادی گورجی پێخوستیان کرد و پلیشاندیانەوە و فزەیان لێبڕی.

هەر لەم ساڵەدا شاتەهماسب، گەوەرسولتان خانمی کچی خۆی دا بە سولتان برایممیرزای کوڕی بارام‌میرزای برای و حکوومەتی مەشەدی تووسی باربوو کرد و ناردی بۆ خوراسان. لە کلکەی ساڵدا تەواوی میران و بەگلەران و چەکدارانی میری بەپێی فەرمانی پادشا تۆبەیان کرد لە هەرچی گوناهە یان بەرگێڕەوەی لەسەر داندراوە. یەکێک لە زانایان سەبارەت بە مێژووی ئەم تۆبە پتەوە ئاوا دەڵێ:

تۆماسبشای دادەوان، سولتانی مەوتەنی دین
هەموویانی تۆبە دا خێڵ و لەشکری دینی
ڕێکەوتی سوێند و پەیمان بۆتە «تۆبەی نەسووحا»[1]
ڕەمزی کاری خودایە، بە چاوی خۆت دەبینی

## ساڵی ٩٦٤ / ١٥٥٦ ـ ٥٧

فرمانڕەوای جیهان، قارەمانی زەمان، ئەسکەندەری جووتقۆچی دەوران، واتە سولتانی غازی سولەیمانخان لە ئەدرنەی مەحمییە بێ هەدادان و وچان،

---

١ - توبة نصوحا، دەبێتە ساڵی ٩٦٣.

وەرزی هاوین و زستان کەوتە گەوزاندنی نێچیر و دابەشینی ڕاو و بەدڵی خۆی ڕۆژگاری ژیانی هەڵبوارد.

هەر لەم ساڵەدا شاتۆماسب لەبەر هێندێک ئاکار و کرداری نالەبار و قێزەونی سمایلمیرزا لە بارێژی هیرات، لێیخست و دووبارە سوڵتان محەممەدمیرزای کردەوە حاکم و ناردییەوە. محەممەدمیرزا وێڕای سۆندووکبەگی قۆرچیباشی ئەفشار بزووت و وەختایەک گەیشتنە هیرات سۆندووکبەگ سمایلمیرزای لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆ لای شا و کاتێک هەواڵی گەڕانەوەیان لە ساوە بە گوێی پادشا ئاشنا کرا، مەعسووبەگی میر دیوانی سەفەوی بە پیرەوە ناردن. سمایلمیرزا گیرا و زنجیرپێچ کرا و نێردرایە قەڵای قەهقەهە و خرایە سیاچاڵەوە و دوابەدوای ئەم کارە شاتەهماسب ڕووی کردە هاوینەهەواری سەهەند. قازی محەممەدی کوڕی قازی موسافیر کە چەند ساڵێک بوو زۆر بە ڕێکوپێکی و لەباری جڵەوی ڕاگرتن و پاراستنی ئازەربایجان و شاری تەورێزی بە دەستەوە بوو، هاوشانەکانی چاوی دوو سەریان پێی هەڵنەدەهات و ئاخرییەکەی بە فێڵ و دەهۆ و ناجسنی پیاوانی قین لە زگ و بەرچاوتەنگ، وێڕای حەیدەربەگی ئەنیس کوڕی وەستا شێخی تۆپچی، کەوتنە بەر تەوژمی توورەیی میر و هاڕدران و گیران. دوای ئەشکەنجە و ئازار و غەدرێکی بێسنوور، زێڕ و زێوێکی زۆریان لێئەستاندن و هەردووکیان ناردن بۆ زیندانی قەڵای هەڵەمووت و لەوێ پشوویان لێبڕا.

لە بنەبانی ساڵدا محەممەدخانی کوڕی شەرەفەددین، حاکمی هیرات کۆچیدوایی کرد. زستانەهەواری میری لە قەزوێن بنەی دانا. میر تەقییەددین محەممەد کوڕی میر موعیززەددین محەممەدی ئیسفەهانی کرایە گەورەوەزیر.

## ساڵی ٩٦٥ / ١٥٥٧ ـ ٥٨

سوڵتان سولەیمانخان بەپێی داب و دەستووری ساڵانی پێشوو کاتی موبارەکی لە ئیستانبووڵ بە خۆشی و شادی و کامەرانی و دیدار تێپەڕ کرد.

شاتۆماسبيش، شاقولّى خەليفەی مۆردار و بەدرخانی ئۆستاجلووی کردنە سەرکردەی لەشکر و وێڕای برايمخانی زولقەدری حاکمی ئەستەراباد و ڕۆستەمخانی ئەفشاری حوکمداری کۆهگیلۆیە و سەرۆک و سەردارانی عێراق لەگەڵ پازدەهەزار سوارێک گاڵی دان بۆ سەر خێلاتی تورکمانی یەقە و حەشاماتی گەرایلوو و تیرەی ئۆقلوو. ئەم عێلاتە هەموو ساڵێ گەلێکيان زەرەد و زيان بە هەرێمی ئەستەراباد و خوراسان دەگەياند و لە ترسی ڕامالّی هێزەکان پەنايان بردە بەر عەلیسولّتانی ئۆزبەکی برای دينمحەممەدخان کە لەبری براکەی حوکمداری ئوورگەنج بوو. پادشا لە دوای ميران و بەگلەران بەرەو کوێستانی خەررەقان کەوتەڕێ کە ئەگەر هاتوو پێويست بە يارمەتی بوو، دوابەدوايان ڕوو بکاتە خوراسان. هەر کە ميران و هێزەکان گەيشتنە دەوروبەری ئەستەراباد، هۆبە و ڕەشماڵی تورکمانان و خێلّی ئۆقلوو لە ترسان پێچايانەوە و ڕەوين و چوونە قەراخ ڕووباری ئەترەک. سەرۆکانی قزلّباش کەوتنە پەيکەردەيان و لە دەشتی ئەترەک شاقوولّی مۆدار نەخۆش کەوت و ژانەزگ حەجمينی لێهەگرت و لەبەر کەمی ئاو و قرچەقرچی گەرما ملی بە لارەوە نا و مرد. هێندێک مەڕ و مالّاتی تورکمانان نەبێ کە بە تالّان چوون، کەسيان وەبەر گوردی سەرسووران نەکەوت. ڕاست لەو دەمەدا عەلیسولّتانی ئۆزبەک بە خۆی و بە سێهەزار سوارەوە لە ئوورگەنجەوە پاش بڕينی چل ڕۆژەڕێ بە چۆل و دەشتاندا، لە لێواری ڕووباری ئەترەک گەيشتە لای تورکمانان. هەردک سپا دوای بڕينی ڕۆژەڕێيەک لێکتر نيزيک بوونەوە. کاتێک عەلیسولّتان بە زۆری و زەوەندی لەشکری قزلّباشی زانی، لە پەنا ڕووبار شوێنێکی چاکی بۆ دامەزرانی قۆشەنی هەلّبژارد و لە دەوروبەری هۆردووبەزی خەندەکی هەلّکەند و پشتی بە چۆمەوە دا. ڕەوەی وشترانی لەسەر لێوی کەندالّان کردە حەوشە و بۆ شەڕ و لێکدان و بەرەنگاری سەنگەری گرت. ميرانی قزلّباش بە لووتبەرزی و غللووری هێرشيان کرد و شەڕيان هەلّگيرساند. عەلیسولّتانيش پێینایە ڕکێف و

وێرای کەوانداران چالاکی تەڕدەست هاتە پەنا خەندەک و خێڵی تورکمانانی بە هەزار سوارەوە بەڕێکردە پشتەسەری لەشکری سەرسووران و خۆی کەوتە بەربەرەکانی. دوای کێشمەکێشێکی پیاوانە قۆشەنی قزڵباش شکستیان تێکەوت و بەدرخانی ئۆستاجلووی سەرکردەی هێزەکە گیرا. برایمخانی حاکمی ئەستەراباد و ڕۆستەمخانی ئەفشاری حوکمداری کۆهگیلۆیە کوژران و یادگار محەممەدبەگی مووسلاوی حاکمی ساوە، حەسەنسوڵتانی فیج ئۆغڵی حوکمڕانی دینەوەر، عەبباس عەلیسوڵتانی کوڕی چەرەندابی شاملوو و شاقوڵیسوڵتانی کوڕی کوجەلی شاوێردی ئۆستاجلوو گیران و کوژران و پاشماوەی هێزەکانی لە ئاوی ئەترەکدا چوونەوە بەر باری فەنایە و هەناسەیان لێبڕا.

کاتێک ئەم هەواڵە سامناک و زراوبەرە لە کوێستانەکانی خەرڕەقان بە خزمەت پادشا ڕاگەیەندرا، کەوتە پەشۆکاوی و پەرێشانی و سەرکردەی تری لە جێگای دانان و گەڕایەوە قەزوێن و زستان لەوێ بنەی دانا. وەرزی بەهار لافاوێکی بەتەوژم لە قەزوێن هەستا و نیزیکەی دووسێهەزار ماڵی وێران کرد و کۆمەڵێکی خنکاند و کەلوپەل و خورد و خۆراک و ڕسقێکی زۆر وە ژێر لیتە و قوڕ و چڵپاو کەوتن و پاش ماوەیەک دەریاندێنانەوە.

### ساڵی ٩٦٦ / ١٥٥٨ ـ ٥٩

لەم ساڵەدا سوڵتان سولەیمانی غازی دەستووری فەرموو کە جێ و شوێنی شازادە پایەبەرزەکان ئاڵوگۆڕیان پێبکرێ و سوڵتان سەلیمخان ڕاگوێزنە ئاماسییە و سوڵتان بازید بەرنە جێگای وی لە قوونییە. جا لەبەروەی سوڵتان بازید پیاوێکی ئازای نەفامۆکە بوو، ئەم حوکمەی بردەوە سەر تەگبیر و ڕای ڕۆستەمپاشای مەزنەوەزیر و گوتی چونکە مێردەخوشکی خودی سوڵتان سەلیمخانە دەیهەوێ براکەم لە پایتەخت نیزیک بێ و من کە کوڕە گەورەم دەمنێرێتە جێیەکی دوورەدەست، هەتاکوو ئەگەر هاتوو بابم مرد، سوڵتان

سەلیم زووتر بگاتێ و لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دابنیشێ، بەڵام لە کاڵ و پوختەی ئەم مەبەستە بێخەبەر بوو کە دەڵێ:

چۆنت پێخۆشە خۆ ئاوا نابێ شتێ دێتەدی کە خوا داینابێ

ئاقڵی ناتەواو و دێوی خۆبەزلزانی وای لێکرد کە کۆمەڵێکی بەرچاو لاتەوپاتە و قەلەوقوتە لە دەوری ئالای خۆی کۆبکاتەوە و بەرەو قوونییە ببزوێ و پەلاماری برای بدا و گەلێک پیاوانە هەڵسووڕێ، بەڵام چی بۆ نەکرێ و بگەڕێتەوە ئەنکوورییە. کاتێک سوڵتانی غازی بەم ڕووداوە دەزانێ قۆشەنێکی یەکجار زۆری قەپووخوڵقی، یەنیچەری، سەرۆک هێزانی ئاناتۆلی، قەرامان، مەرعەش، سیواس و دیاربەکر دەنێرێتە یاریدەی سوڵتان سەلیمخان. سوڵتان بایەزید کە بە تووڕە بوونی باوکی و هێرشی سەرۆک و سەرداران دەزانێ، بەرەو ئەرزەرۆم دەڕوا و هەر چەندی دەکەوێتە پاڕانەوە و پیاو دەنێرێ و داوای لێبووردن دەکا هیچی بۆ ناکرێ و باوکی نایبەخشێ و بەزەیی پێیدانایە. بۆیە بە نائومێدی لە ماوەی دووسێ ڕۆژاندا تیژ تێدەپەڕێ و خۆی دەگەیەنێتە ئەرزەرۆم. ئەیازپاشا (هەیاسپاشا)ی میریمیرانی عەرزەرۆم زۆری ڕێز دەگرێ و دەڵێ دەبێ تەشریفت چەند ڕۆژێک لێرە داسەکنی و منیش چۆنیەتی هەڵوێستی بەڕێزتان بە خزمەت پێچکی تەختی جێلەنگەری گەردوونی میری ڕادەگەیەنم و داوای بەخشینت بۆ دەکەم. بە پەند و ئامۆژگاری ورد و باریک گەلێکی دڵخۆشی داوە و گوێی بەم شێعرە نەبزووت کە دەڵێ:

هەرکەس داخوازێکی هەبێ نەیبینییەوە باشتر دەبێ

لەم کاتەدا سولتان سەلیمخان بە لەشکرێکی بە قەدرایە خیزی دەشتان گەیشتە سەری و سولتان بازید دەرفەتی ڕاوەستانی نەما و بەرەو سنووری قزلباشان تێیتەقاند. پیاوی ناردە لای شاقولیسولتانی حاکمی چۆخوری سەعد و باسی نیازپاکی خۆی بۆ کرد. وەختایەک ئەم هەوالانە لە قەزوێن بە گوێی موبارەکی پادشا گەیشتن، حەسەنبەگی یووزباشی ئۆستاجلووی ناردە پێشوازی و بە ڕێز و حورمەتەوە هێنایە خزمەت فەرمانڕەوا.

## سالی ٩٦٧ / ١٥٥٩ ـ ٦٠

ڕۆژی دووشەممۆی سێزدەی مانگی ڕەبیعی دووەمی ئەم سالە سولتان بازیدخان بە تەنتەنە و سەنسەنە و دوازدەهەزار سوارەوە ڕووی کردە قەزوێن و زۆربەی میران و پیاوماقوولانی قزلباش بە پیرییەوە چوون و لە کۆشکی پێشووی میری دابەزی. دوای سێ ڕۆژ لە مەیدانی تازەی قەزوێن کە پادشا سازی کردووە، کردیانە بەزم و ڕەزم و شادی و میوانییەکی گەورە و خوانێکی ڕەنگین ڕازایەوە و چۆن چاکە خانەخوێ ئاوای حورمەتی میوانەکانی گرت. بڕی دەهەزار تمەنی وەک خەلات و دیاری بەخشی بە خۆی و کوڕان و سەرکردەکانی و زۆربەی میران و بەگلەرانی داموودەزگای دەسەلاتی نێردرانە لای حاکمان و میرانی هەرێم و مەلبەندەکانی قەلەمڕەوی پادشایەتی هەتا وەرزی زستان لەو شوێنانە بحاوێنەوە و سەرەتای بەهار داوەرێنەوە ژێر ئالای سولتان بایەزید.

پیاوەکان و هاوڕێیانی سولتان بازید لە داهاتووی کاروباری خۆیان خورد بوونەوە و دلیان لە شاتۆماسب دەترسا و دەیانزانی بەو شێوەی کە شیاوە بە سولتان ڕاناگا و ڕووی تێناکا و سەرەنجام بە دلی سولتانی گەورە دەجوولێتەوە. بۆیە دەلوو قوددووز، سنان چەلەبی سەرحیساب، میرئاخوڕباشی، لەلەپاشا، فەرروخبەگ و عیسا چاشنیگرباشی (سەرتاماوچێژ- خوانسالار) کە کۆلەکەی ڕەشمالی دەسەلاتی بوون، پێکەوە ڕاوێژیان کرد و لێبڕان لە دەرفەتێکی لەباردا شاتۆماسب بکووژن و بەرەو بەغدا

یان بۆ لای شیروان و گورجستان بڕەون. چەند کەس لــە پیاوەکــانی سولــتان بایەزید بەتایبەت عەرەب محەممەد، چرکەس مــەحموود، مــستــەفا چەلــەبی نیشانەچی و قەرەئۆغرلوو بە هاودەستی حەسەن‌بەگی یووزباشی کــەتنەکەیان ئاشکرا کرد و بە پادشایان ڕاگەیاند. کاتێک سولتان بایەزید زانی کە ڕیــسەکە بۆتەوە خوری و نەخشەکە لە قاو دراوە، خێرایەکی داوای عەرەب محەممــەد و هاوڕێیانی کرد و هەر چواری کوشتن. بۆ بەیانی کە پادشا بەم ڕووداوەی زانــی دڵی تەواو گەردی گرت و ئاوێنەی بیری لێڵ داگیرا و کەوتە سووکایەتی پێکردنی. جەماوەری ڕەمەکی و بەدفەڕ و گێچەڵبازی قەزوێن تین دران و هرووژمیان بردە سەر ماڵی سولتان بایەزید و بەردەبارانیان کرد و هەزار جنێو و قسەی سارد و سووکیان لە پارسەنگی نا. کاربەدەستانی حکوومەت پێیان‌زانــی و چەکــداریان ناردن و بڵاوەیان بە حەشیمەتەکە کرد. بۆ سبەینێ وایــان دانــا کـــە سولــتان بایەزید لــەســەر پێوشوێنی جاران بانگهێشتنی دیوەخان بکەن و خــوانی بــۆ برازێننەوە و لە دڵی دەرهێنن و تۆڵەی سووکایەتی جەماوەری بێسەرەوبەرەی بۆ بکەنەوە. کاتێک وێڕای کوڕانی هێژا و گەورەپیاوانی بــەڕێزی بردیــانن بــۆ دیوەخان، لەڕێوە بێدەسەڵات کرا و خودی پادشای پایەبەرز هاتە سەر هەیوانی ژووری و فەرمانی دا کە قزڵباش بیانگرن و تێکیانەوەپێچن. لە چاوترووکانێکا دەهەزار کەسێک دەس و پێیان خرایە کۆت و زنجیر و لــە گــەڕەک و کۆڵانــەوە ڕاپێچی بەر دەرگای کۆشکی میری کران. لەم کۆمەڵە پێنج‌هەزار پیــاوی هــۆز و خێڵان وێڕای پیرحوسێن‌بــەگی توورغــوود ئۆغــڵی، ئەحمەدبــەگی زولقــەدری میربازەوان، عەبدولغەنی چاوەشی سیواسی، دەلوو سەیفەددینی قــەرامانی و عەلی‌ئاغای سەرسەگەوان خرانە ژێر ڕکێفی شا و شازادە مەزنەکان و ئەمیرانی بەرزەجێ. پاشماوەی قۆشەن کە غولام و غولامزادە و یەنی‌چەری و تۆرمەی تــر بوون قەلاچۆ کران و هەرچی ماڵ و سامانیانە دەستی بە ســەر داگــیرا و درایــە

دیوانی تایبەتی میری و چەند کەسێکی دەستەژمێر نەبێ لەو گێژاوە ڕزگاریان نەبوو.

هەر لەم ساڵەدا عیسای کوڕی لۆندی گورجی حاکمی زەکەم ئیمانی هێنا و بوو بە نوێمسوڵمان و باڵی بەخت سێبەری بە سەر کێشا و بڕوای ڕاست و پتەو ترووسکەی خستە دەروونی. لە دیوانی میرییڕا حکوومەتی شەککی پێبەخشرا و بە عیساخان ناودێر کرا. حوسێنبەگی یووزباشی و حوسێنبەگی ئۆستاجلووی قۆرچی تورکمان کە دەمڕاست و هەمەکارەی ئەو خانەدانە بەرزەوجاخە بوون دوابەدوای یەکتر مردن. جا لەبەروەی حوسێنبەگ پیاوێکی دڕ و زاڵم بوو باریکبینانی سەردەم، ڕێکەوتی مردنیان بە فیرعەونی دووەم[1] دۆزیبۆوە.

### ساڵی ٩٦٨ / ١٥٦٠ ـ ٦١

عەلیپاشای سپاسالاری سەردارانی مەرعەش ناسراو بە کیلۆن وێڕای حەسەنئاغای قاپووچیباشی (میردەرکەوان) وەکوو کەیخودا و ڕاسپاردەی سوڵتانی غازی نێردرانە قەزوێن و گەلێک دیاری و خەڵات و سێسەد ئاغا و خزمەتکاریان لەگەڵ خۆیان برد و داوای سوڵتان بایەزیدیان کردووە. میران و سەرۆکانی قزڵباش زۆر جوانیان پێشوازی لێکردن و بەوپەڕی ڕێزەوە بردیاننە شارەوە. پاش هێنانە گۆڕی داواکەیان، چەند دەست ڕەخت و زین و جلی زێڕچن و مەخمەر و کیمخوا بە دەسکەوساری نەخشینەوە لەگەڵ کەمەرشیر و فەرنجی پۆئاڵتوون بە دوگمەی لەعلی بەدەخشانەوە کە هەر کامەیان زیاتر لە مسقاڵێک بوون و کۆمەڵێک کووتاڵ و کاڵای هەرەباشی ڕۆم و فەرەنگ داندرانە خزمەت پادشا و ئەویش بە سۆزی میرانە و گۆشەنیگای فەرمانڕەوایانە بە سەری کردنەوە. دوای ڕێوڕەسمی میوانداری و بە دەورەداهاتن و بەخێرهێنان، پادشا جەعفەربەگی کەنگرلووی ئۆستاجلووی ڕەگەڵ خستن و ئیزنی گەڕانەوەی

---

[1] ١ - فرعون ثانی.

دان. لە کاتی گەڕانەوەدا نێردراوەکان بۆ ماڵاوایی چوونە خزمەت میر و ئەویش فەرمووی لە بەرامبەر ئەم خزمەتەدا کە تەنیا ناردنەوەی سولتان بایەزید و منداڵەکانییەتی، دەبێ بزانن زۆرم مەبەستی دڵی خونکارە و هیوادارم لوتف و چاکەی بە سەرمانەوە کەم نەبێ و داواکارم کە دەسەڵاتی هەرێمی بەغدا ببەخشێتە سولتان حەیدەرمیرزای کوڕم.

هەر لەم ساڵەدا ڕۆستەمپاشای مەزنەوەزیر ئەجەلی هات و مرد و لە ڕادەبەدەر زێڕ و زێو و گەوهەر و کەلوپەلی گرانبایی و سیهەزار کەوڵە سمۆرەی لە پاش بەجێما و محەممەدپاشای بۆسنەوی لە جێی داندرا.

## ساڵی ٩٦٩ / ١٥٦١ ـ ٦٢

ڕۆژێکی شاتەهماسب بە مەبەستی چوونە سەیران و ڕاو لە قەزوێنەوە ڕووی کردە باڵی تاروم و لە ناوچەی خەرزەویل کە دووئاوی سفیدڕوود و شاڕوود تێکەڵ دەبنەوە، چەند ڕۆژێک بنەی داکوتا و خۆی سەرقاڵ کرد بە ماسی گرتنەوە و پاشان گەڕایەوە قەزوێن. میهەنبانووی خوشکی بەر و پشتی مەشهوور بە سوڵتانم کە بەڕاستی یەکێک بوو لە گەورە خاتوونانی ڕۆژگار و گەلێک خێر و چاکەی لێهەڵوەریبوو کۆچیدوایی کرد. ئەم کەڵە شازادەیە زۆر خانەقا و کاروانسەرا و پردی ساز کردبوون و خوانی خێر و خێراتی هەموو چین و توێژێکی نێر و مێی گرتبۆوە. قەتی مێرد نەکردبوو و لەگەڵ براکەی دەژیا و گەلێک شوێنەواری باشی بۆ پتەو کردنی بناغەی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتی لە دوا بەجێمابوو. ئەم شازادە خاتوونە چوو بەرەو بانگاوازی هەق و لە ماڵی تەنگەبەری خۆبەزلزانیڕا ڕووی کردە دنیا و سەرسەرای شادمانی. شاتەهماسب لەگەڵ تەرمەکەی هەتا مەرقەدی نوورانی ئیمامزادە حوسێن ڕۆیی و لەوێشەوە ڕایانگواست بۆ پەنا گومبەزی مەشەدی ئیمام ڕەزا خودای لێڕازی بێ.

کۆمەڵێک لە پیاوانی قزڵباش وەک سۆندووکئاغای سپاسالار کە تەمەنی لە سەد ساڵی تێپەڕیبوو، وێڕای یادگار محەممەدی تورکمانی تورخان و میر

فەزلولڵای قازیعەسکەر و قازی عیمادی سەرپەرستی کۆشک و خانووبەرە و سەرسەرایان و میرزا کافی ئۆردووبادی قەڵەمدار کە هەرکامەیان لە کاری خۆیاندا کەس تای نەدەکردن، مردن.

لە ئاخری ئەم ساڵەدا وەلیبەگی ئۆستاجلووی یەساوڵباشی (سەرنیگابان) کە وەک نێردراو چووبووە ڕۆم، لەگەڵ خوسرەوپاشای میری‌میرانی وان و سنانپاشای چاشنیگیرباشی و عەلیئاغای چاوەشباشی کە بە مەبەستی وەرگرتنەوەی سولتان بایەزید و منداڵەکانی هاتنە قەزوێن، گەڕایەوە. ئەم پۆلە کەیخودایە لە باغی سەعادەتئاباد سێبەری بەخت بە سەر سەریانەوە سووڕایەوە و بە خزمەت پادشا گەیشتن و خوندکار بڕی چوارسەدهەزار فلووری سکەی سوور و شازادەی کامڕەوا سولتان سەلیمخان سەدهەزار فلووری ناردبوو کە سەرجەم دەبوو بە سیهەزار تمەن دراوی برەوداری ئێراق. هەروەها کۆمەڵێک دیاری و خەلاتی هەرەباش و گرانبایی ڕۆم و فەرەنگیان وێڕای چل سەر یەکسمی عەرەبی بە ڕەخت و زینی زێڕ و گەوهەربەندەوە هێنابوو. ئەوەندەیان دیاری جەواهێرنیشان و ملوانکە و متوموورووی چاک لە لایەن شازادانەوە هێنابوون بۆ کوڕان و کچانی فەرمانڕەوا کە ئەوانەی نرخی کاڵا دەبڕن و باشی لێدەزانن، بۆیان لە نرخاندن نەدەهاتن. چی نەغدینە و وشکەپووڵەکەیە لە ئەرزەڕۆم ڕاگیرابوو هەتا ئەگەر هاتوو پادشا سولتان بایەزید و کوڕەکانی بە دەستەوە دا، بدرێتە دەس نوێنەرانی میری. هەروابێتەوە سولتانی غازی و شازادە سولتان سەلیمخان بە خەتی موبارەکی خۆیان کاخەزیان نووسیبوو و بەڵێنیان دابوو چما بێتوو بایەزید و منداڵەکانی ڕادەستی پیاوەکانی ئێمە بکرێنەوە، هەرگیز لە لایەن خۆمان و کوڕانی بەختەوەرمانەوە هیچ خەسارێک تووشی پادشایانی سەفەوی نابێتەوە و دوژمنایەتییان ناکەین. هەمیشە لەسەر پێوشوێنی ئاشتی و پاراستنی بەرژەوەندی سوورین و نابێ هیچ زەرەدێک کە پێچەوانەی یەکێتی و

دۆستايەتی بێ لە لايەن ئێوە و کوڕەکانتانەوە خۆی بنوێنێ و ئێمە و حەولادەکانيشمان هەروا دەکەين... .

کاتێک شاتەهماسب لە خوێندنەوەی کاغەزەکە بۆوە و بە کاکڵ و نێوەرۆکی پوخت و پاراوی زانی و پێی گەشايەوە، لەڕێوە سولتان بازيد و کوڕانی ڕادەستی خوسرەوپاشا و هاوڕێيانی کردن و ئەمانە سولتان بازيد و کوڕەکانيان بەدزی لە مەيدان ئەسپی قەزوێن تێدابردن. با تۆڵەی ڕۆژگارمان لە بير نەچێتەوە و بزانين ڕاست لەو شوێنەی کە سولتان بايەزيد و کوڕانی کوژران، کوڕانی شاتۆماسبيش خێرايەکی لەوێ بە دەس شاسمايلی (دووەم) فزەيان لێبڕا. دوای ئەم کوشتارە تەرمەکانيان بە دارەتەرمان هەڵگرتن و لە عارەبانيان قايم کردن و ڕايانگواستن بۆ وان. ويستيان لەوێوە بيانبەوە ئيستانبووڵ کە لەپڕ فەرمانی سولتانی غازی هات مەيانهێننەوە و لە سيواس بياننێژن و بەپێی حوکمی خونکار جووڵانەوە و لە دەرەوەی شاری سيواس بە شانی چەپدا لە قەراخ ڕێيە تەسليم بە خاکيان کردن.

## ساڵی ٩٧٠ / ١٥٦٢ ـ ٦٣

لە سەرەتای ئەم ساڵەدا جەعفەربەگی کەنگرلووی ئۆستاجلوو کە وەک نێردراو چووبووە ڕۆم، لەگەڵ ئەلياسبەگ هەموو ئەو نەغدينە و کالايەی کە وەک خەڵاتی ڕادەست کردنەوەی سولتان بازيد، خوسرەوپاشا هێنابوويە ئەرزەڕۆم، وەريانگرت و برديانە قەزوێن و نيشانی پادشايان دا و ئەسپاردەی خەزێنەيان کرد.

هەر لەم ساڵەدا عيساخانی کوڕی لۆندی گورجی کە گەيبوويە پلەی هەرەبەرز و لە کۆڕ و کۆبوونەواندا وەلای سەرووی ميران و گەورەگەورانی قزڵباش دەکەوت و فەرمانڕەوا بە کورم بانگی دەکرد، کەوتبووە نێو ڕيزی شازادە مەزنەکانەوە. هەموو ساڵێ بڕی حەوتهەزار تمەن لە داهاتی ناوچەی شەککی و چەند مەڵبەندێکی ديکەی لەسەر حيسابی تايبەتی پادشا بۆ بڕابۆوە و

بە زیندەماڵ و مردەماڵ وەریدەگرت. لەبەر غللووری و فیز و دەمار و کەلکەڵەی شەیتانی، هەوا هەڵیگرت و کەوتە دنەدانی ئەزناوەران (مێرخاسان)ی گورجی بۆ کاری نالەبار و ڕاکردن لە قەزوێن و چوونەوە گورجستان. چەند کەس لە باوەڕپێکراوانی بەتایبەت ئاڵەتاقی چرکەس ئەم پیلانەیان بە پێچکی تەختی بەرزی میری ڕاگەیاند. پادشا لەڕێوە فەرمانی گیرانی دەرکرد و بە قۆڵبەست کراوی بردیانە قەڵای ئەلەمووت (هەڵەمووت) و خستیانە بەندەوە.

هەر لەم ساڵەدا میر تەقییەددین محەممەدی وەزیر لەسەر کاری خۆی لابرا و پلەی وەزارەت بوونە دوو؛ عێراق و فارس و کرمان میر شەمسەددین محەممەدی کوڕی میر وسووی ئەستەرابادی بۆ داندرا و خوراسان و ئازەربایجان و شیروان میر زەینەددین سەید عەلی کوڕی میر ئەسەدووڵلای مەرعەشی قەزوێنی کۆنە وەزیری بۆ دیاری کرا. لە درێژەی ڕۆژگاردا حەکیم نوورەددینی کوڕی مەولانا کەمالەددین حوسێنی کاشی و مەولانا قوتبەددین محەممەدی بەغدایی مەشهوور بە کوڕی قازی چوونەوە بەر دلۆڤانی خودا.

## ساڵی ٩٧١ / ١٥٦٣ ـ ٦٤

لەم ساڵەدا شاتەهماسب، مەعسووبەگی سەفەوی میردیوانی کردە سپاسالاری ئێراق و ناردییە سەر سوڵتان مرادی حاکمی مازندەران. سوڵتان مراد سەری وەبەر پادشا هێنا و گوتی هەرچی لە ڕابردوودا لە سەرمە دەیدەم و بۆ داهاتووش کەترەخەمی ناکەم.

پیرمحەممەدخانی کوڕی جانیبەگسوڵتان کوڕی محەممەد ئوغلان کوڕی ئەبولخێرخانی ئۆزبەک کە دوای مەرگی عەبدولعەزیزخانی کوڕی عوبەیدخان لە تەختی دەسەڵاتی بەلخ پاڵی دابۆوە لە مەودای ساڵدا بە فیتی دەستەیەک پیاوخراپی خوراسان بۆ گرتنی تووس ڕووی کردە مەشهەدی پیرۆزی ئیمام ڕەزا. چەند ڕۆژێک شارەکەی ئاڵقە دا و ئاخرییەکەی کۆمەڵێک دیاری و خەڵاتی دڵدانەوەی ناردن بۆ سەیدان و خزمەتکارانی ئاستانەی بارگای ئیمام و بە

پەشیمانی گەڕایەوە. یەکێک لە ڕکێفدارانی کە «تۆلەک بەهادور»ی پێدەگوترا بە دیاری و پێشکەشییەوە ناردی بۆ خزمەت شاتەهماسب و داوای لێبووردنی لێکرد. میری مەزن کابرای ڕاسپاردەی بە لاواندنەوەی میرانە بە سەرکردەوە و حوسێنبەگی یەساوڵباشی شاملووی قالقانجی ئۆغلی وێڕای تۆلەک بەهادور بەڕێکرد و گەلێک دیاری شیاوی ناردە بەلخ. بناغەی ئاشتی و دۆستایەتی پتەوتر کرا و دوای بەخێرهێنان و میوانداری، حوسێنبەگ ئیزنی گەڕانەوەی درا. دواتر پیاوماقووڵان و مەزنان و پێشەوایانی ئایینی ئەوبەرڕووبار بە مەبەستی چوونە ماڵی خودا و حەج کردن داوەرین و ڕۆیشتن.

هەر لەم ساڵەدا خێزانی شانیعمەتوڵڵای دووەم کە خوشکی شاتۆماسب بوو کۆچی کرد. شانیعمەتوڵڵا ویستی بەرەو مەکە و مەدینان باژوێ و لە ڕێی بەغداوە بزووت و کاتێک وێڕای پۆلێک لە مەزنانی عێراق گەیشتە بەغدا، خوسرەوپاشای میریمیران دەستی وەبەر هێنا و نەیهێشت بچێ. ئەویش چووە زیارەتی مەرقەدی پیاوچاکان و بایدایەوە و وەختایەک گەیشتە هەمەدان، بەرەبەیانی ڕۆژی هەینی یازدەی مانگی قوربان بارگەی بەرەو دنیای هەرمان تێکنا.

## ساڵی ٩٧٢ / ١٥٦٤ ـ ٦٥

لەم ساڵەدا شاتەهماسب مەعسوومبەگی سەفەوی میردیوانی کردە سپاسالاری عێراق و کرمان و بەرەو خوراسانی نارد. عەلیسوڵتانی ئۆزبەک کە ناوچەی خەبووشانی بە زۆرەملی داگیر کردبوو، میر شاریاری وەزیری خۆی بۆ ڕاگرتن و پاراستنی ڕاسپاردبوو. لەم کاتەدا میر شاریاری بۆ دیداری عەلیسوڵتان چووبووەوە ئوورگەنج و پاڵەوان «قەمەری»یەکی بالادەستی دەسەڵاتی خۆی لە قەڵای خەبووشان دانابوو. لەبەر دۆستایەتی و دەسەڵاتخوازی پادشایەتی دەستەیەک لە میر شاریاری وەخۆ کەوتن و کوشتیان و تاقمێکیان دەرکردن. وەختایەک عەلیسوڵتان بەم ڕووداوەی زانی بە

مەبەستی گوێبادانی پاڵەوان قەمەری ڕووی کردە خەبووشان، بەڵام هیچی بۆ نەکرا و تەشریفی نائومێد و خەساربار گەڕایەوە. شاتەهماسب زۆر چاکی قەمەری وەبەر دڵی کەوت و بە سەری کردەوە و ناوچەی «کێلیدەر»ی باربوو کرد. خولاسەی کەلام مەعسوومبەگ وێڕای میران و بەگلەران بە ئامانجی گرتنی نێسا و ئەبیوەردی ژێر دەسەڵاتی کاربەدەستانی عەلیسولتان و ئەبولمحەممەدخانی کوڕی دینمحەممەدخانی برای بزووتن و قەڵاکانیان دەورە دان. لەبەر درێژبوونەوەی ڕۆژانی گەمارۆ و چوونی عەلیسولتان بۆ یاریدەی ئەبولمحەممەدخانی برازای لە قەڵاتی ئەبیوەرد، هێزەکانی قزلباش کێچیان کەوتە کەولی و مەعسوومبەگ دەستی لە ئابلۆقە هەڵگرت و بەرەو مەشەدی پیرۆز ڕۆیی. لەو دەمەدا هەواڵی سەرهەڵدانی قەزاقخانی کوڕی محەممەدخانی تەکەلووی کوڕی شەرەفەددینی حوکمڕانی هیرات کە دە سەریان کردبوو بچێتە هرووژمی ئەبیوەرد، بلاو بۆوە. قەزاقخان سەرەڕای نەچوون، گەردنی لە ژێر نیری فەرمانبەرداری دەرکێشا و ڕووی لە ئاستانەی میری وەرگێڕا و خەیاڵی خاوی بەتاڵ کەوتنە مێشکی و ئەم خەبەرانە دوای لێوردبوونە وەڕاست گەڕان. بەڵام دیسانیش خاوەنشکۆ قازی قوتبەددینی بە مەبەستی ئامۆژگاری ئەو چەواشەیەی بیابانی گومڕایی بەڕێکرد و کۆمەڵێک حوکم و فەرمانی پەنامەکی بۆ برایانی و ئامۆزاکانی نارد و ڕایسپارد هەرکەس قەزاق تێدابەرێ، دەیکەمە حوکمدار و دەسەڵاتی ناوچەکەی خەڵات دەکەم. وەختایەک براکانی بە گفت و بەڵێنی پادشایان زانی، مستەفابەگ، ئەحمەبەگ، موسەییببەگ، شەرەفەددینبەگی کوڕی وەیسەسولتان و چەند کەسێکی ئاوا پێکەوە ڕێککەوتن کە بە دڵ و بە گیان بۆ سەرەنخوونکردنی قەزاق هەوڵ بدەن و پشتی یەکتر بگرن. ویستیان تاقمێک پیاوماقووڵی دیکەی تەکەلووش بکەنە هاودەنگی خۆیان کە ڕازەکەیان درکا و تەقییەوە. قەزاق ویستی بیانگرێ و کۆمەڵێکی بۆ ئەم ئەرکە ڕاسپارد، کەچی ئەوانیش پێیان زانی و لە سێباری

شەودا دەروازەی قەڵایان شکاند و بەرەو غووریان باڵیان گرت. لە مەودای ڕێیەدا پیاوانی قەزاق گەیشتنە سەریان و ئەحمەدبەگ و موسەییببەگ گیران. مستەفابەگ و شەرەفەددینبەگ لەگەڵ پۆلێکی هاوڕێکانیان قوتار بوون و خۆیان هاویشتە قەڵای کووسوویە و پەنایان بردە بەر سۆفی وەلی خەلیفەی ڕۆملووی حوکمڕانی وێندەرێ. قەزاق براکانی دیکەی وەک حوسێنقولیبەگ و حوسێنخانبەگی مەنتەشالووی ناردنە سەر سۆفی وەلی خەلیفە کە بە زۆری و زۆرداری داوای براکان بکەنەوە و دەورەی قەڵایەی لێبگرن. سۆفی وەلی خەلیفە چۆنیەتی ڕووداوەکەی لە کاخەزێکا نووسی و ناردی بۆ لای مەعسوومبەگی سپاسالار و شازادەکانی بەناوبانگ سوڵتان برایممیرزا و بەدیعوززەمانمیرزا کوڕانی بارامميرزا کە وێڕای ئەمیران لە مەشەدی پیرۆز بوون. کاتێک مەعسوومبەگ و شازادان بەم ڕووداوەیان زانی و لەمێژ بوو چاوەڕوانی هەلێکی لەبار بوون، لە جێبۆسەیان دەرپەڕین و بەتێکڕا هەڵمەتیان برد و وەلی خەلیفەی شاملوو و خەلیلخانی سیامەنسووریان وەک پێشقەرەوڵ بەپرتاو بەڕێکرد. هێزەکانی میری دوابەدوایان ئەسپیان لینگ دا و پێشەنگان لە ناخافڵ بە سەر لەشکری تەکەلوویان دادا و کۆمەڵی چوارهەزار کەسەیان کردنە تۆوی هەرزن و ئەستێرەی حەوتەوانە. زۆریان بە تیران و لەپەشیران ئەنگێوران و متەقیان لێبڕا و هەزارەزیلەی تەکەلوو بوونە ڕێبواری ڕێی ڕاکردن و بەرەو هیرات ڕەوین. وەختایەک قەزاق بەم دەستوبرد و زەبرەی زانی برایان و کوڕانی ئیزن دا کە ئەوەندەی کەلوپەل و ماڵ و سامان و یەکسمێکی بۆیان دەچێ لە خەزێنە و یەختەرمەخان دەریکێشن و بۆ هەر شوێنێکی پێیان خۆشە برۆن. خۆشی لەبەروەی قۆڕ بوو و تابشی ئەسپسواری و هاتوچۆی نەدێنا، لەگەڵ شازادە سوڵتان محەممەدمیرزا ڕووی کردە قەڵای ئیختیارەددین و ماتەی هەڵگرت. مەعسوومبەگ و شازادەکان و سەرداران دوابەدوای ڕاکردووان گەیشتنە دەروازەی شاری هیرات و بێهیچ گرێ و کۆسپێک لێی وەژوور کەوتن.

مەعسوومبەگ خۆی رووی کردە دەروازەی حەوشەی ئیختیـارەددین و لـەوێش کەس دەستی وەبەر نەهێنا و بێ سێودوو تێپەڕی. منی نووسەر خۆم لە چەنـد مەزنەپیاوێکم بیستووە کە وەختایەک مەعسوومبـەگ چـاوی بـە قـەزاقخـان کەوتووە و دیویەتی لەسەر دۆشەگەڵەیەک ڕۆنیشتووە و کڕنۆشی نەکردووە، بە گاڵتە گوتوویەتی کە ئەسپێک بێنن بۆ جەنابی خـان هـەتا بچێتـە پێـشوازی شازادەکان و میران و گەورەپیاوان. قەزاق لە وڵامدا گوتوویەتی ئەگەر قەزاقخان تاقەتی هاتوچۆ و سواربوونی بووبا، ئێـوە نەتانـدەتوانی ئەوەنـدەی شـوو لێهەڵکێشن. تازە با وا بێ و ئەوەی پادشا لە بابەت منـەوە پێـیئەسـپاردوون بیکەن و ڕامەوەستن. دوای ئەم قسانە کەژاوەی بـۆ هێنـاوە و بـەڕێی کردۆتـە خـزمـەت شـازادەکـان. مەعسوومبەگ ماوەی سێ شـەو و ڕۆژی یـەکبین لـە ژووری حەوشە مایەوە و کەوتە دەست بە سەر داگرتنی ماڵ و سامان و خەزێنە و زێڕ و جەواهێراتی حەشاردراوی نێو کووپەی چاڵ کراو کە قەزاقخان ماوەیەکی دوورودرێژ بە زوڵم و زۆرەملی کۆی کردبوونەوە. مەعسوومبـەگ بـەم کـارەی کەوتە بەر لۆمە و لەقەمی میران و زۆرێک لـە قـزڵبـاشـان و شاتۆماسـبیش لێی کەوتە گومان و تۆماتی خەیانەتیان پێوەبەست. قەزاق دوای چەند ڕۆژێک لە زیندانی مەعسوومبەگدا مرد. بە گوتەی هێندێکان خنکاندیان و دیارە خودا هەر بۆ خۆی دەزانێ. زانایەک سەبارەت بە ڕێکەوتی کوژرانی وتوویەتی:

لەبەر تۆفانی زوڵمی خانی حـەجـاجـی سانی
خۆی نەدەگرت هیچکەسێ دەرچوونی نەدەتوانی
خەڵکی هیراتێ هەموو هێندە تـەفـرە درابـوون
مەرگ و نەمانی خۆیان بە ژینـی نـوێ دەزانـی
لە شەترەنجی شەهەنشا چەشنی قەڵایە سوورا
بە لاساری دەرۆیی، بە ماتیی خـۆی نـەزانـی

چونکە بە کوژرانی وی هیرات بۆوە ئاوەدان
ئاوەدانی هیراتێ[1] بۆ ڕێکەوتی نەمانی

ئەمجار لە دەرک و دیوانی پادشاوە جڵەوی حکوومەتی هیرات درایە دەس میر غەیبسوڵتانی ئۆستاجلووی کوڕی هەلهەل بەهادور. وەرزی زستان مەعسوومبەگی سەفەوی و تێکرای ئەمیران لە هیرات خێڵبەزیان کرد.

شەوی دوازدەی مانگی شابان شاتەهماسب، ئیمام محەممەدی مەهدی لە خەونیدا چاوپێکەوت؛ بۆیە داهاتی پیتاکی قەڵەمڕەوی ژێر فەرمانی کە ساڵێ بە بڕی سیهەزار تمەنی بەروەداری ئێراق دادەندرا و لە پەڕاوی موبارەکیدا دەنووسرا و تۆمار دەکرا، سەر لەبەری ڕەش کردنەوە و خێرەکەی پێشکەشی ڕووحی دوازدە ئیمامان کرد کە یارەببی خودای مەزن لە هەموویان خۆش بێ.

## ساڵی ٩٧٣ / ١٥٦٥ ـ ٦٦

لەم ساڵەدا فەرمانڕەوای جیهان و خونکاری سەردەم سوڵتان سولەیمانخان، بەهار و جستانی ڕۆژگاری موبارەکی بە خۆشی و کامەرانی لە قوستەنتەنییەی پایتەخت ڕابوارد.

شاتۆماسب وەرزی هاوین و زستان لە قەزوێن بنەی دانا و بە وردی کەوتە ڕاپەڕاندنی کاروباری هەرێمەکان و هاودینان. مەعسوومبەگ ئەرکە گرینگەکانی خوراسانی جێبەجێ کردن و گەڕایەوە.

## ساڵی ٩٧٤ / ١٥٦٦ ـ ٦٧

میری تاجبەخش و خاقانی جیهانگیر سوڵتان سولەیمانخان بە مەبەستی گرتنی قەڵای سەگتۆوار و کوشتاری کافرانی لاساری ئەو خاکە، سەرەڕای پیری و نەخۆشی باداری بە سواری کەژاوە لە کۆشکی شان و شەوکەتی دەرکەوت و

---

١ - معموری هرات، دەبێتە ساڵی ٩٧٢.

قوبەی خێوەت و سەراپەردەی سەریان گەیشتە پەرپەرۆچکەی ئاسمان و لە خۆر و مانگیان تێپەڕاند. هەرچەندی پزیشکانی شارەزا و حەکیمانی وردبین و وەزیران و ئەمیران و ڕیشسپی و ئاغایان بە دەورەیدا هاتن و تکایان لێکرد کوێرەوەری ئەم سەفەرە وەبەر خۆی نەنێ، بەلام ئەو سولتانە بەجەرگ و خونکارە بەشەرەفە جوابی نەدانەوە و لە ولامدا فەرمووی ئەگەر ئەجەلم هاتبێ با لە خەزای کافراندا ببڕێتەوە هەتا بۆ سبەی ڕۆژی ڕابوونەوە لە ڕیزی شەهیداندا حەشرم بکرێ. کاتێک سولتانی غازی ڕۆیی و دەورەی قەلای سەگتۆواری دا و هێزە سەرکەوتووەکانی ماوەی چل ڕۆژان لەوێ مانەوە، لەپڕ خەبەر هات کە لەشکرێکی وەکوو گەلای داران لە تۆرەمەی کافرانی قەلای گولە و ئاگری دێنە هانای لادینانی سەگتۆوار. وەختایەک تیشکەی ئەم هەوالانانە ئاوێنەی بێگەردی بیری سولتانی هەمیشە بالادەستی ئەنگاوت، پەرتەوپاشای وەزیری وێڕای چلهەزار یەنیچەری و سوارە ناردی بۆ شەڕی کافران و قەلای گولەی دەورە دا. لە ماوەیەکی کورتا ئەو دژە قایم و بەرزە گیرا و نیزیکەی چوارهەزار سوارە و پیادەی لادینان کە پەیمانی ئامان و پاراستنیان پێدرابوو، قەلایان بە دەستەوە دا و دەرکەوتن. بەلام هێزەکانی یەنیچەری و قەپووخولقی گوێیان بە وادە و بەلێنی وەزیر نەبزووت و هەلیانکردە کافرانی بەختوەرگەڕاو و شیری تیژیان تێنان و دەماریان دەرهێنان و هەموویان لەتوپەت کردن. مال و دارایی و شتومەکیان تالان کرا و قەلا درایە دەس مەردانی بەئەزموونی کاردیدە و بە سلامەتی و بە دەستی پڕ گەڕانەوە.

لە مەودای گەمارۆدا ئەو پادشا غەزاکەرە سەری لەسەر سەرینی بێهێزی و کەلەکە و تەنیشتی لە ڕووی ڕایەخی نامرادی جوێ نەکردەوە. وەختایەک نەخۆشی لێی توند کرد نزگەرەیەکی یەکبین دایگرت و حالی موبارەکی شێوا و کەوتە شادەوئیمان هێنان و زمانی کردە ئاوێنەی بالانوێنی دل و گیانی و چەند جارێک بە زاریدا هات کە خودا یەکە و نابێ بە دوو. پاشان ڕووحی

بەهەشتییانەی کەوتە شوێن گازیدەرێکی کە هەرای دەکرد: «تۆش ئەی گیانی لە خەمڕەخسیو! بە دڵخۆشی بچۆوە لای پەوەرندەت؛ چون ئەوت لە خۆ ڕازی کرد.»[1]

دەستی شکاوم بۆ خاوەنشکۆی بە تەگبیر و ژیر
جێگرەوەی جەم، تاجبەخشی وریا و میری جیهانگیر
حەیف کە دنیا تازە پیاوی وا ناخاتە ڕووی ژین
تا سەد سەدەی دیش میرێکی ئاوا عادڵ و بەدین
حەیف یەکی وا نادۆزێتەوە هەرگیز ئاسمان
لە نێو ئاوێنەی مانگ و هەتاو و پۆلی ئەستێران

دوای قەومانی ئەم ڕووداوە تاڵ و ناخۆش و جەرگبڕە مەزنەپیاوانی حکوومەت و گەورەگەورەکانی بەرفەرمانی چەند ڕۆژێک تەرمی ئەو پادشا خوابەخشیوەیان شاردەوە و بەپەلە و بێڕاوەستان کەسێکیان نارد بە شوێن شازادەی جیهانگیر سوڵتان سەلیمخاندا و خێرایەکی هێنایانە هۆردووی بێلەمپەر و بەرگری و دایاننایە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی. وەزیران و پیاوماقووڵانی دەسەڵات دەستەدەستە چوونە خزمەتی و بە خێریان هێنا و پیرۆزبایییان لێکرد. لە مەودای نەمانی سوڵتانی غازی و هاتنی شازادەی بەرزەجێدا قەڵای سەگتۆواریش بە زۆری و زۆرداری گیرا و بەردەس کرا.

میری خوداڵێخۆشبوو سوڵتان سولەیمانی غازی حەفتا و چوار ساڵ ژیا و چل و هەشت ساڵی فەرمانڕەوایەتی کرد. بەڕاستی پادشایەکی بەغیرەت و بە تەگبیر بوو. وڵاتی ئەنکرووس، دوڕگەی ڕوودس، قەڵای بێلگراد، شاری بەغدا،

---

١ - «یاایتها النفس المطمئنه، ارجعی الی ربك راضیة مرضیة »، قورئانی پیرۆز، سوورەی فەجر، ئایەتی ٢٧-٢٨، ل ٥٩٤، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار...

هەرێمی بوغدان و یاغیبووانی فەڕەنگ و ئاڵمان هەموویان کەوتنە ژێر پێوپلی هێزەکانی و هیچی نەیانتوانی سەر بکەنەوە. لەوەتی دنیا بە دنیایە کەس پیاوی ئاوای نەدیوە.

لـــەم زەمانـــەدا کـــەس تـــای تـــۆ ناکـــا
هەرکـــەس دەڵـــێ هـــەس بـــا نیـــشانم دا

لە مەودای ژیانیدا چاردە سەفەری سەرەوخێری کردوون و هـەموو جـارێ دوژمنانی بەزاندوون و بە سەرکەوتوویی گەڕاوەتەوە کە بریتین لە: ١- هرووژم بۆ سەر ئەنکرووسی شوم. ٢- پـــەلاماردانی فەڕەنگـستان و گـرتنـــی قـەڵای ڕوودس. ٣- هەڵمەت بردنە سەر ئەنکرووس. ٤- چوونە سەر ئاڵمان و نەمسا و داگیرکردنی دژی بدوون (بوودین). ٥- هێرش کردنە سـەر خـاکـی عـەجـەمان. ٦- تەپدانە سەرخاکی فەڕەنگ. ٧- دەورەدانی قەرەبوغدان. ٨- داوەرینە وڵاتی عەجەمان بە دنەی ئەلقاسمیرزا. ٩- چـوون بـۆ سـەر ئەنکرووس و گـرتنـی ١٠- گورم بەستن بۆ سەر بەچ. ١١- لەشکرکێشان بـۆ سـەرزەمینی عەجـەمان و چوونە نەخجەوان. ١٢- گاڵ دانی قۆشەن بۆ سەر سوڵتان بایەزید لە ئێسکوودار. ١٣- چوونەوە سەر ئەنکرووس و پێوەبەستنی تاوانانـەی لادینـی بـە قەراڵـی بەدئاکارەوە. ١٤- ئاژاوتنی سپا بۆ سەر سەگتۆوار.

خونکاری بەرزەشان زۆربەی جاران هێزەکانی لە کـار و کـرداری دزێـو و نالەبار دەگێڕایەوە و جەماوەری دنە دەدا بۆ کردەی باش و خـۆ پاراسـتن لـە ئاکاری لەمپەر بۆ داندراو. بەڵام چ کەردەن، ڕۆژگار بە مەیلی خۆی دەسووڕێ و گەردوونی چەپگەرد پیاڵەی شەرابی خەستی وەک گوڵاڵەی تێراوی لە بەردی دا و شکاندنی. دەنگ و چریکەی خۆشی گۆرانیبێژان و چاوەشان چەشنی چەنگی لار و کۆم لە گۆشـەیەک بـە کپی و بێـدەنگی سـەری کـردبـوویە سـەر ئـەژنۆی

سەرسوڕمان و بە نینۆکی داخ و کەسەر سینگی خۆی دەڕنی. میری زەمانە ئەستۆی سوراحی شکاند و سەری کووپەی پەڕاند و گوێی تار و تەمبووری کردن و پشووی شمشالانی بڕی و سینەی دڕین. سازژەنان کەوانی شکاویان فڕێدایە سەحرایە و ئاهەنگی زیل و بەمی چەنگ و چەغانەیان بە پوولێکی سووتاو نەدەکڕی. حاڵی کۆمەڵی مەیخانەنشینان پەشێو و زاریان بە قفڵ و قەپازە بوو.

تۆ کارسازی خەڵکی، کەست وەدوا نەداوە
جیهان بە تۆوە خۆشە و شۆق و شەبەنگی داوە

لە سەردەمی ئەم خونکارە مەزن و پادشا دادەوان و میرە وریا و بەختیار و سوڵتانە مسکێن‌لاوێنەوە و زوڵم سووتێنەدا، جەماوەری ڕەمەکی و لەشکری دووچاوەکییان لە مابەینی‌دا نەکراوە. هەر دادخوازێک لە گەشت و ڕاو و سەیران‌دا سەرەڕێی لەو قاقانە کامڕەوایە گرتبێ، هەتا گوێی بۆ سکاڵاکەی شل نەکردبێ و بە وڵامی شیاو جوابی نەدابێتەوە، تێنەپەڕیوە و خۆی نەبواردووە. لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی موبارەک و خەلافەتی دادپەروەرانەی‌دا، کاروباری خەڵک یەکجار بە ڕێکوپێکی هەڵدەسووڕا، بەتایبەت خودی شاری قوستەنتەنییە بە جۆرێک خۆش و ئاوەدان ببۆوە کە بەپێی فەرمانی سوڵتان، زەکەریا ئەفەندی کەوتە گەڕان و پشکنین و توێژینەوە و ئەوانەی توانیویەتی بیانژمێرێ بریتی بوون لە: ١- ٣٩٨٣ گەڕەکی مسوڵمانان. ٢- ٢٠٨٥ گەڕەکی هەرمەنییان و جوولەکان. ٣- ٤٨٥ مزگەوتی گەورەی جومعە. ٤- ٤٤٨٣ مزگەوتی گەڕەکان. ٥- ١٦٥٠ قوتابخانە. ٦- ٥١٥ خوێندنگە. ٧- ١٠٠ باڵەخانەی بەرز. ٨- ٥٠ خانەقا. ٩- ٢٨٥ تەکیە و دەروێش‌دان. ١٠- ٨٧٢ گەرماوی گەڕەکان و مەزن و ماقووڵان. ١١- ٤١٧ کاروانسەرا. ١٢- ٩٤٧ کانیاو. ١٣- ٤٩٨٥ ئاوخانە کە

حەشامەتی لێ تێراو دەکرێ. ١٤- ٣٨٠ نانەواخانە. ١٥- ٥٨٦ ئاشی ئاوێ. ١٦- ٥٣٩ شەرابخانە. ١٧- ١٣ قەپان. ١٨- ٨٤٣ کلیسای کافران. دیارە ئەگەر بێتوو باشتر تێگەڕابان بێگومان دوو هێندە دەبوون.

شوێنەواری خێر و چاکەی سولتان سولەیمانخان بریتین لە: ١- دانانی مزگەوتی گەورەی نوێژی هەینی و تەکیە و پشووگە و نەخۆشخانە و حوجرەی فەقێیان لە شاری ئیستانبوول. ٢- هێنانی ئاوی کانیاوێکی گەورە بە ئاوبارە و قەمتەران لە ڕێگای دوورەوە بۆ نێو شار کە چەند ئاشگێڕێکی ئاو لەبەر دەڕوا و گەلێکی پارە تێچووە. ٣- دانانی مزگەوتێکی گەورە لەسەر گلکۆی سولتان سەلیمخانی باوکی کە تەکیە و حوجرەی فەقێیانیشی پێوە ساز کراوە. ٤- دانانی قوتابخانەی لەتیفی لە «یەنگیباغ». ٥- سازکردنی مزگەوتی چاک و تەکیە و خوێندنگای هەرەباش بۆ منالان، لەبەر شادی ڕوحانەتی شازادەی خوادالێخۆشبوو سولتان محەممەد لە نیزیک خانەکانی یەنیچەری. ٦- نوێ کردنەوەی وارش و گومبەزی مەرقەدی ئیمامی مەزن ئەبووخەنیفە خودای لێی ڕازی بێ، کە مزگەوت و خانەقاشی لە پەنای داناوە و دەورەی چاک تەنیوە و زێرەوانیشی بۆ دیاری کردووە. ٧- کەڵتە کردنەوە مەزاریترووسکەداری شێخ عەبدولقادری گەیلانی، گۆڕەکەی پڕ بێ لە نوور. ٨- سازکردنی مزگەوتی جومعە لەسەر مەرقەدی شازادە جانگیر لە غەلتە. ٩- دانانی مزگەوتێکی بەرز لە پەنا گلکۆی گولاوپژێنێ مەولانای ڕۆمی لە قوونییە. ١٠- چاک کردنەوەی کلیسایەکی گەورەی تێکرووخاو لە کەفە و کردنی بە مزگەوت و دوو دەست حەمامی خۆشیشی لەوێ ڕۆناوە. ١١- گۆڕینی کلیسای کۆنی ئێزنیک بە مزگەوتی نوێژی هەینی. ١٢- لە قودسی پیرۆز لەسەر تاتەبەردی موبارەک قوبەیەکی بڵیندی هەڵخست و مزگەوتی گەورە و خانەقای هەرەچاکی بە پەنایەوە دانا. ١٣- میوانخانە و خوێندنگە و مزگەوت و تەکیەی لە تاخی قەسری ئەبلەقی شام ساز کرد. ١٤- دروست کردنی مزگەوتی گەورە و قوتابخانەی باش و کۆمەڵێک باڵەخانەی

پڕخێرات و نەخۆشخانە بۆ ڕووحی دایکی شازادەکانی پایەبەرز لە دەلکووتاشی ئیستانبوول. ١٥- بۆ خێری تایبەتی خۆی لە کابەی مەزن پشووگە و هەژارخانەی پڕ خورد و خۆراکی دانا و لە مەدینەی نووورانی گەلێک بینای بەقازانجی هەڵخستن و وەقفی تەواوی تەرخان دا بۆ تێر و تەسەل کردنی هەژاران. ١٦- کانیاوێکی زۆری ڕاکیشاون و مزگەوتی جامیع و باڵەخانە و جێسانەوە و میوانخانەی لەسەر پردی مستەفاپاشا لە مەحمییەی ئەدرنە دروست کردوون.

سوڵتان سولەیمانخانی غازی هەشت کوڕی لێکەوتۆتەوە: ١- سوڵتان سەلیم ٢- سوڵتان مستەفا ٣- سوڵتان محەممەد ٤- سوڵتان بایەزید ٥- سوڵتان جانگیر ٦- سوڵتان مراد ٧- سوڵتان مەحموود ٨- سوڵتان عەبدوڵلا. سوڵتان مستەفا و سوڵتان بایەزید لە سەردەمی باوکیاندا کوژران. سوڵتان محەممەد، سوڵتان مراد، سوڵتان مەحموود، سوڵتان عەبدوڵلا لە دەورانی ژیانی بابیاندا کۆچیان کرد.

سوڵتان نۆ مەزنەوەزیری هەڵبژاردوون: ١- پیرمحەممەدپاشای قەرامانی ٢-برایمپاشا ٣- ئەیازپاشا ٤- لوتفیپاشا ٥- سولەیمانپاشا ٦- ڕۆستەمپاشا ٧- ئەحمەدپاشا ٨- عەلیپاشا ٩- محەممەدپاشای بۆسنەوی.

سوڵتان جاروبارە شێعر و پەخشانی ناسک و ڕێک و ڕەوانی بە قەڵەمیدا هاتوون و زمانی گەوهەربارێنی بە پاراوی لێ بزاوتوون. بە نازناوی «موحیببی» شێعری داناوە و ئەم دوو لینگە هۆنراوەیە لە سەرچاوەی خەیاڵی ناسکی ئەو پادشا مەزنەوەجاخە هەڵقوڵیون:

باز از تش دل، دیده پر آب است مرا
کار این چشمه ز سرچشمه خراب است مرا

❋❋❋

هایوهودن فارغ اول عالمـده سـلطانلق بـودر
پندنی گوش ایلکـل مـورک سـلیمانلق بـودر[1]

قازیلەشکرەکانی سەردەمی پێشەوایەتی سولّتانی غازی ئەمـانـە بـوون:
١- مەلا عەبدولواسیع چەلەبی ٢- مەلا قەدری ئەفەندی ٣- مەلا مەعلوول ٤-سنان چەلەبی ٥- بوستان چەلەبی ٦- ئاوڕەحمان ئەفەندی ٧- مەلا حامید ئـەفەندی ٨-پەرویز چەلەبی.

کۆمەڵی زانایان و شێخانی هاوچەرخی سولّتان سولەیمانخان لە خـاکی ڕۆم بریتـی بـوون لـە: ١- مـەولانای مـەزن و سـەرتۆپی پیـاوانی نموونـە و ئاکارچاک، مامۆستا خێرەددین ئەفەندی کە لە شـارۆکەی قـەستـەمـوونـی پێیناوەتە جەغزی ژیان و کەسـایەتییەکی گـەلێک خوێنـدەوار و بلیمـەتێکی وردبینی هەڵکەوتە بووە. سەرەتا بۆتە مامۆستای پادشا و تەواوی تەمەنی پـڕ خێر و بەرەکەتی لە تەنیشت شادا تێپەڕ کردووە. ٢- مەولانا کەمال پاشـازادەی بە قورساغ و ڕەندەپیاو کە مەزنی زانایانی زەمـان و سـەرترینی شـارەزایانی

---

١ -

سەرلەنوێ ئاگری دڵ داییسێ، چـەم پـڕ ئـاوە
کـەچی چـاوم، لـە سـەرینچاوەکەوە لـێڵاوە

❋❋❋

لە هەرا دوور بی لە دنیـا خـودی سولّـتانەتییە
پەندی موور گوێ بدەیە، نەقڵی سولەیمانەتییە

ڕۆژگارە. تێکڕای گەورەمەلایانی ڕۆم لەسەر ئەم باوەڕەن کە هیچکەسی ئاوا پڕ و تەواو و چازان لە ڕۆم دەس ناکەوێ. گەلێک نووسراوە و شێعری تەڕ و ناسکی تورکی و فارسی هەیە. بۆتە موفتی سەردەم و پێیدەڵێن موفتی جنۆکە و ئادەمی. ٣- مەولانا سۆفی عەلی چەلەبی کە بۆتە موفتی و گەلێک شەریعەتزان و دیندار بووە. ٤- سەعدی چەلەبی کە لە پلەی قازیەتی ئیستانبووڵەوە گەیوەتە پایەی بەرزی فتوادان. ٥- مەولانا محیّدینی چەلەبیزادە کە سەرەتا بۆتە قازیقۆشەنی ئاناتۆلی و ڕۆمئیلی و پاشان بۆتە موفتی. ٦- قەدری چەلەبی کە پێشەنگی زانایان و پوختە و هەوێنی خوێندەوارانی لەزەبری سەردەمی خۆی بووە. ٧- مەولانا چۆویزادە کوڕی مەولانا محەممەد کە لە پێشدا بۆتە قازیئەسکەری ئاناتۆلی و دوایە بۆتە ڕێکخەری ڕێوشوێن و ڕێسای فتواکان و گەلێک پرسی گرینگی دیکەی نێو کۆمەڵ. ٨- بەڕێز شێخ عەبدولکەریم ئەفەندی کە پیاوێکی دڵگر و خوێنشیرین و وردبین بووە و جارجارە لە مزگەوتی بچووکی ئەیاسۆفییە خوتبەی داوە و سەرەنجام بۆتە موفتی زەمانە. ٩- سەرگوڵی پیتۆڵان و زانایانی زەمان مەولانا ئەبووسعوودی ناسراو بە خواجە چەلەبی. ئەم مەزنەی کە وەک باڵی بەخت بووە بە سەر دین و کۆمەڵانی خەڵکەوە و بێگومان لە خۆڕا تاریفی ناکرێ و هەڵناکێشرێ و پێیداهەڵناگوترێ و جێی خۆیەتی، چونکە بەڕاستی گۆی زانایی وەبەر خۆی داوە و هیچکەس نەگەیوەتە سەری. لێکدانەوە و شیکردنەوەی لەسەر قورئانی مەزن و لەمێژین نووسیوە و بەڵگەی ڕوون و پتەوی خستۆتە بەرچاوان و پێشەکییەکەی بە ناوی بەرزەناوی سوڵتانەوە تۆمار کردووە.

دیارە خێر و چاکەی ئەو پادشا پشت و پەنایە زیاترە لەوەی کە قەڵەمی دووزمان بتوانێ لەم دەقە کرچوکاڵەدا بیانئەژمێرێ.

هەر لەم ساڵەدا شاتۆماسب حکوومەت و دەسەڵاتی هیراتی دووبارە دایەوە دەس سوڵتان محەممەدمیرزا و شاقوڵی سوڵتان یەکانی ئۆستاجلووی بۆ کردە لەلە و کچی میر عەبدوڵلای مازندەرانی بۆ خواست و ناردی بۆ خوراسان.

لە درێژەی ساڵدا عەولاخانی کوڕی ئەسکەندەرخان کوڕی جانیبەگ سوڵتان کوڕی خواجە محەممەدخان کوڕی ئەبولخێرخانی ئۆزبەک لە هێندێک ناوچە و مەڵبەندی ئەوبەرڕووبار سەربەستی وەدەس هێنا و وێڕای دەستەیەک لە میرانی ئۆزبەک بە مەبەستی گرتنی هەرێمی خوراسان بزووت. هەر بە ڕێکەوت شازادە سوڵتان محەممەد و شاقوڵی ئۆستاجلوو بە ماڵ و کۆچ و خێڵ و بارەوە لە توربەتی (حەیدەرییە) و زاوە تێیانهەڵەنگووتن و بە سەرلێشێواوی و پەرێشانی و دڵەڕاوەکە پەنایان بردە بەر قەڵای زاوە. عەولاخان دوای گرتنی قەڵاکە و قەڵتوبڕی جەماوەر، ڕووی کردە دژی توربەت و دەورەی دا و کەوتە سازکردنی قەڵاقووچەی گەڕۆک و کەرەسە و ئامرازی قەڵاگیری. دوای تێپەڕینی بیست ڕۆژ بە سەر ماوەی گەمارۆدا، سوڵتانەکانی ئۆزبەک دووبەرەکییان تێکەوت و ئەگەرچی گەمارۆدراوان تەنگیان پێهەڵچندرابوو، دەوریان بەردان و گەڕانەوە ئەوبەرڕووبار. شازادە و لەلە وێڕای دووسێهەزار کەسان لەو گێژەنی مەرگە دەرباز بوون و بەرەو هیرات ڕۆیشتن.

## ساڵی ٩٧٥ / ١٥٦٧ ـ ٦٨

لەبەر چەند هۆیەک کە لێرەوە بەرەودوا باسیان دەکرێ، شاتۆماسب ڕقی لە خان ئەحمەدی حاکمی گیلانی بیەپیش هەڵگرتبوو. سەرەتا ئەوەی کە دوای کوشتنی سوڵتان موزەففەری حوکمداری گیلانی بیەپەس کە پێشتر باسی کرا، ناوچەی ژێر دەسەڵاتی بەخشیبوو بە خان ئەحمەد، بەڵام پێی نەزانیبوو. پاشان «جەمشیدخان»ناوێک لە تۆرەمە و نەوەکانی سوڵتان موزەففەر کە خوشکەزای شابوو، خەتی سمێڵی دا و شەیتانی پێکەنی و شاتۆماسب لەسەر تکا و داوای چەند کەس لە پیاوماقووڵان بە سەریکردەوە و خوێندییەوە و کیژێکی خۆی

دایە و مەڵبەندی بە میراتگەڕاوی باب و باپیرانی کە بۆ ماوەی سیساڵان بە دەس خان ئەحمەدەوە بوو، دایەوە. یۆڵقوڵیبەگی زولقەدر کە پێشتر میردەرکەوانی پادشا و هەمەکارەی قزڵباشان بوو ڕەگەڵ جەمشیدخانی خست و ناردی بۆ وەرگرتنەوەی گیلانی بیەپەس. هەر کە گەیشتنێ، خان ئەحمەد وڵاتەکەی دایەوە چنگ کارگێڕانی جەمشیدخان، بەڵام لەسەر ناوچەی کۆچێسفان (کۆچێسفەهان) تۆزێکی گیرە کرد و بە ساوەساو خۆی گنخاند و گوتی هەر لە کۆنەوە کۆچێسفەهان لەسەر گیلانی بیەپیش بووە و زۆر پتەو پێی لەسەر داگرت. یۆڵقوڵیبەگ ویستی کە بە دەستی زۆر ناوچەکە بگرێ. کاکۆ شامەنسووری لاهیجی کە سپاسالاری لاهیجان و حوکمڕانی کۆچێسفەهان بوو، خۆی لە بە دەستەوەدانی بوارد و شەڕیان لە مابەینیدا قەوما و کار گەیشتە نێزە و تیران و یۆڵقوڵی بە دەستی گیلەکان کوژرا. هەروابێتەوە ماوەی بیست ساڵ بوو کە شاتۆماسب قەزوێنی کردبوو بە پایتەخت و لە قەزوێنەوە هەتا لاهیجان و دەیلەمان کە شوێنی گەرمێن و کوێستانی خان ئەحمەد بوو، سێ مزڵ پتر مەودا نەبوو. بەڵام لەو ماوە درێژخایەنەدا قەت جارێکی نەهاتە دیداری پادشا و سەردانی نەکرد. تەنانەت لە کاتی چوونی سوڵتان بایەزید و کوڕانیدا، بە ئانقەست پیاوی بە دوویدا نارد، کەچی بڕوبیانووی هێنایەوە و نەچوو. دیارە چەند جارێکی دیکەش لە ئاست کاربەدەستانی میری کەترەخەمی نواندبوو. هەر بۆیە شاتۆماسب لێبڕا کە زەبرێکی لێبوەشێنێ و بیتەزێنێ. لە لایەکەوە مەعسوومبەگی سەفەوی وێڕای لەشکری قەرەباغ، ئازەربایجان، قەراچەداغ، تەوالش، بیەپەس و گەسکەر بە ڕێگای خەرزەویل و خەڵخاڵدا بەڕێکرد. لە بالێکی ترەوە قۆشەنی ڕۆستەمدار و ئێراقی وێڕای نەزەربەگی ئۆستاجلووی لەلە و میرانیماڵەوەی بە سەرکردایەتی سوڵتان مستەفامیرزای شازادە و بیستهەزار سوارە و پیادەی ڕەشتەوە بە لای تاڵەقان و کەلاردەشتا گاڵ دا. هەروەها ئەڵلاقوڵی سوڵتانی ئیجەک ئۆغلی ئۆستاجلووی بە سێهەزار و پێنسەد

چەکداری «تاش»ەوە بە ڕێگای «ڕووبار»دا نارد هەتا هەموویان پێکەوە پەلاماری ئەحمەدخان بدەن و بیگرن. وەختایەک دەنگ و هەرای بزووتنی مەعسوومبەگ و سپای قزلباشی بە گوێی گەیشت، دەنگی هێزەکانی خۆی دا و نیزیکەی سیهەزار سوارە و پیادەی لە لاهیجان لە دەوری بەیداخی کۆکردەوە و ساز و پەرداخ بـۆ بەربەرەکانی و بەرەنگاربوونەوە ڕاوەستا. لەو بەینەدا مەعسوومبەگ تـۆقی و زراوی چوو و کاغەزێکی دەوڵەتخوازانەی بە یەکێک لە پیاوەکانیدا بۆ نـارد و تێیدا نووسی چما بێتوو هەواڵی کۆکردنەوەی هێز و چەکدارەکانت بگاتەوە گوێی پادشا، لەڕێوە دڵی دێشێ و بە بڕوای من وا چاکە بڵاوەیان پێبکەی و کاخەزێکی نیازپاکانە بنێری بۆ ژێر پێچکەی تەختی بەرزی فەرمانڕەوایەتی و یەکـڕەنگی خۆت بنوێنی و بڵێی منیش یەکێکم لە غولامانی بەردەرانەی کۆشکی میری و هەر لە باوک و باپیرانەوە خۆم بە ئەمەگداری ئێوەی پایەبەرز دەزانم و نەگۆڕاوم و هەرێمی گیلان قەڵەمڕەوی میرە و دەیدا بە هەرکەس سێودووی لێناکەم و سەری وەبەردێنم. ئەحمەدخانی گەمژە لەڕێوە بە قسەی ئەو پیرەداڵ و ڕێوییە فێڵەبازە هەڵخەڵەتا و لەشکری بڵاوەپێکرد.

ئادەمی زانـا هـەر بـە زمانی کاران پێکـدێـنـێ
کە سەد لەشکر بێ بۆی ڕاناپەڕێ و تێیدا دەمێنێ

بە هیوای ئەوەی کە مەعسوومبەگ چۆنیەتی بـارودۆخ و هەڵوێـستی بـە بارگای پادشا ڕادەگەیەنێ و دەگەڕێتەوە، وێڕای کۆمەڵەچەکدارێک بە خەیاڵی ئاسـوودە لـە لاهیجـان ڕۆنیـشت و چـاوەڕوانی وڵام مایـەوە. وەختـایــەک مەعسوومبەگ دەبەنگی ئەحمەدخانی لێ ڕوون بۆوە، لە «کۆکە» و «حەرکام»ەوە هێرشی هێنایە سەری و پێشەنگی لەشکر ئەو دەمـەی گەیـشتێ کـە بـۆ ژەمـی بەرچایی هەموو چین و توێژێک لە زانایانی فرەزان و بلیمەتـەوە بگـرە هـەتا

زۆرانباز و شەڕکەری میوان کردبوون و خوانی ڕازابۆوە. بە چەشنێک کە مەولانا یەحیاخانی لاهیجی فەرموویەتی:

ئەگەر بتوانـــی بـۆ بەزمی میری بچـــی و بیدۆزی
کێت لێ ون بووبێ دەکرێ تێیگەڕێی لەوێ وەیدۆزی

لەم کۆڕە ڕەنگینەدا هێشتا پارووپان نەکردبوون کە خەبەری پەلامار بـلاو بۆوە. گیلەکی دەرفەتیان نەما و ئەوەندەشیان پێنەکرا کە خان ئەحمەد ســوار کەن و بە خۆی بیست کەسی سوارە و پیادە لــە لاهیجان دەرپــەڕین و بـــەرەو ڕانکۆ و ئیشکەوەر ڕەوین. مەعسوومبەگ وێڕای ئەمیران پێیان‌نایە لاهیجــان و میر جانگیری کوڕی خواجە عەلی‌بــەگی مــیری‌میرانـــی خــان ئەحمــەد لەگــەڵ شاسواربەگی لەشتێ نێشایی بۆ سەر وەبەرهێنان هەنگاویان هاویشت و زۆر بە باشی لاوێندرانەوە. سەرۆک و سەرداران دوای چوار مانگ گەڕان بە شـوێنی‌دا، هیچیان بۆ نەکرا و قۆشەن لەبەر هاتوچۆ و هەوای پیس و ناخۆشی گیلان بــە وەڕەزی و بێ‌هێزی کەوتەوە و کەلوپەل و چەکوچۆڵ و تفاقی لێبــڕا. یەکـسم ئەوەندە لە چەڵتووک لەوەڕابوون کە هەر لاکەی سەریان دەهات و نەیاندەتوانی ڕەو بەرن. فەرماندەرانی لەشکر بە تەمابوون بگەڕێنەوە کــە زســتان داهــات و کوێستانەکانی گــیلان بــەفریان لێنیــشت و دار و دەوەن داڕووتــان و گــەڵایان پێوەنەما. لەم جەنگەدا پادشا حوکمی کرد کە سپای سەرسووران دەبێ جارێکی تر هێرش بەرێتە لای ئیشکەوەر و بە شوێن خان ئەحمەدا بگەڕێ. بــەپێی فــەرمان قزڵباش لە لای لاهیجانەوە و ئەڵلاقوڵی‌خان و قۆرچییەکانی تاش لە چیاکانی ڕووبارەوە داوەرین و خان ئەحمەدیان لەسەر ڕووباری «سـیاکەل»ی ســەر بــە ئیشکەوەر لە نێو پشتێری مەڕ و ماڵات کە وێڕای چەند خزمەتکارێک سەرقاڵــی دەنگ و نەوای عوود بوو دۆزییانەوە و بردیانە لای مەعسوومبەگ.

پێنج کەس لە سەرداران لەگەڵ ئەڵلاقوڵی سوڵتانی لەلە و شازادە سوڵتان مەحموودمیرزای کوڕی پێنجەمی پادشا بۆ پاراستنی گیلان دیاری کران کە یەکیان خودی خۆم بووم.

مەعسوومبەگ، ئەحمەدخانی هەڵگرت و شانبەشانی ئەمیران و بەگەران لە گیلان دەرکەوت. کاتێک لە قەزوێن چوونە لاشیپانەڕامووسانی فەرمانڕەوا، دووسێ مانگێک خان ئەحمەدیان ڕاگرت و پاشان ناردیانە قەڵای قەهقەهە و ماوەی ساڵێک لەوێ گیرا. پاشان لەبەر تێکەڵاوبوونی لەگەڵ سمایل‌میرزا، شاتۆماسب لێی کەوتە گومان و تۆقی نەکا پێکەوە لە قەڵا کەتنێک بگێڕن، بۆیە لەوێوە ڕایگوێست بۆ قەڵای ئیستەخری شیراز و دە ساڵان لەوێ مایەوە. چۆنیەتی بەسەرهات و چارەنووسی لە ساڵەکانی داهاتوودا ئەوەندەی ڕێی تێدەچێ دەخرێتە بەرباس.

## ساڵی ٩٧٦ / ١٥٦٨ ـ ٦٩

لەم ساڵەدا شاقوڵی سوڵتانی ئۆستاجلوو میردیوانی حاکمی چۆخوری سەعد کە بە مەبەستی پرسە و سەرەخۆشی سوڵتان سولەیمانخان و مبارەکبادی بەرگی نوێی فەرمانڕەوایەتی سوڵتان سەلیمخانی دووەم چووبووە ڕۆم تەشریفی بە کامڕەوایی گەڕایەوە.

هەر لەم ساڵەدا مەعسوومبەگ دەستی لە پلەی وەزارەت و میردیوانی کێشایەوە و وێڕای کۆمەڵێک لە قزڵباشانی وەک میر محەممەدی میر یۆسفی سەدر و خانمیرزای ئاغازادەی خۆی و بەشارەتبەگی سەردەفتەر چوونە حەج. پلەی وەزارەت بەخشرا بە میر سەید شەریفی دووەم و هەر لەم ساڵەشدا کۆچی-دوایی کرد و چۆوە بەر دلۆڤانی خودێ.

مەعسوومبەگ خوراسان و گیلانی گرت و ئەوەی چاوەڕوانی بوو، پادشا لێی لە چاو بوو. کاتێک گەیشتە حەلەب و شام بە خزمەت پادشای زەمانە سوڵتان سەلیمخانیان ڕاگەیاند کە مەعسوومبەگ بە بیانووی زیارەتی ماڵی

خودا هاتۆتە وڵاتی ڕۆم و کۆمەڵێک سۆفی ڕۆمی لە خۆی هاڵاندوون و ڕەنگە ئاژاوەیەک بنێتەوە و دەس بە سەر هەرێمەکەدا بگرێ. فەرمانێک لە ئاستانەی بڵیندی سوڵتانیڕا دەرچوو بۆ دەروێشپاشای هێژای میریمیرانی شام کە خێرایەکی بکەوێتە دەمکوتی مەعسوومبەگ و یارانی. دەروێشپاشاش بەگوێرەی ئاماژەی میر، دووسەد کەس شۆڕەسواری نێزە بە دەستی وێڕای کاروانی حەج بەڕێکرد و ڕایسپاردن کە لە هەلێکی لەباردا مەعسوومبەگ و هاوڕێیانی قەڵتوبڕ بکەن. لە مابەینی مەکە و مەدینەدا بە جلوبەرگی عەرەبانەوە و بە ناوی چەتە و ڕێگر لەو جەنگەدا کە بۆ نوێژی بەیانی لە کەژاوان دەرکەوتبوون، تەپیان دایە سەر مەعسوومبەگ و یارانی و جەرگ و ڕیخۆڵەیان بە گوڕێ وەرکردن و فزەیان لێبڕین.

هەر لەم ساڵەدا جەماوەری گیلان کەسێکیان بە ناوی سوڵتان هاشم لە توخم و تۆرەمەی میرانی مەڵبەندەکە دیتەوە و بە کۆدەنگی کردیانە حوکمڕان. پاشان بە سەر سەرداران و سەرۆکانی قزڵباشیان دادا و تاقمێکیان کوشتن و ژمارەیەکیان ڕەپاڵنان. دواتر نیزیکەی هەژدەهەزار سوارە و پیادەیان کۆ کردەوە و چوونە زگ حاکمی تۆنێکابۆن. حوکمڕان بە خۆی و پێنسەد کەس لە سەرکردە و غولامان و چەکدارانی کورد و دەستەیەک لە بەگلەرانی قزڵباش لە قەزوێنەوە چووبوونە یاریدەی و لەسەر ڕووباری مەرز بەرەنگاریان بوونەوە و سپای سوڵتان هاشم شکا و کوشتە و بریندارێکی زۆر کەوتە سەر دەستی هەردک لایان. نیزیکەی ١٨٠٠ گیلەکی کوژران و تەرمەکی کەلاکان لە مەیدانی تۆنێکابۆن بە سەریەکدا کەوتن و سێ منارە لە قاپێلکی سەریان هەڵچندرا.

## ساڵی ٩٧٧ / ١٥٦٩ ـ ٧٠

لەم ساڵەدا شاتەهماسب گیلانی بیەپەس و بیەپیشی بەخشی بە سوڵتان محەممەدمیرزا و ئەڵلاقوڵی سوڵتانی ئیجەک ئۆغڵی بۆ کردە لەلە و باقی هەرێمەکەی دابەشی بە سەر سەرۆکان و سەردارانی قزڵباشدا. ئەڵلاقوڵی

سوڵتان و بەگلەرانی دیکەی قزڵباش لەبەر هێندێک تاوانی جەماوەری گیلان و دڵشکانی شاتۆماسب لە کار و کردەوەیان، کەوتنە زوڵم و دەسدرێژی بۆ سەر خەڵک. «ئەمیرەدیباج»ناوێک لە بنەچەکەی قەرەمحەممەد و هەژدیهاسوڵتان لە چینی حەبکەبەندی لەشتێ نێشایی پێکەوە راپەرین و شاسواربەگی لەشتێ نێشایی سپاسالار کە وەک بریکاری پادشا حکوومەتی وێندەرێی هەڵدەسووڕاند، کوژرا. حەشامەتی گیلان پشتی ئەمیرەدیباجیان گرت و وێکڕا بە دڵ و بە گیان لە سەرسووران وەخۆ کەوتن و نەیانپاراستن.

هەر لەم ساڵەدا کەیخوسرەوی کوڕی غورغورەی گورجی گەلێک دیاری و پێشکەشی لەگەڵ خۆی هێنایە دەرگانەی شاتۆماسب و ئەویش بە سۆزی میرانە بە سەری کردەوە و دەستی رێزی لێنا.

## ساڵی ٩٧٨ / ١٥٧٠ ـ ٧١

سوڵتان سەلیمخان، قەرەمستەفاپاشای لەلە کە وەزیری سێهەم بوو کردی بە سەرکردەی هێز باڵادەستەکانی و گالی دا بۆ گرتنی دورگەی قۆبرۆس. مستەفاپاشا بە لەشکری بە ژاوەژاوی وەک دەریا رووی کردە ئەو شوێنە و لە ماوەی چل و پێنج رۆژدا بە تین و تەوژمی دوژمنبەزێن قەڵای «لووکووشە»ی گرت کە یەکێک بوو لە قایمترین دژەکانی ئەو هەرێمە. زستانێ لەوێ هۆردووبەزی کرد و سەرەبەهارێ بە سواری کەشتی و بەلەم بزووت و چووە سەر قەڵای «مەنقووسە» یەکی دیکە لە شوێنە سەختەکانی وێندەرێ و قەیاسەی لە کافران کێشا و جەڕەبابەی دان و هاواری لێهەستاندن و وە ئامانئامانی خستن کە دژەکە بە دەستەوە دەدەن و لێیانگەرێن کە بە سواری لۆتکان وێڕای خاوخێزانیان بگەڕێنەوە مەوتەنی خۆیان و خاکی فەرەنگستان. هێزەکانی یەنیچەری و قەپووخوڵقی بڕیاری سوڵح و پەنادانی مستەفاپاشایان پێشێل کرد و بە شیری تیژی رووتەوە هەموو پیاوەکانیان لە خوێنی خۆیان گەوزاندن و

ژن و کوڕ و کەنیشکیان بە دیل گرتن و ماڵ و سامانیان پووڕ دان. پاشان تێکڕای دژەکانی دیکەش گیران.

هەر لەم ساڵەدا ئەمیرەدیباجی لەشتێ نێشایی ئاپۆرایەکی لاتولووت و چەپەڵکار و چەقۆکێشی گیلانی لە دەوری بەیداخی خۆی کۆ کردەوە و هێرشی بردە سەر لاهیجان و ئەو دژەی گرت کە بە فەرمانی پادشا لەوێ سازکرابوو و چوارسەد تفەنگچی دەیانپاراست. ئەو کۆمەڵە چەکدارەی تێکڕا لەتوکوت کردن و لە خاکی نەمانی وەردان. چەندین دارۆغە و دژداری قزڵباشی لە هەموو ناوچە و مەڵبەندەکان کوشتن و گەلێکی دەرپەڕاندن. هەموو هەرێمەکە کەوتە بەرچنگی و هەزارەزیلەی سەرسووران ڕەوین و چوونە دەیلەمان بۆ لای شازادە سوڵتان مەحموود و ئەڵلاقوڵی سوڵتان. کاتێک ئەم هەواڵانە لە قەزوێن بە گوێی موبارەکی پادشا ئاشنا کران، تێکڕای مەزنەپیاوان و سەرۆکان و چەکدارانی ئۆستاجلووی وێڕای ئەمیرانی ماڵەوەی نارده هانا و یاریدەی شازادە لە دەیلەمان. ئەگەرچی نیزیکەی دەهەزار شەڕکەرێکی قزڵباش لە دەیلەمان کۆوەبوون، بەڵام نەیانوێرا هەڵکەنە سەر ئەمیرەدیباج و ناوچەی لاهیجان. سەرەنجام چوارسەد چەکداری ئۆستاجلوو و غەریبلوو و سایری توخمەکانی قزڵباش غیرەتیان بزووت و بێ ئیزنی شازادە و سەرکردەکان بەرەو گیلان تێڕاچوون. لە گیلانی بیەپەس شەشهەزار چەکداری سوارە و پیادەیان لە جەمشیدخانی حوکمڕان وەرگرت و بە مەبەستی چوونە شەڕی ئەمیرەدیباج بەرەو لاهیجان تێکشان. کاتێک بە ڕووکاری ئەوێدا کەوتن ئەمیرەدیباجیش بەرەورووویان هات و ئاگری شەڕ هەڵگیرسا. جاری یەکەم لەشکری سەرسووران شکان و بیست کەس لە میرزادەکانی ئۆستاجلوو کوژران. پاشان سپای بیەپەس لە پشتەوەڕا پەلاماری ئەمیرەدیباجی دا و کردیانە نیشانەی تیر و تفەنگان. خوداوڕاستان فیشەکێک لە نێوان هەردک شانی درا و لە سینەی سەری کرد. بەم

ڕووداوە گیلەکی بەزین و قزڵباش هرووژمیان برد و سوارە و پیادەیان پێخوست کردن و سەرلەنوێ هەرێمی گیلان کەوتەوە دەس کاربەدەستانی میری.

##ساڵی ٩٧٩ / ١٥٧١ ـ ٧٢

لەم ساڵەدا شاتۆماسب پیرەمحەممەدی چاوەشلووی ئۆستاجلووی کردە حاکمی گیلان و ئەمیر غەیبسوڵتانی ناردە لای دەیلەمان و چیاکانی گیلان بۆ لێدان و سەرکوتی تاوانباران و بەدفەڕان، بەڵام لە دەیلەمان چرای تەمەنی کوژایەوە. دەسەڵاتی گیلانی بەخشی بە ئیمامقولیمیرزا و پیرەمحەممەدی بۆ کردە لەلە.

هەر لەم ساڵەدا دەنکێک خشتی زێڕ و یەکی زێو، لە بڕی شەشسەد خشتان کە هەر کامەی ٣٠٠٠ مسقاڵی شەرعی قورس بوون و لە قەڵای قەهقەهە خرابوونە ژێر خاک، شرتوگوم بوون. حەبیببەگی ئۆستاجلووی دژدار تاوانەکەی خستە ئەستۆی سمایلمیرزا و ئەویش تۆماتی ئەم ڕووداوەی هاویشتە گەردنی کچەکەی وی. شاتۆماسب چەند میر و سەرکردەیەکی بۆ توێژینەوە و لێکۆڵینەوە ناردە قەڵایە. حوسێنقولی خولەفای ڕۆملوو و وەلی خەلیفەی شاملووی حاکمی قوم قسەکەی میرزایان بە ڕاست دانا و پیرەمحەممەد و خەلیفەی ئەنساری قەراچەداغ جەبیببەگیان بە هەق زانی. هەر بۆیە هەردک دەستەکە بە دڕدۆنگی لە یەکتر گەڕانەوە قەزوێن و لە کۆڕی پادشادا قسەی سارد و سووکی توێکلداریان بە زاری‌دا هات کە فەرمانڕەواشی دەگرتەوە. لەو ڕۆژەوە شوێنەواری دووبەرەکی لە ڕیزەکانی سەرسووران‌دا سەری هەڵدا و تاقمێک لە قزڵباشان لایەنی ئۆستاجلوو و دەستەیەکش لانی سمایلمیرزا و خولەفایان گرت.

## ساڵی ٩٨٠ / ١٥٧٢ ـ ٧٣

سەرەتای ئەم ساڵە مەلیک سوڵتان محەممەدی کوڕی مەلیک جانگیری حوکمداری «کەجوو»ی سەر بە ڕۆستەمدار کە خوشکەزای خان ئەحمەدی گیلانی بوو تەمای گرت وەخۆ کەوێ و گیلان بگرێ. پوختەی ئەم ڕووداوە بە لک و پۆپە

ئاوايە: بەر لە گيراني گيلان و گيرۆدەبووني خان ئەحمەد، ئەسكەندەربەگي ئەفشار كە بە مەبەستي وەرگرتني باج و پيتاكي كەجوو سەرداني مەليك جانگيري كردبوو، مەليك خۆي بوارد و هێنديكي هێناوبرد و وەپاش گوێي دا. ئەسكەندەربەگ عۆينێكي گێڕا و مير جانگيري گرت و بردييە دەرگانەي پادشا. لەوێشەوە بەرێيان كردە قەلاي هەلەمووت و لە بەنديان پەستاوت هەتا تاوي تەمەني پەڕي. مەليك محەممەد ئەو دەمەي كە هەواي بە دەستەوە گرتني جلەوي حكوومەتي گيلان لە كەللەي دا و دێوي باديهەوايي و خەيالاتي پووچ لە سەرسەراي مێشكيدا بنەي داكوتا، كاري ئەوەندە سەير و نابەجێي كردن كە شاتۆماسب بە مەليك دێوانەي ناو زڕاند. ئيمامقولي سولتاني كوڕي بەدرخاني ئۆستاجلووي كردە سەري هەتا دژي كەجووي لێبستێنێ و دەمكوتي بكا. ئەويش فەرماني ميري نايە سەرچاوي و بە پێنجهەزار سوارەوە پەلاماري مەليكي دا و مەچەكەي لە دەورەي قەلاي كەجوو ئەنگاوت. لەم كاتەدا مەليك پياوێكي ناردە لاي ئيمامقولي و لێي ڕاسپارد كە ئەگەر زەحمەت بكێشێ و بە تەنيا بێتە دەركي قەلا، چەند قسەيەكم پێيەتي كە ناكرێ بە كەسيان بلێم و بياندركێنم و دەبێ بێت و پێكەوە بڕياري لێبدەين و پاشان بە پێچكي بەرزي فەرمانڕەواي ڕابگەيەنين. ديارە كۆمەلێكم دياري بۆ داناوە، بۆ وێنە جووتێك بازي باڕي دەكەمە قەدمخۆشانە كە لە دەرباري ميراني گەورەش وەگير ناكەون. زۆر تامەزرۆم كە بە دەنگ داواكەمەوە بێ و مەرحەمەتي ئاواش هەر لە خۆي دەوەشێتەوە. كاتێك ئەم قسانەي پێگەيشتن خۆي بۆ چوون دە دەسك نا و هەرچەندي ميران و گەورەگەوران دە بەري گەڕان كە نابێ شتي وا بكا، لەبەروەي پياوێكي بەجەرگي مەلخۆشەويست و ئاشقەڕاو بوو، تاسەي باز بالندەي دلي بە نێچير گرت و خۆي بۆ ڕانەگيرا و گوێي بە گوتەي ئامۆژگاران نەبزووت. پێي لە جەغزي پارێز تێپەڕاند و بێ بير لێكردنەوە و بێ حەجمين و هەدا وێڕاي پۆلەسوارێك لە شوێني دياريكراو خۆي نواند. مەليك سولتان محەممەد چەند

پیاوێکی چوست و چالاک و بە دەستوبردی چەکداری لە کەلێنک دانابوون و هەر کە ئیمامقولی گەیشتێ لەناکاو لێی وەخۆکەوتن و متەقیان لێبڕی. قەدیمی گوتوویانە یەکێک ئەگەر ئەجەلی هات مل پێوەدەنێ و ناگەڕێتەوە. دوای ئەم رووداوە هێزەکانی رەوین و پەرمپەرمم بوون و لە دەورەی کەجوورا بەرەو قەزوێن تێیانتەقاند.

## سالی ٩٨١ / ١٥٧٣ ـ ٧٤

رۆژێکیان لەم سالەدا حالی موبارەکی شاتەهماسب تێکچوو و تێکهەلگلا و نەخۆشی سواری سەری شانی بوو. سولتان سولەیمانمیرزای خوارزای شەمخالی چرکەس و کوڕی دووەمی پادشا کە لەوەتی وەبیری دەهات غولام و خزمەتکاری مەرقەدی ئیمام رەزا بوو – رەحمەتی خودای لێبێ – لەو جەنگەیەدا هاتبووە خزمەت باوکی لە قەزوێن. هێزی قزلباش لە کاتی نەخۆشی میردا بوونە دوو دەستە و هێندەی نەمابوو لێکدەن و پێکهەلپرژێن و هەلایەکی گەورە بقەومێنن کە لەناکاو یەزدانی مەزن، پادشای پایەبەرزی خۆش کردەوە و گڕی ئاگری ئاژاوە رۆمرکا. پادشا لەم هەلوێستەی قزلباشان دلی گەردی گرت کە هەوێنەکەی لە لایەک حوسێنقولی خولەفای رۆملوو، ئەمیر ئەسلانبەگ و شەمخالی چرکەس و لە لایەکەی ترەوە حوسێنبەگی یووزباشی ئۆستاجلوو، پەریبەگی قۆجلووی قۆرچی تورکمان و زالی گورجی بوو. میر دلی لەو تاقمە رەشهەلگەڕا بەلام بۆ چوخساندن و تۆلە لێکردنەوەیان هەنگاوی بە پارێزی دەنا. لەبەرەوەی پادشا نەرمی دەکێشا، کەتن و پیلانی ئەوان رۆژ بە رۆژ زیاتری پەرەدەگرت.

ئەوەی ناجسن و بێفەڕبێ، مەهێلە تا لەسەر پەڕ بێ
ئەوەی دالاش بەخێوکاتن، دەبێ ئاقیبەتی شەڕ بێ
لەگەل ژێردەستەکانی خۆت بە نەرمی قەت مەجوولێوە
ئەگەر ئەلماس درشتیش بێ، دەبێ بشکێت و پەڕپەڕبێ

## ساڵی ٩٨٢ / ١٥٧٤ ـ ٧٥

لەم ساڵەدا پادشای تاجبەخشی جیهانگیر سوڵتان سەلیمخـان لـەم دنیـا ڕووخەک و خۆنەگرەوە ڕووی کردە دنیای هەرمان. پەنجا و سـێ سـاڵ ژیـا و هەشت ساڵ و هێندێکی فەرمانڕەوایەتی کرد. شەش کوڕی لە پاش بەجێما، بـۆ نموونە سوڵتان مراد کە بە هەوڵ و هەڵسووڕان و تەگبیر و ڕای بـێسـێودووی محەممەدپاشای مەزنەوەزیر لە مەغنیساوە گەیشتە ئیـستانبووڵ و تەشـریفی موبارەکی دانیشتە سەر تەختی دەسەڵاتی خونکارانـی ڕۆم. پـاشـان بـەپێـی ڕێوشوێن و یاسـای عوسمـانی و بـەگوێرەی فتـوای عولـەماکانی مەزهـەبی ئەبووحەنیفە – نوعمانی کوڕی سابیت – کە دەڵێن: تێدابردنی مایەفیتنەی کەم بە قازانج و بەرژەوەندی زۆربە، کارێکی شیاوە، هەر پێـنج براکـەی لـە ڕۆژێکـا خنکاندن و لە پەنا گۆڕی باوکی بەرزەجێیان ناشتنی.

وەختایەک شاتۆماسب لە قەزوێن هەواڵی مردنی سوڵـتان سـەلیمخـانی بیست، محەممەدیسوڵتانی ناسراو بـە تۆقمـاقی بـە کۆمەڵـێک پێـشکەشی و دیارییەوە بۆ سەرەخۆشی و پیرۆزبایی لـە پادشـای پـەرەدەری قەڵـەمڕەوی فەرمانڕەوایەتی ناردە ئیستانبووڵ.

## ساڵی ٩٨٣ / ١٥٧٥ ـ ٧٦

شاتەهماسب بەشێک لە ناوچەکانی گیلانی بیەپیشی بەخشی بە ئەمیرانی تەکەلوو و ئەو خێڵە پەرێشان و ڕۆژگار تاڵەی ناردە ئەو مەڵبەندە بەخێروبێرە. پاشان مرادخانی کوڕی تەیموورخانی ئۆستاجلووی بە مەبەستی تۆڵە کردنەوەی ئیمامقوڵی و گرتنی ناوچەی کەجوو ناردە ڕۆستەمدار. لە درێژەی ساڵدا کارکیا ئەحمەد، لەلەی جەمشیدخانی حاکمی بیەپەس کۆچیدوایی کرد.

## ساڵی ٩٨٤ / ١٥٧٦ ـ ٧٧

لە نێوەڕاستەکانی مانگی سـەفەردا شاتۆماسـب بـۆ بـە دەنگـەوەچوونی بانگاواز و بانگهێشتنی پەروەردگار بەرەو خانەپەنای حەسانەوە، بارگە و بنەی

تێکەوەپێچا و مەلی رووحی پاکی قاپۆڕی قەفەزی لەشی شکاند و ڕووەو باخی بەهەشت لە شەقەی باڵی دا. تیشکەی خۆرەتاوی سۆز و لاواندنەوە و بە سەرکردنەوەی کە دنیایەک لە ژێر شاباڵیدا بە هێمنی و خاترجەمی دەژیا و ئەوەندەی دڵخوازە چەتری هەڵدابوو، بەرەو کوژانەوە تەشک و داوێنی کۆ کردەوە. میری کامڕەوا کە لە سایەسەری دەسەڵاتی ئەورا جیهانێک لە لانکولۆرکی دادەوانی و وچانا پشووی دابوو، ڕوخساری چەشنهەتاوی لە ئاسۆی زەردەپەڕی ئاوابوونەوە تلی دا. خێوەتی سەراپەردەی کە سەری لە میچی ئاسمان دەساوی و جێی دڵخۆشی و خۆپێوەڕانانی چەرخی گەردوون بوو، ڕەشەبای نەمان لوولیدا و ئەستۆندەکی پەڕاند و بە سەریەکیدا تەپاند. ئاڵای وەکوو پیرۆزەی کە باڵندە لە ژێر نیسێی کەپرۆکەی باڵەکانیدا دەسەکنی، هەڵۆی چارەنووس لە حەویقی ئاسمانەوە بەرەو سینەی خاکی داگێڕا.

دەستی شکاوم بۆ مەزنەمیری گەورەی تاجدار
خەراجی دەستاند لە پادشاهان بە کاروان و بار
حەیف یەکی وا نادۆزێتەوە هەرگیز ئاسمان
لە نێو ئاوێنەی مانگ و هەتاو و پۆلی ئەستێران

ئەم کارەسات و ڕووداوە تاڵ و ناخۆشە گەورەیە لە شەوی سێشەممۆی شازدەی سەفەردا قەوما. دێوی پەشێوی و ئاژاوەی نێو ڕیزەکانی قزڵباش کە ماوەی چل ساڵ بوو پرخوهۆڕ لە خەوێکی قورسا نووستبوو، وەخەبەرهات و کردی بە گەردەلوول و تەپوتۆز و تەندوورەزەنە. حوسێنبەگی یووزباشی کە کۆڵەکەی بەرز و پتەوی ئەو زنجیرەیە بوو وێڕای زۆربەی پیاوماقووڵان و تایفەکانی هۆز و شانبەشانی عەلیخانی گورجی و زاڵی گورجی کە خاڵوانی سوڵتان حەیدەرمیرزا و ئیمامقولیمیرزا بوون، بە پێشنیاری سوڵتان

برایم‌میرزای کوڕی بارام‌میرزا هەر ئەو شەوە کە تاوی ڕووناکیدەری ئاسمانی فەرمانڕەوایەتی گەشە و تیشکەی گۆشەنیگای لە ڕوومەت و هەنیەی ڕۆژگار وەردەگرتەوە، سوڵتان حەیدەرمیرزایان بردە کۆشک و سەرسەرای ئاوەدانی میری هەتا دوای تەواو بوونی پادشای بێوێنە، دانیشێتە سەر تەختی دەسەڵات.

بەتێکی لە شەو چووبوو کە میری هاوشانی جەمشید و ئەسکەندەرسپا ڕۆیی بۆ دنیای دیکە. سوڵتان هەیدەرمیرزا تاجی پادشایەتی نایە سەری و شیری گەوهەربەندی لە قەدی شەتەک دا و لە نێو ژنان و خاتوونان‌دا بە سەربەستی دانیشتە سەرتەختی فەرمانڕەوایەتی. بەڵام وەختایەک یای پەریخانی خوشکی پادشای خوابەخشیو بارودۆخەکەی ئاوا چاو پێکەوت خێرایەکی قاسیدێکی بە بەینەت و بەقای ناردە لای شەمخاڵی چرکەسی خاڵی و حاڵ و ڕۆژەکەی لێ‌ڕوون کردەوە. ئەویش لەڕێوە وێڕای حوسێن‌قوڵی خولەفای ڕۆملوو، ئەمیر ئەسلان‌بەگی ئەفشار، تایفەی تەکەلوو و تورکمانی ئەفشار و کوردانی پڕچەکی سوارە و پیادە لە جەرگەی شەودا داڕژانە دەروازەی مەیدانە ئەسپ و بە چەک‌وچۆڵەوە خۆیان بە حەوشەی حەرەم‌دا کرد. کاتێک حوسێن‌بەگی یووزباشی و توخم و تۆرەمەکانی ئۆستاجلوو و گورجی بە هاتنی ئەوانیان زانی وێڕای سوڵتان برایم‌میرزا بە لای دەروازەی دیوان‌دا کە پێی‌دەڵێن ئالەقاپۆ هێرشیان هێنا و کردیانە پاڵەپەستۆ، بەڵام پاسدێران دەرگایان لێ‌نەکردنەوە و بەریانگرتن. لەم کاتەدا سوڵتان حوسێن بە قسە و تەگبیری هێندێک ژن‌وژاڵی ناتەواو جلوبەرگی ژنانی پۆشی هەتا بتوانێ ئاوا وێڕای ئەوان دەرباز بێ و خۆی بگەیەنێتە نێو ڕیزی لایەنگرانی و لە شەڕ و گەڕی شەمخاڵ قوتار بێ و زەرەدی پێنەگا و ببێتە میری سەربەخۆ. کاتێک لە سەرسەراوە خۆی هاویشتەدەر، خێرایەکی پۆلێک خزمەتکاری چرکەس شەمخاڵیان خەبەردار کرد و ئەویش کەوتە سەری و هەر کە چارشێوی لێ‌داماڵی، سوڵتان حەیدەر دەستەوخەنجەر لینگی دایە، بەڵام غولامێکی چرکەس وەپێشی گەڕا و بە زەبری

شیرێک ئەو دارەسەوڵـەی جۆبـاری فەرمانڕەوایـەتی و ئـەو گوڵـە ناسـکەی باخچۆڵەی پادشایەتی داهێنا کە لە نێو بنەماڵەی سەفەوی و خانەدانی عەلی‌دا کەس شانی لە شانی نەدەدا. لەم بەینـەدا حوسـێن‌بـەگی یووزباشـی وێـڕای هاوڕێیانی ئاڵەقاپۆیان بە زەبری تەور و تەورزینان شکاند و خۆیان بە دیوانی میری‌دا کرد. زاڵی گورجی وێڕای دەسـتەیەک ڕەشـۆکی هێرشـیان بـردە سـەر دەوڵەتخانە. شەمخاڵ سەری سوڵتان حەیدەری بڕی و فـڕێی دایـە بـەرپێیان. گورجی کەوتنە شەڕ و کوشتار لە حەوشەی حەرەم کەوچکی تێنەدەگەڕا. زاڵـی گورجی کە سەرکردەی ئەو خێڵە گومڕایە بوو بە فیشەک ئەنگوا و کـوژرا. ئـەو کۆمەڵە فیل‌سوارە بەزین و ئۆستاجلوو و پەیڕەوانیان سەرشکـستە و ناهومێـد سوڵتان مستەفایان هەڵگرت و لەگەڵ ئیمام‌قوڵی‌میرزا قەزوێنیان چـۆڵ کـرد و بەرەو قـوم تێیانتەقانـد. حوسـێن‌قوڵـی خولـەفا و شـەمخاڵ و هـاوبیران و لایەنگرانیان کۆبوونەوە و هەر چەندی هەوڵیان دا تا یەکێک لەو شازادانەی کە لە داوێنـی یەخـسیران و جارییـەکانی چرکـەس بەرببوونـە بکەنـە پادشـا، نەیانتوانی. کاتێک قزڵباش تەماشایان کرد ئەو تاقمە حاڵیان پەشێوە و هیچیان بۆ بە هیچ ناکرێ، تێکڕا ڕوویان کردە سمایل‌میرزا و دەستەدەستە و پـۆل‌پـۆل بەرەو قەڵای قەهقەهە داپەڕین و بە نیشانەی نیازپاکی بە بنڕێسمەی تایبـەتی دانووسان. حوسێن‌قوڵی خولەفا و شەمخاڵ وەختایەک خەستیی بیر و باوەڕی قزڵباشانیان سەبارەت بە سمایل‌میرزا بەدی کرد، بـەناچار حەیدەرسوڵـتانی تورکمانیان لە لایەن خۆیانەوە ناردە خزمەت سمایل‌میرزا و پێیان‌ڕاگەیاند کـە ئێمەی هەژار دەروونمان لەگەڵی وەکوو ئاوێنەی بێگـەرد وایـە و هـەر لەبـەر خاتری ویش سوڵتان حەیدەرمیرزامان کوشتووە و بە گژ خێـڵی ئۆسـتاجلوودا چووینەوە. ئێمەی کۆیلە و غولام ئێستا خەریکی پاراسـتنی خەزێنـە و مـاڵ و سامانی وڵاتین و چاوەڕوانین کە بە هەنگاوی پیرۆزی بە سـەرمان بکاتـەوە و سێبەری سۆزی بمانگرێتەوە.

لە ماوەی دە ڕۆژاندا سیهەزار سوارە و پیادە لە ڕووکاری قەڵای قەهقەهە کۆبوونەوە. سمایلمیرزا لە ترسی ئەوەی کە نەکا فێڵ و تەڵەکەیەک لە گۆڕێدا بێ و پیلانی خەلیفەی ئەنسار و تایفەی ئۆستاجلوو بێ، خۆی پاراست و دەرگای بە ڕوویدا نەکردنەوە. سەرەنجام وەختایەک لە هەموو لایەکەوە خاترجەم بوو، چەند حوکم و کاخەزێکی دڵدانەوەی نووسی بۆ حوسێنقوڵی خولەفا و هاوڕێیانی و بە باوکە ناوی هێنا.

میر سمایل بە شان و شەوکەت و کەوکەبە و دەبدەبەیەکی بەرچاو لە قەڵا دەرکەوت و بەرەو مەرقەدی شێخ سەفی - گۆڕەکەی تیشکەی بە سەردا بباری- کەوتە ڕێ و زیارەتی گڵکۆی پاکی ئەژدادی پایەبەرزی کرد و داوای هیممەت و بەرەکەتی لێکردن. لەوێوە ڕووی کردە قەزوێنی پایتەخت و سەرەتا تەشریفی بردە ماڵ و سەرای خولەفا کە وەختێکی باش و بەودم بۆ ڕۆنیشتنە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دیاری بکەن.

حوسێنبەگی یووزباشی و سوڵتان مستەفا کە بیستیان هەموو لق و پۆپەکانی سەرسووران لە دەورەی دەسەڵاتی سمایلمیرزا لە قەزوێن کۆبوونەوە، سەریان لێشێوا. وسێنبەگ ویستی کە لە جلوبەرگی قەلەندەراندا بەرەو بەغدا بڕوا، بەڵام خەڵکێک ناسیانەوە و گرتیان و بردیانە بارگای پادشا. سوڵتان مستەفاش عاشیرەتی بەیات کە سەردەمی میری خوابەشیو لە ژێر دەسەڵاتی ئەوا بوون، کاتێک گەیشتە نێویان قۆڵبەستیان کرد و فڕاندیانە خزمەت شاسمایل. حوسێنبەگ هەشت مانگ لە قەزوێن گیرا و ئاخرییەکەی بە حوکمی فەرمانڕەوا کوژرا.

پاش داودامەزران و سەقامگیربوونی شاسمایل لەسەر تەختی دەسەڵات، سەرەتا حوسێنقوڵی خولەفای گرت و بە شیشی ئاورین سۆمایی لە چاوی جیهانبینی بڕی. هەروەها زۆربەی ئاژاوەگێڕانی قزڵباشانی گرتن و تاقمێکی کوشت و ئەوانی تری چێوەچزە دان و تۆقاندنی. دەستەیەکی زۆر باڵا بردن و لە

نێو هاوشانەکانیاندا وای بەرز کردنەوە کە لە پۆپەی هەموانیان تێپەڕاند. چۆنیەتی ڕووداوەکانی سەردەمی لە نێوبەندی باسوخواسەکانی داهاتوودا بەتەواوی دەخرێنەڕوو.

بەڵام نابێ لە بیرمان بچێ کە شاتەهماسب، فەرمانڕەوایەکی دادەوانی لایەنگری ژێردەستان و شاهەنشایەکی فامیدە بوو. زۆری دڵ بە ماڵی دنیایەوە بوو. ئەوەندەی زێڕ و زێو و جەواهێرات کۆکردبۆوە کە تەواوی پادشاهانی ئێران و توووران دوای ڕۆژگاری چەنگیزخان ناوەڵلا لەوەتی ئیسلام بناغەی داناوە، هیچکامیان قەت ئەوەندەیان نەخستۆتە سەر یەک. وەختایەک شاسمایل منی ڕەشکەرەوەی ئەم لاپەڕانەی ڕاسپارد هەتا بە سەر ڕابگەم و بزانم حیسابات چۆنە و چی بە سەر چییەوە، پێدا هاتم و ئاوام بژاردن: ١- سێسەد و هەشتاهەزار تمەن نەغدینەی زێڕ و زێوی سکە و خشڵ. ٢- شەشسەد خشتی ئاڵتوون و زێو کە هەرکامیان سێهەزار مسقاڵ قورس بوون. ٣- هەشسەد سەرپۆشی زێڕ و زێو. ٤- دووسەد خاڵوار پارچەی حەریر. ٥- سیهەزار دەست جلوبەرگ و باڵاپۆشی دورواو لە کووتاڵی هەرەباش. ٦- چەکوچۆڵ و ڕەخت و زینی سیهەزار سواران کە بریتی بوون لە جبە و زرێی گەوچنی ئاوریشمی خاو و سەرجلی زرێدار. ٧- سێهەزار وشتری مێ. ٨- سێهەزار سەر ماینی عەرەبی جوان و چالاک. ٩- دووسەد سەر ئەسپی چاک و تایبەت. جا لەو پێودانە پێدا بڕۆ و حیسابی خۆتی بۆ بکە و بزانە کۆشک و سەرسەرا و کارگە و مدبەق و فەڕاشخانە و یەختەرمەخانەی چەندە بوون.

ماوەی حەوت ساڵ و لە هێندێک شوێنان نۆ ساڵ بوو کە باج و پیتاکی هەرێمی ئازەربایجان، شیروان، ئەرران و چەند مەڵبەندێکی دیکەی وەرنەگرتبوو و خەڵک پێی قەرزدار بوون.

کوڕانی پایەبەرزی بریتی بوون لە: ١- سوڵتان محەممەدمیرزا ٢-سمایلمیرزا، کە هەردووکیان لە دایکەوە نەوەی عیسابەگی تورکمان بوون.

٣-سوڵتان سولەيمانميرزا ٤- سوڵتان ئەحمەدميرزا ٥- سوڵتان جونەيدميرزا، کە هەرسێک لە داوێنی خوشکی شەمخاڵ و جارييەکانی چرکەس بەربووونەوە. ٦- سوڵتان حەيدەرميرزا ٧- سوڵتان مستەفاميرزا ٨- ئيمامقولیميرزا ٩- سوڵتان مەحموودميرزا، کە هەر چواريان لە کەنيزانی گورجی کەوتبوونەوە.[1]

وەک لە ڕەوتی باسەکەڕا دەرکەوێ، سوڵتان حەيدەرميرزا لە ڕۆژی کۆچیدوايی باوکیدا کوژرا. پێنج کوڕی تری لەگەڵ سوڵتان برايمميرزای کوڕی بارامميرزا کە بەڕاستی ئادەميزادێکی ورد و وريا و شارەزای هەموو بواران بوو، وێڕای حەسەنميرزای کوڕی سوڵتان محەممەدميرزا، محەممەدحوسێنميرزای کوڕی بارامميرزا و بەديعوززەمانميرزای کوڕی بارامميرزا بەپێی فەرمانی شاسمايل لە قەزوێن کوژران. سوڵتان جونەيد زەردايی لە چاوان بڕا و سوڵتان محەممەدميرزا ناسراو بە خودابەندە و گەورەترين کوڕی پادشا دوای نەمانی شاسمايل بەگوێرەی تەگبير و ڕای ئەميران و مەزن و ماقووڵانی قزڵباش بوو بە شای ئێران. دياره چۆنيەتی ژيان و بەسەرهاتی هەرکامەيان لە جێی خۆیدا دەخرێتە گۆڕ.

تەرمی ئەو پادشا خوابەخشيوەيان دوای شۆردن و کفن کردن لە قەزوێنەوە ڕاگوێستە مەشەدی پيرۆز و لە پەنا مەرقەدی ڕووناکيدەر و بۆنخۆشی ئيمام ڕەزا – وەبەر ڕەحمەتی خودا بکەوێ – ناشتيان.

---

[1] - مێژووی عوسمانی لە لاپەڕە ٦٥ی بەرگی سێدا دەڵێ: شاتۆماسب دوازدە کوڕی لە پشتی کەوتۆتەوە و بەپێی تەمەن بريتين لە: محەممەدی خودابەندە، سمايل، مراد، سولەيمان، حەيدەر، بارام، مستەفا، مەحموود، عەلی، ئيمامقولی، ئەحمەد، زەينولعابيدين و مووسا. مراد و زەينولعابيدين بەر لە نەمانی باوکيان مردوون. گۆيا دوو کوڕی ديکەشی بە ناوی برايم و حەسەن هەبوون.

## ساڵی ٩٨٥ / ١٥٧٧ ـ ٧٨

شەوی شازدەی مانگی ڕەمەزانی ئەم ساڵە شاسمایلی (دووەم) لەم دنیا پووچەوە ڕووی کردە هەرێمی هەرمان. شاسمایل پادشایەک بوو زیرەک و ناسک خەیاڵ و بە سەر نەوسی خۆیدا زاڵ و بەرزەئاکار. لە مەیدانی شەڕا شێرەمەردێ بوو خەنجەرووەشێن و لە کۆڕی شادیدا هەورێک بوو گەوهەربژێن. ئەوەندە بەدڵ و دەروون بوو کە زێڕی تەواو عەیار و بەردی بێنرخ و چرووکی بە لاوە وەک یەک وابوو. لەبەر دەهندەیی و نێوچاوان بەرزی دەریا و کانگا بەرگەی بەخشینیان نەدەگرت.

دەریا کە دیتی تەخشانپەخشان و بەخشینی میری
لە خەجاڵەتیان بە سەر خۆی کێشا کەفێ وەک شیری
بە کانگا بڵێن تێیهەڵنەپێچێ و وازی لێبێنێ
چونکە سەرەنجام بە دەس بەتاڵی خۆی ڕادەژێنێ

سەرەڕای ئەمانە کەسێکی تووڕە و تۆسن و توندەتەبیات و قسەڕەق بوو. بۆ تاوانێکی بچووک سزایەکی گەورەی دادەنا و بۆ نوکتەیەکی خۆش زێڕێکی زۆری دەکردە باربوو. وەک باسیان کردووە و دەگێڕنەوە، شاسمایل سەرەتا لە ژێر سێبەری دایکی بەرزەوەجاخیدا پەروەردە کراوە، هەتا لە ساڵی ٩٦٣دا تاجی شانازی حوکمڕانێتی خوراسانی کراوەتە سەری. دوای ماوەیەک بە حەولودەولی ڕقەوەنان و قین لە زگان لێخراوە و لە سیاچاڵی قەڵای قەهقەهەدا زیندانی کراوە و ماوەی بیست ساڵان لەوێدا ماوەتەوە. دوای نەمانی باوکی لە زیندان دەرکێشراوە و کراوەتە پادشای ئێران. لەبەر بێتەگبیری هێشتا تەواو بناغەی دەسەڵاتی تەواو دانەکوتابوو ویستی کە جنێودان بە شێخەین (حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەر) و عوسمانی زوننوورەین و ئایشێی داوێنپاک و دە کەسەی

مزگێنیپێدراو – ڕەزای خودایان لێبێ – قەدەغە بکا و بەپێچەوانەی باوک و باپیری بجووڵێتەوە و ڕێبازێک بگرێتەبەر کە لە وڵاتی ئێران سوننی و شیعە هەرکام بە ڕێچکەی خۆیاندا بڕۆن و نەبنە لەمپەر و بەرگر لەسەر ڕێی یەکتر.[1] بەڵام چونکە قزڵباش لەسەر ڕەوتی ڕافزیبوونی خۆیان سوور بوون، لێی بێزران و تەمایان گرت هەر وەختایەکی بۆیان هەڵکەوێ لێیڕانەوەستن و ئەو سوڵتانە زانا و دادپەروەرە مسوڵمانە تێدابەرن. سەرسوور لە کاری خۆیان خافڵ نەبوون هەتا لەگەڵ یای پەریخانی خوشکی پیلانیان داڕشت و شەوێک لە شەوان کە ئەو پادشا پایەبڵیندە لەگەڵ حەسەنبەگی حەلواچی ئۆغلی خۆشەویستی چووبوونە سەرایەک و ژوورێکی تایبەتی و لە نوێنوباندا خەوتبوون، بۆ سبەینێ لای ئێوارە میر بە مردوویی و حەسەنبەگ بە نیوەزیندوویی دەرکێشران. ئەمیران و سەرداران هەرچی خوردبوونەوە نەیانزانی بەڕاستی چ قەوماوە. ئەمیرخانی تورکمان و سایری سەرۆکانی قزڵباشی بنەگری قەزوێن کەوتنە شۆڕدن و لە خەڵات پێچانەوە و ناشتنی ئەو خونکارە بەهەشتەلانە.

وەختێ مەرگ بێ لەبەر دەرد و ژان
بیانوو بە پیاو دەگرێتن زەمان
هەر ئەو میوەیەی دەردی پێوەبێ
بە جووڵانی خۆی دەشێ لێوەبێ
بە کاری چ دێ بۆ لەشی زێوین
کفنی بۆنخۆش و تابووتی زێڕین

---

١ – شاسمایلی دووەم هەر کە بوو بە فەرمانڕەوا ڕایگەیاند کە سوننییە. (مێژووی عوسمانی، ب ٣، ل ٦٦).

دوای دوو ڕۆژان پیاویان نارده شیراز بە دوای سولتان محەممەدمیرزادا. ئەویش چونکە لە خۆی ڕانەدەدی زۆر لەسەرەخۆ و بە ساوەساوە هاتە قەزوێن و کردیانە پادشا.

هەر لەم ساڵەدا پادشای هەمووی دنیا و خونکاری زەمان و جانگیری دەوران سولتان مرادخان لەبەروەی شاسمایل گەلێک کاروباری پێچەوانەی یاسا و ڕێسا و ڕێوشوێنی ئاشتی پێشووی ئەنجام دابوو،[1] تەمای گرت خاکی عەجەمان بە توورەکان بکێشێ، کە لەپڕێ هەواڵی مردنی شاسمایلی پێگەیشت و ئەمجارەیان سوورتر بوو لەسەر بڕیاری خۆی.

## ساڵی ٩٨٦ / ١٥٧٨ ـ ٧٩

لە سەرەتای ئەم ساڵەدا هەرەگەورەکانی قزڵباش: ئەمیرخانی تورکمان، شاروخخانی زولقەدر، موسەییبخانی تەکەلوو، پیرەمحەممەدی ئۆستاجلوو، قولیبەگی قۆرچیباشی ئەفشار، قورقەمیزخانی شاملوو و حوسێنقولی خولەفای ڕۆملوو پێکەوە ڕێککەوتن و پەیمانیان بەست کە کاروباری وڵاتی ئێران بە دەستەوە بگرن و هەرێمەکان دابەش بکەن و پادشای کوێرەمووشە هەر ناوی میرایەتی بە دووی خۆیدا بکێشێ و هیچکارە نەبێ. جڵەوی وەزارەتیان ئەسپاردە دەستی لێوەشاوەی میرزا سەلمانی جابری ئیسفەهانی کە ئەویش چاوی چاکی هەتەر نەدەکرد. ئەم کۆمەڵە سەرداره ویستیان کە بە فەرمانڕەوایەتی پادشای

---

[1] - شاسمایلی دووەم پەیمانی سوڵحی باوکی لەگەڵ عوسمانییەکان وەبەرچاو نەگرت و کۆمەڵێک لە خان و میرانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. هەرکەس لە عوسمانییان هەڵبڕابا چاکەی لەگەڵ دەکرد و پلەی دەدایە... لەم سەروبەندەدا حوکمڕانی لوڕستانی ئێران پەنای بردە بەر حکوومەتی عوسمانی و ئەوانیش لەڕێوە ئاڵای تایبەت و شیر و خەڵاتیان بۆ نارد. ئاوا بوو کە نێوانگرژی مابەینی ئێران و عوسمانی ڕەنگی دایەوە. (مێژووی عوسمانی، ب ٣، ل ٦٧).

کۆر و وەزیرایەتی وەزیری پرووش کاروباری وڵاتی عەجەمان ڕێکبخەن و هەڵیسووڕێنن.

هەی لەم بۆچوونە بۆشە، وەی لەو خەیاڵە خاوە

لە ماوەی ساڵێکدا تەواوی ماڵ و سامان و نەغدینە و خەزێنەیەکی کە شاتۆماسب وەسەریەکی نابوو، هەموو بە بادا چوو. بارودۆخێکی نالەباری بەرەو تێکچمین باڵی بە سەر وڵاتی ئێران کێشا.

هەر لەم ساڵەدا سوڵتان مرادخان پێی لەسەر بڕیاری پاری داگرت و دەشیزانی هەلومەرجەکە چۆنە. خۆی هەڵکرد و بە هەموو هێز و توانایەوە تێداچوونی نیشتمانی ئێران و بڕانەوەی بنەماڵەی بەدمەزەبانی ڕەچاو کرد. مستەفاپاشای وەزیری دووەمی کردە سەرکردەی قۆشەنی چەشنی دەریا بە ژاوەژاوی و سەد و پەنجاهەزار سوارەی دڕ و خوێنڕێژی وەپێش دا و فەرمان دەرچوو کە سپاسالاران و حاکمانی کوردستان بکەونە تاڵانوبڕۆی ئازەربایجان. هەر بۆیە خوسرەوپاشای بەگلەربەگی وان شانبەشانی میرانی کوردستان هێرشیان بردە سەر مەحموودبەگی ڕۆملووی حاکمی «خۆی» و کوشتیان. هەرێمی خۆی و سەڵماس گیرا و لەوێوە قۆشەنی بەرەو ورمێ داگەڕا و حوسێنخانبەگی حەسەنلووی حاکمی وێندەرێ گیرا و نێردرایە وان و خوسرەوپاشا مەتەقی لێبڕی.

هەر لەم ساڵە لە دیوانی قزڵباشەوە حکوومەتی تەورێز بۆ ئەمیرخانی تورکمان و دەسەڵاتی چۆخوری سەعد بۆ محەممەدیخانی تۆقماق (تۆخماخخان) دیاری کران.

## ساڵی ٩٨٧/ ١٥٧٩ – ٨٠

لەم ساڵەدا مستەفاپاشای سەردار بە خۆی و بە لەشکرێکی بێئەژمارەوە بە مەبەستی گرتنی شیروان و گورجستان بزووت. مەنووچێهری کوڕی

«غورغورە»ی[1] گورجی حاکمی ئاخسێخە (ئاخسێخا - تاخسێسە) سەری دانەواند و وێڕای کۆمەڵێک لە پاشازادەکانی گورجی ئیمانی هێنا و مسوڵمان بوو. بۆیە حکوومەتی بە میراتگەڕاوی بنەماڵەی وەکوو پاوانەمیری هەمیشەیی باربوو کرا. تۆقماقخانی حوکمڕانی چۆخوری سەعد وێڕای ئیمامقولیخانی قاجاری حاکمی گەنجە و بەردەع لەسەر ڕێگای «چۆلدر» بەرەگەیان لە قۆشەنی باڵادەست گرت و شکان. داودخانی کوڕی لۆراسبی گورجی کە بە فەرمانی قزلباشان بە سەر قەڵای تفلیس ڕادەگەیشت قەڵەمڕەوی ژێر دەسەڵاتی خۆڕایی کرد و هەڵات. مستەفاپاشا قەڵا و هەرێمەکەی خستە ژێر دەسەڵاتی و کۆمەڵێکی زۆری دانان بۆ پاراستنی و بەرەو شیروان بزووت. کاتێک دەشتی زەکەم بوو بە خێوەتگا و هۆردووبەزی هێزەکانی سەرەنجام سەرکەوتەی عوسمانی، لۆندی گورجی حاکمی ئەو مەڵبەندە هاتە دەست ماچ کردنی سەرداری باڵادەست و باج و پیتاکی وەئەستۆ گرت. لەبەر سۆز و دڵنەوایی میرانە و سینگفرەوانی پادشاهانە ناوچەی زەکەم و حکوومەتی باوک و باپیرانی لەسەر تۆمار کرا.

سپاسالار لەوێوە کۆچی لێنا و کاتێک لە نێوان چۆمانی قەنع و قەبری ڕکێفی بەتاڵ فەرمووە، ئەمیرخانی حاکمی تەورێز لەگەڵ سپای ئازەربایجان و نەخجەوان و شانبەشانی ئیمامقولیخانی قاجاری حاکمی گەنجە و بەردەع و قەرەباغی ئەرران بە سەر هێزەکانی ئیسلامیان دادا. سەرەتا کە قۆشەنی لە شکان نەهاتوو بە مەبەستی کۆکردنەوەی پاشەکەوتی خورد و خۆراک بڵاو ببوونەوە، قزلباش بە سەریاندا کەوتن و تاقمێکیان لێکوشتن و نیزیکەی شەشهەزار سەر وشتر و دووسێهەزار سەر ئەسپ و ماین و بارگین و یەستری ڕەوەی خونکاریان ڕادا و بردیان. وەختایەک سپاسالاری نەبەز هەواڵەکەی بیستەوە، خێرایەکی بارامپاشای میریمیرانی ئەرزەڕۆم و عوسمانپاشای میریمیرانی دیاربەکری بە

---

١ - ڕەنگە گرێگوار دروست بێ و ئەویش برای مەنووچێهر بووە.

کۆمەڵێک چەکداری ئاژاوە ناردە لێدانی سەرسووران. زۆرێک لە میران و سەرۆکانی قزڵباشان لەو هەڵلایەدا لە خاک و خۆڵی نەمان گەوزێندران و تاقمێکیان لە ڕووباری «کوڕ»دا خنکان و چوونەوە بەر باری فەنایە. هێزە زاڵەکان ڕۆژێک لەبەر هەستانی ڕووباری قەنع لەو شوێنە لەنگەریان گرت و بۆ بەیانی بەرەو شیروان پەڕینەوە و قەڵایەکیان بە دار و دیواری مۆرە لە «ئەرش» ساز کرد. پاشان وەسمانپاشای چرکەس، کوڕی «ئووزدەمیر»ی وەکوو وەزیر ناردە شەمماخی و قەیتاسپاشای وەکوو بەگلەربەگ لە ئەرش دانا و بە ڕێگای گورجستاندا گەڕایەوە ئەرزەڕۆم.

سوڵتان محەممەدی (خودابەندە)، سەماعوونی گورجی لە زیندانی قەڵای هەڵەمووت ئازاد کرد کە لە سەردەمی شاتۆماسبەوە گیرابوو. میر بە سەری کردەوە و حکوومەت و دارایی هەرێمی تفلیس و ناوچەکانی دەورانپشتی باربوو کرد و ناردییەوە گورجستان. کاتێک سەماعوون گەیشتەوە خاک و مەڵبەندی تفلیس کافران و مێرخاسانی هەرێمەکە تێیهاڵان و ڕێگایان بە سپای ئیسلام گرت و خەساراتێکی زۆریان گەیاندە مستەفاپاشای سەردار. دوابەدوای ئەو سوڵتان هەمزەمیرزای کوڕی شامحەممەد و میرزا سەلمانی وەزیر و گەورە سەرکردەکان بە سیهەزار سوارەوە لە قەزوێنەوە گەیشتنە گەنجە و بەردەع. ڕاست لەم جەنگەدا عادڵ گرایخان (گیرایخان)ی کوڕی خانی تاتار بە خۆی و پازدەهەزار سوارەوە لە دەربەندی شیروان تێپەڕی و چەشنی شێری بوێر چووە فریای عوسمانپاشا و مستەفاپاشای سەردار. عادڵ گرایخان وەختایەک پێینایە شەمماخی کە ئەرەسخانی ڕۆملووی حاکمی شیروان، لە ژووری شاری شەمماخیدا عوسمانپاشای وا گەمارۆ دابوو کە هێندەی نەمابوو بە زۆرداری لە لانێ دەرییەڕێنێ و بیگرێ. بەڵام دەرفەتی نەدان و هەڵیکردە سەریان و ئەرەسخانی گرت و چەکدارەکانی دانە بەر مەودای شیران و تیران و بە مەبەستی تالانی خێڵ و باری کە لەوبەری موغان بوون لە ئاوی ڕووباری کوڕ پەڕییەوە.

پاش تالانی هۆردووگای و بە دیلگرتنی خاوخێزانیان گەڕایەوە شیروان. لەبەروەی لەشکری تاتار بێر و بەوێدا بلاوببوونەوە، عادڵ گرای وێڕای کۆمەڵەچەکدارێکی تایبەتی لە گۆشەیەک مابوونەوە کە لەناکاو میرزا سەلمانی وەزیر بە خۆی و بیستهەزار سواری قزلباشەوە بە سەریاندا کەوت و لە «ئاقسوو»ی سەر بە شەمماخی شەڕیان لە نێوانیدا هەلگیرسا و بوو بە کوشت و کوشتار و دوای مرخێشمرخێش و کێشمەکێشمێکی زۆر عادڵ گیرای و میرزادەکانی تاتار گیرۆدەی سەرپەنجەی چارەنووس بوون.

کاتێک وەسمانپاشا بەم کارەساتەی زانی بە پەلەپرووزە و سەر لێشێواوی لە شەمماخیڕا بەرەو دەربەندی شیروان ڕایکرد و پەنای بردە بەر دژی دەموور قەپوو. لەشکری قزلباش لە شەممخایڕا چوونە ئەرش و قەیتاسپاشا و ئاوڕەحمانبەگی وستانی کە پاراستنی ئەوێیان پێئەسپێردرابوو، کوشتیانن و قەلاتی ئەرشیان ئاور تێبەر دا و کردیانە کۆمایەک خۆلەمێش و لەوێوە بە خاترجەمی گەڕانەوە قەرەباغ.

بەهائەددینبەگی کوڕی ئۆلمە کە بۆ دژداری قەلای قەبالە و ئاغداش داندرابوو، شوێنی خۆی بەجێهێشت و لە زەکەمەوە ڕۆیی بۆ لای تفلیس. دایکی سوڵتان هەمزەمیرزا (مەهدی عولیا) بە وەندووکە سەرکەوتنە بای ڕەبن بالی نیشت و بە بۆچوونی نەقوستانی ژنانەی کاروباری گرینگی شیروانی هەروا بەربەرەڵلا هێشتەوە و عوسمانپاشای لە دەموور قەپوو دەرنەپەڕاند و عادڵ گرایخانی هەلگرت و لە هەرەتی زستانا گەڕایەوە قەزوێن.

## ساڵی ٩٨٨ / ١٥٨٠ ـ ٨١

وەرزی بەهاری ئەم ساڵە مستەفاپاشای سەردار لە زستانەهەواری عەرزەڕۆمەوە هەستا و هاتە سوێی قەلای قارس و دەستی کرد بە دابەستنەوە و سازدانەوەی. کاتێک هەواڵی سەرکەوتنی قزلباش لە هەرێمی شیروان و ڕەوینی عوسمانپاشا بۆ دەموور قەپوو و گیرانی عادڵ گرایخانی تاتار بە گوێی

موبارەکی سوڵتان مرادخان گەیشتەوە، مستەفاپاشای لە سەرکردایەتی خست و ئەو پلەبەرزەی دایە سنانپاشای وەزیری سێهەم.

هەر لەم ساڵەدا محەممەدپاشای بۆسنەوی مەزنەوەزیر کە لەوەتی خانەدانی عوسمان لەسەر کارن هیچ گەورەوەزیرێک تای نەکردووە و نیزیکەی پازدە ساڵ بە سەربەستی وەزیری سوڵتان سولەیمانخان بووە و ئەوەندەی سوڵتان سەلیم ژیاوە لە پلەی خۆیدا ماوەتەوە، بە دەس کابرایەکی قەرەپشی وەبەر کێردان درا و شەهید کرا. ئەوەندە پایەبەرز بوو کە شاتۆماسب بە باوکە ناوی دێنا و رووی قسانی تێدەکرد.

سەرەتای مانگی رەبیعی یەکەم عەلیقوڵیخانی کوڕی سوڵتان حوسێنبەگی کوڕی توورمێشخانی شاملووی حاکمی هیرات وێڕای مورشیدقوڵیخانی کوڕی یەکان شاقوڵی ئۆستاجلووی حوکمڕانی خەواف و باخەرز لەگەڵ سوڵتان محەممەد کەوتنە ململانی و دووبەرەکایەتی و لە وەختێکی بەودم و لەباردا هەباسمیرزای کوڕی شامحەممەدیان لە تەمەنی دە ساڵیدا کردە پادشا و ویستیان کە بە زۆرەملی سەر بە تەواوی میران و سەردارانی خوراسان نەوی بکەن و بیانخەنە ژێر رکێفی خۆیان. سەرەتا هێرشیان بردە سەر مورتەزاقوڵیخانی پورناکی حاکمی مەشەد و لە شوێنێک کە پێیدەڵێن تۆرۆق و کەوتۆتە دوو فرسەخی شار، شەڕێکی یەکجار قورسیان لە نێوانیدا قەوما. مورتەزاقوڵیخان هەڵات و لەودیو شوورەی شاری مەشەد خۆی گرتەوە. عەلیقوڵیخان چوار مانگ لە رووکاری مەشەد بنەی داکوتا و سەرەنجام هیچی بۆ نەکرا و گەڕایەوە هیرات.

لە ئاخری ئەم ساڵەدا دایکی سوڵتان هەمزەمیرزا بەشێک لە هێزەکانی قزڵباشی بە سەرکردایەتی شاروخخانی مۆردار بە مەبەستی وەرگرتنەوەی تۆڵەی خوێنی میر عەبدوڵڵای باوکی ناردنە سەر میر مرادی(؟) حاکمی مازندەران. پەلاماردەران میر مرادیان گرت و بردیانە قەزوێن و ئەویش بە تۆڵەی خوێنی

باوکی کوشتییەوە و دەسەڵاتی مازندەرانی بەخشی بە میر عەبدی (؟) برای خۆی. میرانی قزڵباش لە حوکمی توند و تیژی ئەو خاتوونە تۆقین و بۆ پێچانەوەی کەوتنە باس و ڕاوێژان. سەرەنجام وایان دانا کە بڵێن عادڵ گرای‌خان کەڵەگایەتی و حەزی لێدەکا و بەم بیانووە هەردووکیان بکووژن. پۆلێک سەرسووری دڵڕەقی پەنجە بە خوێن بە فیت و دنەی مەزنەمیران پەلاماری سەرسەرای پاشایان دا و ئەو ئافرەتە بێ‌دەست و مست و وەجاخ‌زادە و داوێن‌پاکەی کە لە تاوان دەستی لە قەدی مێردە بێ‌غیرەتەکەی هاڵاندبوو بە ڕاکێش‌ڕاکێش بردیانە دەرەوە و کوشتیان. شەو و ڕۆژێک (مەهدی عولیا) بە ڕووت‌وقووتی لە نێو خەڵکا فڕێ‌درا و کەس نەچوو بە لایەوە هەتا کفنی بکا و بینێژێ. عادڵ گرای‌خانیش وێڕای سەدکەس لە میرزادەکانی تاتار لەت‌وپەت کران و تێداچوون.

## ساڵی ٩٨٩ / ١٥٨١ ـ ٨٢

سەرەتای ئەم ساڵە سنان‌پاشای سەرکردە گەیشتە ئەرزەڕۆم و شامحەممەدیش بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی لە قەزوێنەوە بەرەو کوێستانی ئەرران بزووت. شاقولی سوڵتانی زولقەدری کوڕی تەبەت‌ئاغا و مەقسوودئاغای تەمغاچی بە ئامانجی پێکهاتن و ئاشتی ناردنە ئەرزەڕۆم بۆ لای سنان‌پاشا. دوای ئەوەی کەیخوداکان گەیشتنە خزمەت سپاسالار، وایان قەرار دانا کە سەردار بگەڕێتەوە ئیستانبووڵ و سوڵتان محەممەدیش داوەرێتەوە قەزوێن. لەوێوە کەیخودا و پیاوماقوولان بنێرێتە بارگای سوڵتان بۆ مبارەکبادی خەتەنەسوورانی شازادەی بەختەوەر و بەم شێوەیە دەرگای سوڵح و حاوانەوە بخرێتە سەرپشت. بەپێی پێکهاتن سنان‌پاشا گەڕایەوە پایتەخت و پادشای ئێرانیش سوڵتان محەممەد، برایم‌خانی تورکمانی بە کۆمەڵێک دیاری و خەڵاتەوە ناردە بارەگای سوڵتان مرادخان. خونکار ملی نەدا بۆ پێکهاتن و سنان‌پاشای لە وەزارەت و سەرکردایەتی وەلانا و برایم‌خانی لە بەند توند کرد.

لە مەوداي مانگي ڕەبيعي دووەمدا عەليقولي‌خاني شاملوو سەرلەنوێ کەوتەوە لەشکرکێشان و وێڕاي هێزێکي بەرچاو پەلاماري دەروێش حەمەسولتاني ڕۆملووي حاکمي نەيشابووري دا و دواي خراپەکاري و خاپوور کردنێکي بەرفرەوان لە هەرێمەکەي بێ هيچ دەسکەوتێک گەڕايەوە هيرات.

لە کلکەي ئەم ساڵەدا سولتان مرادخان دەستووري فەرموو کە شازادەي کامڕەوا سولتان محەممەدخان خەتەنە بکرێ و ڕێوشوێني خونکاراني خانەداني عوسمان کوێر نەبێتەوە. بە مەبەستي کۆکردنەوەي پێداويستييەکاني ميوانداري و بانگهێشتني ميران و پياوماقوولان، جاڕچي و تەتەر و دەرکەواناني دەرگاي بەرزي ناردنە هەموو لايەکي قەڵەمڕەوي ژێر فەرماني.

## ساڵي ٩٩٠ / ١٥٨٢ ـ ٨٣

لە سەرەتاي ئەم ساڵەدا سولتاني بێهاوتا دواي داوەرين و گردبوونەوەي سپاسالاران و خان و بەگلەر و دەسەڵاتداران، دەستووري پتەوي دا تا جێگاي ميوانداري لە سەراي برايم‌پاشا کە کەوتۆتە شاني ڕۆژاواي مەيدانە ئەسپ ئامادە بکرێ. وەستاکاراني پەنجەنەخشين و کارجوان، بازاڕ و کۆڵاني شاريان بە کووتاڵي ئاڵا و واڵاي هەرەباشي فەڕەنگ و قوماشي حەوڕەنگيلەي جێي ئێرەيي نيگارخانەي چين و بەهەشتي بەرين، ڕازاندەوە. وەزيراني پايەبەرز و بەگلەربەگاني خاوەنڕێز چوونە ئەو شوێنە و سولتاني جيهان و شاياني تاجي زێڕيني خانەداني عوسمان تەشريفي بردە ئەو جێگايەي دەتگوت بەهەشتە. ماوەي دوو مانگ هەموو ڕۆژێ لەگەڵ دەستەيەک لە پياواني تايبەتي بارەگاي چەشني بەهەشتي لە هۆدەيەکي سەير و سەمەرە و جوان نەخشێندراو ، کۆبۆوە.

هەرکام لە وەزيران و گەورەگەوران و ميران لە دەوروبەري مەيدانەکە ژوور و سەيوانيان لە دار و تەختە هەڵبەست و کەوتنە سەيراني دەسکردي سەرسوڕهێني سنعاتکاران. ئەندازياراني هونەرمەند و مامۆستاياني وردەکار چي دڵگر و جوان و ڕەنگينە و زمان و قەڵەم دەروەستي تاريفاتيان نايەن، خستيانە

بەرچاوان. بۆ وێنە وەستاکارانی سازندەی دارەخورما، پێنج داریان کە هەر یەکەی بە دوو ساڵ دروست کرابوون و شانیان لە شانی سەوڵ و چنار تێدەپەڕی نیشانی جەماوەر دا. ئەم دارانە هەرکام بە کۆمەڵێک میوەی ڕەنگاوڕەنگ و گوڵ و گیاوگژی بۆنخۆش و سومبول وەها ڕازابوونەوە کە ئاسمان هەر چاوێک و هەزار چاو، چاوی لێنەدەترووکاند. لەسەر زار و زمانان باوە و لە نێو دەفتەری سەرحیسابانٍدا وا نووسراوە کە هەر دارەی سیٍهەزار فلووری تێچووە و دارەخورمای بچووک و ئاساییش زیاتر لە پێنسەد شەشسەد قەد بوون. بڕی هەزار ئاڵتوون لە شەکر و شیرینی خۆش و ڕەنگاوڕەنگ خەرج کرابوو. پەیکەری چی گیانلەبەری چڕندە و فڕندەیە لە مەلەوە بگرە هەتا ماسی سەر گوێ زەوی و جیٚژیانی ئادەمی، هەر چەشنەی دە دوازدەیەکی لێ ساز کرابوو. ئاژەڵی وەک مەڕ و نێری و بەران و باڵندەی بەرزەفڕ و دڕندەی وەکوو شێر و پڵینگ کە عەقڵ لە دیمەنی دەسکردیان تێدەمێنێ، چاوی هەموو بینەرێکیان وا بە مۆلەق دەوەستاند دەتگوت هەر نابزوون و رووحیان لەبەردا نیە. سەرپاکی ئەم دیمەنە سەرنجڕاکێشە چاوی میری بەرزەناوی لاواندەوە.

لەم دوو مانگەدا بڕی شێستهەزار ئاڵتوون خەرجی سازکردنی فیشەکە شێتە و ئاگربازی کرابوو کە لە تاوپەڕەوە هەتا نیوەشەو گڕی ئاگربازان سەری لە سینەی ئاسمان دەساوی و دەبوو بە کۆسپ و لەمپەری سەر ڕێی ئەستێرانی گەڕۆک. جا لەو پێیە دەکرێ بۆ خەرجوبەرجەکانی دیکە بڕوانی و حیسابی خۆتی بۆ بکەی.

هەروەها هەر دەستە و چینێک بەگوێرەی پیشەی خۆی شتی سەمەرەی دەخستە بەرچاوان. بەزمگێڕ و چاوەش و گۆرانیبێژانی دەنگخۆش هەموو ڕۆژ و هەموو شەوێ لە کۆڕی بەزم و ڕەزم و شادمانی سەرخۆشان و ڕووگەشاندا کۆزیلکەیان دەبەست و بە ئاهەنگ و جریکەی دڵبزوێنی شادیهێن، پیر و لاو کەیفیان دەبزووت و خوار و ژوور و گەورە و گچکە تینیان لە دەروونی دەگەڕا.

دەنگبێژانـــی بالاپـــەری شـــۆخ و شەنـــگ
جارێک بە دەنگ، هەلێک بە ترپەی ئاهەنگ
دەیانچڕی هـــەوای شـــاد و بـــن‌بـزێـــو
بادەنۆشـــان پێیـــان تـــەڕ دەکـــردن لێـــو

لەو ماوە خۆش و بەئۆخژنەدا، بێوچان کابانانی بارگای بەرزەدەرانـەی میر چی خواردنی بەتام و خوێ و خۆشی شاهانەیە، بە قەدرایە ئەسـتێرەکانی گومبـەزی ئاسمـان، لێیـان‌دەنـان و سـازیان دەکـردن. یـەکێک لـە ڕووداوە سەیرەکانی ئەم جێژنە نالکرانی پازدەهەزار قاز بوو بە دابی یەکسمان کـە بـۆ برژاندن لە مەودای دوازدە ڕۆژەڕێوە لە ئیستانبوولەوە بە پێیان هێنابوویانن. خورد و خۆراک و خواردەمەنی ئەوەندە زۆر و بەپێی فیلان بوو کە ڕووبەری دنیا برسێتی تێدا نەما. دوای کۆتایی هاتنی میوانی، سولـتانی شـادمان شـازادەی جیهان‌پەنای هەلبژارد بۆ حکوومەتی مەغنیسا کە شوێنی دانیشتنی گەورەترین شازادەکانی بنەمالەی عوسمان و ناوەندی دەسەلاتی ئەو خانەدانە نان بـدە و خێرۆمەندەیە و تاجی سەربەرزی نایە سەری و ناردی.

دوای بڕانەوەی کۆڕی جێژن و شادمانی، میری مەزن کـە نـاخی چەشـنی ئاوێنەی بێگەرد دەدرەوشا و پەرەدەری دادەوانی بوو، تیشکەی بیری کەوتە سەر ڕاپەڕاندنی کاروباری ولات. حەیدەرپاشای چرکەسی میری‌میرانی سیواسی وێڕای پازدەهەزار سوارە و پیادەی یەنی‌چەری و لک و پەلی چەکدار و قۆشەنی ڕۆملی لە ڕێگای دەریای «قولزوم»ەوە بە سواری لۆتکە و بەلەمان بەرەو کەفە بەڕێکرد بۆ یارمەتیدانی عوسمان‌پاشا لە شیروان. پاشـان محەممەدپاشـای بۆسـنەوی میری‌میرانـی دیاربـەکری بـە مەبەسـتی گەیانـدنی خەزێنـە و پاشـەکەوت و پێداویستییەکانی قەلای تفلیس ڕائەسپارد. سەماعوونی گورجی وێڕای میرانـی

قزلباش بەتایبەت تۆخماخخانی ئۆستاجلوو و ئیمامقولی سولتانی قاجار سەرەڕێیان لێگرتن و چل خالوار زێڕ و بار و بارخانەی پێتەویستی قەلایان کە دووهەزار خالوارێک دەبوو، هەموویان لێئەستاندن. ئەم شەڕ و هەلایە پیاوێکی زۆری تێدا کوژرا. پیاوەکانی بەگلەربەگ خۆیان پێیان وابوو کە مستەفاپاشای کوڕی غورغورەی سپاسالاری چۆلدری پاشەنگی لەشکر کەترەخەمی نواندووە و تەنانەت قزلباش بە دەسکیسی و فیتی ئەو کەتنەکیان گێڕاوە، بۆیە ویستیان بیگرن و بینێرنە بارگای میری هەتا تۆلەی لێبکرێتەوە و سزا بدرێ. کە تێیهالان بە فێلەکەیانی زانی و بە پالپشتی کۆمەلێک لە مەردازایانی گورجی خێرایەکی لێیان وەخۆکەوت و دەستەوخەنجەر هەلیکردە سەر محەممەدپاشای سەردار و محەممەدپاشای خادمی میریمیرانی دیاربەکر و بریندار کردن. کوێخای محەممەدپاشای سپاسالاری ئەرزەرۆم کە ئامێزی تێوەرێنابوو تا بیگرێ، وێڕای چەند کەس لە یارانی بە یاریدەی مێرخاسانی گورجی شەلالی خوێنی کردن و تۆماری تەمەنی پێچانەوە. مستەفاپاشا خێرایەکی خۆی هاویشتە سەر خوانی زین و لەو گەرداوە بۆی دەرباز بوو.

هەر لەم سالەدا عەلیقولیخان بە هێزێکی تێر و تەیارەوە هەباسمیرزای هەلگرت و لە شانشینی هیراتەوە بە مەبەستی گرتنی چەند ناوچەیەکی خوراسان وەدەرکەوت. کاتێک گەیشتە سەرهەدی سەبزەوار شامحەممەد وێڕای هەمزەمیرزای کوڕە گەورەی لە قەزوێنەوە هەلیکردە سەری و سێ مزلیان نێوان بوو کە عەلیقولیخان پێیزانی و ڕەوی. مورشیدقولیخانی لە قەلای توربەتی زاوە دانا و بۆخۆی هەتا دەروازەی هیرات لە هیچ جێیەک ڕانەوەستا و سەری جلەوی هەلنەنگاوت. نێوەڕاستەکانی مانگی شەشەکان شامحەممەد گەیشتە ڕووکاری قەلای توربەت و لەڕێوە گەمارۆی دا. چونکە سال درەنگ و هەژدە ڕۆژی لە سەرماوەز تێپەڕیبوو، هەر لەوێ خێلبەزی کرد و کەوتە هەول و هەلسووڕانێکی زۆر بۆ گرتنی قەلا. بەلام لەبەروەی هێزەکانی قزلباش لە بابەت

گرتنی قەڵا و وەچنگ هێنانی مورشیدقولیخانەوە شلەیان دابوویە و بەم کارە ڕازی نەبوون، شامحەممەد هیچی بۆ نەکرا و با بە دەس مایەوە.

## ساڵی ٩٩١ / ١٥٨٣ ـ ٨٤

لە نێوەڕاستەکانی ڕەبیعی دووەمی ئەم ساڵدا وەختایەک هەتاو لەسەر دەرانەی کەلووی گا و مانگی بانەمەڕ خۆی نواند. شامحەممەد بە تەگبیر و ڕاوێژی میرزا سەلمانی وەزیر دەورەی قەڵای توربەتی بەردا و بە بلاوکردنەوە دەنگۆی گەڕانەوە عێراق و چوونە زیارەتی مەشەدی ئیمام ڕەزا، کردی بە هەرا. بەڵام دوای بڕینی مزڵەڕێیەک سەری جڵەوی بەرەو هێرات وەرسووڕاند و هرووژمی بردە سەر هەباسمیرزا و عەلیقولیخان کە ئەو کاتی لە مابەینی کاروانسەرای شامەلیک و شارۆکەی کووسوویە بنەیان داگرتبوو، بە شەوێک هەژدە فرسەخی ڕێگا بڕی و لەگەڵ ئەنگووتنی گزینگی بەیانەی ڕۆژی دووشەممۆی هەژدەی مانگی بەرباس لە زارکی « سەرپێڵ » پێشەنگانی لەشکری پادشا خوتوخافڵ بە سەر قەرەولانی بەرایی هۆردووی خەنیمیان دادا. سەرکردەی ئەو پۆلەچەکدارە کە حاجی کووتووواڵ (دژدار) بوو دوای شەڕ و لێکدانی کەم وێڕای چەند کەس لە هاوڕێیانی گیرا و پاشماوەی لەشکری شکستە بە پەلەپڕووزێ خۆیان گەیاندە هۆردووگای عەلیقولیخان و ئەوانیش بە بزڕکاوی و سەرشێواوی دەرپەڕین و کۆڵیان دا و ڕایانکرد. لەشکری سوڵتان محەممەد سەری دە دووی عەلیقولیخان و خێڵی شاملوو نا و پتر لە سێهەزار کەسیان لێ کوشتن و گەلێکیان گرتن. عەلیقولیخان و هەباسمیرزا نیوەگیانێکیان لەو گەردەلوولە بەتەوژمە خوێنمژە قوتار کرد و خۆیان هاویشتە شار و پەنا شوورە و حەسار.

بۆ سبەینێ کە میری ڕۆژهەڵات بە سام و شان و شەوکەتەوە بە شوێن سپای ئاسمانی سیاچارەدا شیری خوێنخۆرەوەی لە کالان هەڵکێشا و بە تیشکە وترووسکەی تیخی بریقەداری خوێنی بە سەر دنیادا پژاند، لەشکری بوێری ئێراق

گەیشتە ڕووکاری هیرات و لە باغ و بێستانەکانی دەوروبەری‌دا لەنگەری گرت. شامحەممەد دوابەدوایان کشا و تەشریفی ڕکێفی لە قوتابخانەی سوڵتان حوسێن‌میرزا بەتاڵ کرد. لەسەر پێوشوێنی قەڵای توربەت، فەرمانی گەمارۆی شاری دا. قزڵباش ئەوەندەی خۆیان بە قەڵای توربەتەوە ماندوو کرد، هێندەیان گوێ نەدایە ئابلۆقەی هیرات و کەوتنە سەیر و سوحبەت و گەمە و شادی و ڕابواردن و بەپێی کەش و هەوای ناوچەکە جووڵانەوە کە وای هەڵدەگرت و قسەی میریان بە لاوە وەکوو با وابوو.

میرزا سەلمانی وەزیر کە زۆرجاران کەترەخەمی و گوێنەبیستی سەرسوورانی دیتبوو، ویستی کە چەند کەسێک لە مەزن و ماقووڵانیان بکوژێ هەتا حوکمی حاکم بڕشتی هەبێ و خەڵکی پێ چاوترسێن بێ. قزڵباش بەم بڕیار و بۆچوونەیان زانی و تێکڕا بۆ کوشتنی کلکیان لێکهاڵاند و ڕۆژێکی کە میرزا سەلمان بە شەقامەڕێدا دەڕۆیی بۆ حەمامی گازەرگا، یۆسف‌بەگی ئەفشار کوڕی قوڵی‌بەگی قۆرچی‌باشی لە سووچێکی لێی‌خەفتا و ویستی بیکوژێ. دۆستێکی وەخۆی هێنایەوە و وەزیر ڕێگاکەی کلا کرد و بە دڵەڕاوکە و ڕەنگپەڕیوی خۆی هاویشتە سەرسەرای میری. سەرۆکان و سەردارانی قزڵباش کەوتنە شوێنی و سوارە و پیادەی پڕچەک دەورەی دەوڵەتخانەیان دا و داوای میرزا سەلمانیان کرد و هەرچەندی شا و شازادە هەمزەمیرزا کە تازە خوازبێنی کچی لێکردبوو، پاڕانەوە دەس هەڵگرن و بکشێنەوە، هەدایان نەدا. قوڵی‌بەگی قۆرچی کە کلکەنەوتینەی ئەم کەتنە بوو، لە پادشا و کوڕەکەی وەژوور کەوت و گوتی ئەگەر بێتوو نەهێڵن دەستمان وێی‌ڕابگا بنەما و کۆڵەکەی دەسەڵاتی ئێوە تووشی خەسار دەبێ. ئێستا وا چاکە بیدەنە دەس من کە بەندی بکەم هەتا هەرا و ئاژاوەکە ڕۆمرکێ. میرزا سەلمانیان هێنا و دایانە چەنگی. دوای دوو ڕۆژان لە باغی زاغان پۆلە قشقەڵە و سەگانی چاونەزێری قزڵباش دووبارە هێرشیان کردە سەری و کوشتیان. لە جەنگەی ئاژاوەکەدا ئەم شێعرەی بە زاری‌دا هات:

نایەوێ کوشتنی من حەشر و حەلاییکی کە دەورەی داوم
چـون لە ڕۆژی بنەوانێوە بە پەیکانی ئەوین کوژراوم

کۆمەڵێک لە هۆنراوە ناسک و خۆشەکانی ئەم وەزیرە شـوێنەوار جوانـە لەسەر زار و زمانان زۆرن و بەڕاستی لە هەموو بواراندا پیاوێکـــی زیـرەک و پیتۆڵ و شارەزا بوو. ئەم چوارینەیەش هەر ئی وییە و دەینووسمەوە:

دیـــسان یـــارم مـــوژدەی دیـــداری داوە
کـــوا دەگاتـــێ دڵـــم ئـــۆقرەی نـــەماوە؟!
سـەلمان نابـێ لـــە چنـگ دەردی بناڵـــی
گـــەر ئاشـقی بـەڵات زۆر بـۆ نووسـراوە

بەکورتی دوای کوژرانی میرزا سەلمان، شا سوڵتان محەممەد و هەمزەمیرزا بۆ ماوەی چل ڕۆژان لە هیرات مانەوە و تەواوی باغ و بێستان و ماڵ و سـەرای ئەوێیان کردە هێلانەی قەلەڕەشە و لە شەوی پازدەی مانگی شـابانی مـەزندا لەگەڵ عەلیقولیخان و هـەباسمـیرزا بـە ڕواڵـەت و سەرپێـست پێکهـاتن و گورگەئاشتی کرا و دەورەی هیراتیان بـەردا و ئـاڵای ڕۆیـشتنیان هەڵـدا یـان بەڕاستی تەپڵی ڕەوینیان بەرەو ئێراق کوتا. کاتێک پادشـا گەیـشتە ناوچـەی سەبزەوار بیستی کە حوسێنبەگی کوڕی سۆندووکی قـۆرچیباشـی ئەفـشاری حاکمی ئەو شوێنە چەڵەمەی نیری میری شکاندووە و لـە قـەڵای سـەبزەواردا مەتەرێزی داکوتاوە. شا سوڵتان محەممەد، هەمزەمیرزای ڕاسپارد کـە بچـێ و بیگرێ. ئەویش لەڕێوە قەڵاکەی گـەمارۆدا و دوای ڕۆژێـک قزڵـباش گرتیـان. حوسێنبەگ و یـارانی کـوژران. دەسـەڵاتی مەڵـبەندی مەشـەدی بـاربـووی سەلمانمیرزای نەدیدەی عەولاخانی ئۆستاجلوو کرد کە کچـەزای شاتۆماسـب

بوو. شاقولیبەگی کوڕی قارنجەی بۆ کردە گزیر و دەمڕاست و تەشریفیان گەڕایەوە قەزوێن.

دوای ون بوونی قۆشەن و چوونەوەی میر، مورشیدقولیخان هێرشی بردە سەر سەلمانمیرزا و کوڕی قارنجە و ئەوانیش باشاریان نەکرد و مەشەدیان بە چۆلی بەجێهێشت و ڕەوین و مورشیدقولیخان بەبێ شەڕ و کوشتار شارەکەی گرت.

هەر لەم ساڵەدا سوڵتان مرادخان، پلەی مەزنەوەزیرایەتی بەخشی بە سیاوەشپاشا و تاجی شانازی کردە سەری. سەرکردایەتی هێزەکانی خاکی عەجەمانی دا بە فەرهادپاشای دووەم وەزیر. فەرهادپاشا بە لەشکری زۆر و زەوەندی کە چەشنی دەریا شەپۆلیان دەدا لە ئیستانبووڵەوە ڕووی کردە ئێران. تۆقماقی لە چۆخوری سەعد وەدەرنا و قەڵایەکی لە ئێرەوان بنیات نا و شوێنەواری فەرهاد[1] دەبێتە ڕێکەوتی ساز کردنی. سنانپاشای جوغاڵ ئۆغلی لەوێ دانا بە وەزیر و خدرپاشای کردە میریمیرانی ئێرەوان و گەڕایەوە زستانەهەواری عەرزەڕۆم. حەسەنپاشای سپاسالاری سەردارانی شامی لەگەڵ حاکمان و میرانی کوردستان و ڕۆملی بە مەبەستی گەیاندنی خەزێنە و خورد و خۆراک و پێداویستی بۆ قەڵای تفلیس کە کارێکی یەجگار ئەستەم و دژوار بوو، بەڕێکردن و منی نووسەرەوەی ئەم وشە و پیتانەش لەگەڵیان بووم. لە دەربەندی توومانس کافرانی گورجی شانبەشانی تاقمێک لە میرانی قزلباش ڕێیان بە سپای ئیسلام گرت. ئەگەرچی هێزە باڵادەستان پتر لە پازدە هەزار سوار بوون و کافر نەدەگەیشتە پێنسەد کەسی، بەڵام دیسانیش لە پێشدا لەشکری ئیسلام شکا، کەچی دواتر لە سایەی خۆڕاگری و بەرەنگاری حەسەنپاشا کە بە خۆی و پۆلەسوارێکەوە لە جەرگەی لادینانیدا دەستی دەکردەوە، قۆشەنی ئیسلام

---

١ - اثر فرهاد.

لەو گێژەنی بەڵایە بە سلامەت قوتار بوو. بۆ بەیانی عێلاتی دیکـەی قزڵباشـی قەزاقلەر و ئێسپەرلوو لەسەر لێواری رووباری سەمخوود لـە نێـو لێـرەواردا بۆسەیان دانایەوە و ماتەیان هەڵگرت. حەسەنپاشا بە فێڵەکەیانی زانی و منی هەژاری لەگەڵ تاقمێکی سەرۆکانی رۆملی نـاردە سـەریان. عـەلیقولـیبـەگی ئێسپەرلوو کە سەرکردەی ئەو تاقمە بوو گیرا و چەکدارەکانی هەڵاتن.

##ساڵی ۹۹۲ / ۱۵۸٤ ـ ۸۵

بەهاری ئەم ساڵە فەرهادپاشای سپاسالار رووی کردە گورجستان و قەڵای لووری دابەستەوە و لەوێوە بەرەو دەربەنـدی توومـانس هـەنگاوی نـا و کـە گەیشتێ بە چل رۆژان قەڵاتێکی لە بەرد و قوڕ لێ سـاز کـرد. حەسـەنپاشـای میری میرانی ئەرزەرۆمی بۆ پاراستنی راسپارد و عەلیبەگی بۆسنەوی سەرهێزی لووری وەکوو بەگلەربەگ لە لووری دانا و لەوێرا بەرەو ئاخسێخە کەوتەڕێ. ویستی لەوێش دژێک بنیات بنێ بەڵام هێزە باڵادەستەکان بە گوێیـان نـەکرد و دژی راوەستان، هەر بۆیە سپاسالار لەوێوە گەڕایەوە. کافرانی گورجی سەر بە مەنووچێهر رێگایان لێگرت و زەرەد و زیانێکی زۆریان بە کەلوپـەل و رسـق و رۆزی مسوڵمانان گەیاند. بۆ وێنە هەڕایان کـردە سـەر عارەبانـەی تایبـەتی فەرهادپاشا و بە جارییەی خۆشەویستییەوە دایانرووتانـد و هـەرچی شیری گەوهەربەند و تیردان و قەڵغان و پێستە سمۆرە و دەڵەک بوو بە تاڵانیان برد.

هەر لەم ساڵەدا محەممەد گیرایخانی تاتار بە لەشکرێکی پتر لـە دەنگـی بارانی بەهار هەڵـیکردە سـەر شـیروان و محەممـەدخانی زولقـەدری حـاکمی وێندەرێی لەگەڵ چەکدارەکانی لە خاکی نەمان گەوزاند. وێڕای عوسمانپاشای وەزیر لە ئاوی کوڕ پەڕییەوە و هـەرێم و ناوچـەکانی گەنجـە و قـەرەبـاغ و بەردەع و دەورانپشتەکانی دانە بەر گوردی تـاڵانی تاتـاری و کـاولی کـردن و نیزیکەی سەدهەزار کوڕ و کچی مسوڵمانی بە دیل گرتن و بەرەو کەفەی بردن.

شا سوڵتان محەممەد بە دوای لەشکری تاتاردا ڕووی کردە قەرەئاغاج و ئەمیرخانی مووسلاوی حاکمی تەوریزی کردە سەرهێزی قزڵباش و بەرەو شیروانی نارد. کاتێک سەرکردەکان چوونە دەورەی قەڵای باکۆ و باوەشیان تێوەراند، لەبەروەی هەرکام لە سەردارانی وەک موسەییبخانی تەکەلوو، شاروخخانی زولقەدر و پیرەمحەممەدی ئۆستاجلوو بە مەیلی خۆیان دەجووڵانەوە و سەریان بۆ یەکتر نەوی نەدەکرد، قەڵشتیان کەوتە نێوانی و قاتیوقڕییەکی بەرچاو باڵی بە سەر هۆردووی سەرسووراندا کێشا و بێ ئەوەی هیچیان بۆ بکرێ گەڕانەوە. دوای ئەوە دەسەڵاتی حکوومەتی شیروان درایە دەس ئیمامقولیسوڵتانی قاجار و بۆ یارمەتیدانی عوسمانپاشا بە قۆشەنی قەرەباغەوە لە دەشتی عەلی چووپان بەرەورووی سپای قزڵباش سینگی داکوتا. لەناکاو شەڕێکی قورس و کوشتارێکی سامناک لە نێوانیاندا هەڵگیرسا و هۆردووی قزڵباش شکان. ڕەوەیەکی زۆر و زەوەندی یەکسم و وشتر و کۆمەڵێکی بێژمار تاوڵ و ڕەشماڵ و شمەک و ئامرازی گەوهەرنیشان و نەخشین و قاپ و قاچاخی زێو و فەرش و لاکێش و مافوورەی ئاوریشم و زێڕچن کەوتنە دەس لەشکری عوسمانی. لەم جەنگەدا سوڵتان مرادخان پیاوی نارد بە دوای وەسمانپاشادا و مزگێنی بۆ نارد کە پلەی مەزنەوەزیرایەتی و سەرکردایەتی خاکی عەجەمانم داوەتێ و خێرا بگەڕێتەوە. عوسمانپاشا، حەیدەرپاشای وەکوو وەزیر دانا بۆ ڕاگرتن و ئاگاداری شیروان و بە هاوکاری تایفەی چرکەس بە دەموور قەپوودا بەرەو کەفە ڕۆیی. لەبەر دوژمنایەتی و نێوانناخۆشی لەگەڵ محەممەد گیرایخانی تاتار لەسەر تالانی ناوچەی شیروان، لە براکەی ڕاسپارد و بە یاریدەی خۆی پشتگەرمی کرد. دوو سەرکردە پێکەوە چوونە سەری و خانی تاتار باشاری نەکردن و ڕەوی. شیروان گیرایخانی(؟)[1] برای

---

١ - مێژووی عوسمانی، ب ٣، ل ٧١، ئیسلام گیرایخانی نووسیوە.

بە ئەسکەری ڕۆم و تاتارەوە کەوتە شوێنی و گەیشتە سەری و کوشتی و بە یارمەتی هێزەکانی عوسمانپاشا بوو بە حوکمڕانی تاتاران.

دوای قەومانی ئەم کێشانە سوڵتان سەد ئەوەندەی دیکەی عوسمانپاشای کەوتە بەردڵی و وەختایەک گەیشتەوە لاشیپانەڕامووسانی خونکاری مەزن، لەڕێوە بە سۆزی میری لاوێندرایەوە و تاجی سەربڵیندی پلەی گەورەوەزیرایەتی کرایە سەری و کەوڵی سەرکردایەتی تەواوی هێزەکانیشی خرایە سەر شانی. وایان دانا هۆردووبەزی لە قەستەمموونی بێ و ئەگەر هاتوو گێرە و کێشە و ئاژاوەیەک لە لای کەفە و تاتارەوە سەری هەڵدا بە دەریادا بازۆێ و بگاتێ و دایکووژێنێ، دەنا بۆ گرتنی ئازەربایجان مامزەی لە کەلەکەی ئەسپی بنگێوێ.

لە درێژەیساڵدا شامحەممەد و هەمزەمیرزای کوڕی لە قەرەئاغاجەوە چوونە تەورێز. ئەمیرخانی حاکمی تەورێزیان گرت و ناردیانە قەڵای قەهقەهە و دوای چەند ڕۆژان فەرمانی کوژرانی دەرکردا و عەلیقولیخانی فیج ئۆغلی ئۆستاجلوو لە جێگای داندرا و هەر لەوێیان هۆردووبەز کرد.

## ساڵی ۹۹۳ / ۱۵۸۵

لە سەرەتای ئەم ساڵەدا عوسمانپاشا سەبارەت بە کەفە و تاتار سەنیری خاترجەمی وەژێر سەری دا و بە ئامانجی گرتنی تەورێز و تێکڕای ناوچە و مەڵبەندەکانی ئازەربایجان چەشنی شێری بەنەڕە و فیلی بەفیشقە لە خێڵبەزی قەستەمموونیڕا لەشکری تاو دا. شا سوڵتان محەممەد و هەمزەمیرزای کوڕی کە ئەودەمی شەریکەدەسەڵاتی باوکی بوو، هەر کە ئەم هەواڵەیان پێگەیی بە ماڵ و کۆچەوە لە تەورێزەوە هەستان و داپەڕینە سەر چۆمی ئووزەنتیل. وەسمانپاشا بە شان و شکۆی زیاترەوە بەرەو تەورێز بزووت و ڕۆژی هەینی ۲٤ی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز لە لێواری ڕووباری ئەجی کە کەوتۆتە نیوفرسەخی شاری تەورێز، ڕکێفی بەتاڵ فەرموو. خێوەت و سەراپەردەی بەرزی کە سەریان دەگەیشتە پەرپەڕۆچکەی ئاسمان قوڵیان تێککێشا. بۆ بەیانی بەبێ شەڕ و

بەرگێڕەوە «ئەخی خوونی» تاوڵ و ڕەشماڵی هێزە نەبەزەکانی لێهەڵدرا. برای عەلیقوڵیخان کە شانبەشانی کۆمەڵێک قزڵباش لە کووچە و کۆڵان و شەقامی شار سەنگەریان دابەستبوون و بە خەیاڵی خۆیان ئامادەی بەربەرەکانی بوون، هەر ئەوێ دەمێ لەبەر گورزی هێزەکانی سوڵتانی شانیان نەوی کرد و دەستیان لە پاراستن بەردا و پێش تاوپەڕین لەگەڵ گەورەپیاوانی تەورێز چەشنی ژیوە بێر و بەوێدا شۆڕ بوونەوە و خۆیان پەنا دا. تاقمێک گەندەپیاوی دەمهەراش بەپێی ڕێوشوێنی خۆیان بافیشیان کردبوویە بن باڵیان و بە ئازایەتی و بوێری دەنازین و ژن و زارۆکیان ناردبوونە گەرماوان و دەرگای دووکان و بازاڕانیان کردبوونەوە و خەریکی ئیشی خۆیان بوون کە هێزە سەرکەوتووەکان پێیاننایە شارەوە و بە گەڕەکاندا گەڕان. تاخی سورخاب کە نیوەی شار دەبێ و نابێ ئەو شەوە تالان کرا. کازیوەی بەیانی قازی کامران و مەولانا محەممەدعەلی شێخولئیسلام و تێکڕای پیاوماقووڵان چوونە دەس ماچ کردنی وەزیری پایەبەرزی زەمان و هاواری ئامانئامانیان گەیشتە حەویقی ئاسمان. لە چاکە و بەزەیی ئەو وەزیرە لێوەشاوە چەند کەس لە هێزەکانی یەنیچەری بە مەبەستی پاراستن و چاوەدێری گەڕەکەکانی شار دیاری کران و ڕایانئەسپاردن کە بەرهەڵست و بەرگێڕەوەی لەشکرداران بن و نەهێڵن هیچ زەرەرێک بگاتە خەڵک. بەیانەی ڕۆژی جێژنی ڕەمەزان وێڕای سەرداران و سپاسالاران سەبارەت بە ڕاگرتن و پاراستنی تەورێز کەوتە ڕاوێژ. هەموویان لەسەر ئەو پێشنیارە سوور بوون کۆشکی دەسەڵاتی تەورێز کە ناسراوە بە هەشت بەهەشت بکرێتە قەڵا و شوورەی باش و پتەوی دەوروبەری کەڵتە بکرێتەوە و ئەوەندەی پێویستە کلاوقووچەی بەرز و بەقەلافەتی لێساز بکرێ. دەورانپشتیان پێوا و بە سەر قۆشەن و یەنیچەریدا دابەشیان کرد و لە ماوەی دوو مانگاندا قەلاتێکی یەکجار سەخت و قایم کۆتایی پێهات. سەرەتا پاراستنی ئەو شارەیان هاویشتە سەر ئەستۆی سنانپاشا و سەرەنجام دایانە دەس جەعفەرپاشای خادمی میریمیرانی

شام و حەوت هەزار سوارە و پیادەیان خستە بەردەستی و پاشەکەوت و خورد و خۆراک و زمهەرِی سالێکیان بۆ دانا و ئەسپی گەرِانەوەیان تاو دا. هێزەکانی عوسمانی لەبەر چەند هۆیەک جێیان پێ لەق ببوو: ١- کەم بوونی تفاق بۆ یەکسمان کە نیزیکەی مانگێک هەموو رِۆژێ تەنیا یەکی مستێکیان توێکڵەدار و لەوەرِی فریزوو دەدانێ کە بە هەزار زەحمەت هەڵیاندەقەند و چارەوایان نەمرنەژی پێدەژیاندن. ٢- نەخۆش کەوتنی عوسمانپاشا کە مانگێک دوای مانەوەی لە تەورێز بە سەر شانیدا هات و رِۆژ بە رِۆژ زیاتری پەلوپۆ هاویشت. ٣- خەڵکی تەورێز بەپێی سرشتی خۆیان چەند کەسێک لە هێزەکانی یەنیچەرییان کوشتن کە بۆ پاراستن و راپەرِاندنی کاروباری گەرِەکان داندرابوون. تاقمەکانی قەپووقوولی و یەنیچەری بە قەومانی ئەم کارەساتە دەرهەڵبوون و بێئەوەی بە خزمەت عوسمانپاشای رابگەیەنن، هێرشیان کردە سەر شار و بازارِ و لە کات و ساتێکا نیزیکەی پازدەهەزار پیرەپیاوی پەککەوتە و لاوی توانایان بە لەپەشیران قەڵتوبرِ کردن و ماڵ و سامان و پاشەکەوتی ژیانیان بە تالان بردن و ژن و منداڵیان بە یەخسیر گرتن و رایانکێشانە هۆردووبەز. ماوەی مانگێک تا چل رِۆژان بێنێوبرِ کەلوپەل و خواردەمەنی و دەغڵ و دانەوێڵەی حەشاردراوی ژێرخانان و نێوچاڵان دۆزرانەوە و دەرکێشران و کێشەوەیان کردن بۆ هۆردووگا. هەر بۆیە خەڵکی تەورێز لێیان بێزران و هەزارەزیلەی جەماوەر رایانکردە خزمەت هەمزەمیرزا و چۆنیەتی لاوازی لەشکر و بارودۆخی نالەباری وەسمانپاشایان پێراگەیاند. هەمزەمیرزا دەستەیەک لە ئەمیران و سەردارانی ناردە سەر سنانپاشای جوغال ئۆغلی کە لە سەعیداوا پێشەنگ بوو. قۆشەنی هێرشبەر لەشکری ئیسلامیان شکاند و وەختایەک هەمزەمیرزا ئەم هەواڵەی پێگەیی گەشاوە و پێینایە رکێف و خێرایەکی بە خۆی و پێنجهەزار سوارەوە گەیشتە دەوروبەری هۆردووی نەبەزی چاونەترس. بۆ لای ئێوارە تەواوی بەگلەران و چەکداران داوەرین و هاتنە بەندی میرانشا و لەبەر

دەمی شازادە سەفیان بەست. دوای ڕۆژاوابوون و بگرە هەتا نوێژی خەوتنان شەڕ و لێکدان و تەق‌وهۆڕی تفەنگان و چرکەچرکی دەمانچان و شەقەشەق و جرینگەی شیران و هاژەی تیران و فڕکەفڕکی قوڵەنێزان وڵاتی هەژاندبوو. وەختایەک بەگلەران و سەرگەوران و سەرکردان ویستیان بگەڕێنەوە لان و مزڵی خۆیان، پەلاماری دەستەیەکی لەشکری باڵادەستیان دا و محەممەدپاشای میری‌میرانی دیاربەکریان کوشت. مرادپاشای سەرۆکی سەردارانی قەرامان کە بە ئەسپەوە لە بە قوڵکەیەکا ڕۆچووبوو، وێڕای چەند کەس لە ئەمیران و پیاوماقووڵان گیرا. هرووژمی قزڵباشان هێندە بە تین و تاو بوو کە دەستەیەکی قزڵباشان لەبەر شەوی ئەنگوستەچاو خۆیان بە زنجیر و عارەبانان دادا و لە یەکسمەوە هەڵدێران و عارەبانەچی گەیشتنە سەریان و گۆشاوگۆش سەریان بڕین.

چەند ڕۆژێک دوای تەواو بوونی کاروباری قەڵا، هێزە لە شکان نەهاتووەکان لە مێرگ و جێ‌خێڵی چەرەنداب کۆچیان لێنا هەتا لە نیزیک و دەوروبەری شەنبی‌غازان بارگە و بنەیان بە عەرز دادەن کە هەمزەمیرزا بێ‌گرێ و کۆسپ لە پشتەسەری هۆردووی موبارەک هەڵقوڵی و لە ڕاست و چەپەوە قۆشەنی باڵادەست هرووژمیان کردە سەر جوغال ئۆغلی و هەشتا سەر وشتریان بە بارەوە بردن و زیان و زەرەرێکی زۆریان گەیاندە شمەک و پاشەکەوت و توێشەی لەشکر و هەتا حاندی خێوەتەکانی هۆردوو تێڕاچوون و کەیخودا خوسرەو کە تازە ببوو بە میری‌میرانی ئەرزەڕۆم کوشتیان و سەری بڕاویان دەس دایە و گەڕانەوە و بۆ شەو بەرەورووی هۆردوو لە شانی «سەردەرۆ» ڕکێفیان بەتاڵ کرد. بۆ بەیانی کە عوسمان‌پاشا لە گیانەڵادا بوو، نایانە تای کەژاوە و باریان لێنا و ڕۆیشتن. سنان‌پاشا بۆ پاراستن و پاشەنگی لەشکر دیاری کرابوو کە گەیشتنە گوندی نەزەرلوو و بۆ شەوەر خستیان. لە جەنگەی شەودا نزگەرەیەکی بێ‌پشوو وەسمان‌پاشای داگرت و بۆ سبەی کە بەرەو تەسوو دەچوون لە بەینی ڕێگادا گیانی دایە دەس پەروەرندەی جیهان. شازادە

هەمزەميرزا كەوتە شوێن لەشكر و عێلی شاملوو وێڕای سمايلقوڵیخان لە قوڵی ڕاست و تۆقماقخانی ئۆستاجلوو لە باڵی چەپ و خۆی لە جەرگە و تەنيشتانەوە بزووتن. پاش بڕينی دوو فرسەخ ڕێگا بەم شێوەيە، شاملوو لە شانی ڕاستەوە چەشنی پەپوولە خۆيان بە لەشكری ئيسلام دادا و ئاگری شەڕ و لێكدان هەڵگيرسا و گڕی كوشت و كوشتار خۆش بوو. لای باڵی ڕاستی هێزە باڵادەستەكانی عوسمانی كە بەگلەربەگان و لەشكری دياربەكر و قەرامان و ئاناتۆلی دەيانپاراست، سەريان وێكهێنا و پاڵيان پێكەوە دا. هەمزەميرزا و تۆقماقيش جووڵانەوە و لێيان نيزيك بوونەوە هەتا هێزە نەبەزەكان بكەونە بەر چاووزار، بەڵام قەپووخوڵقی و چەكداران و سايری هێزەكان بەجارێك لە جەرگە و باڵانەوە و بە سواری ئەسپانی ئازای پتەو كە دوو سێهەزارێك دەبوون، وێكڕا مامزەيان لە يەكسمان كوتا و هەڵيانكردە سەر پياوانی شاملوو و دووسەد كەسێكيان لە خوێنوخوڕ گەوزاندن و شمشێر و نێزەيان لێهەژاندن. سوڵتان هەمزەميرزا كە ئەم ديمەنەی بينی تۆقی و بە سەر لێشێواوی و خەساربار و زراوچوو گەڕايەوە.

دوای ئەوەی شەو باڵی بە سەر وڵات كێشا، لەشكری ئيسلام گەلێك دڵنيگەران و پرشوبڵاو لە دەورانپشتی تەسوو شەوەری كرد. بەری بەيانی هەواڵی نەمانی عوسمانپاشا بڵاو بۆوە و بەگلەران و ميران و پياوماقووڵان و مەزنەبەرپرسانی حكوومەتی خانەدانی عوسمان لە نێو خۆياندا سنانپاشايان بە سەرۆك هەڵبژارد و لەوێوە بزووتن و دوای دوو ڕۆژ گەيشتنە ئەلباق و لەوێ كەوتنە كفن و دفنی وەسمانپاشا. لە تەواوی ئەم ماوەيەدا منی هەژار يەكتەكان بە شوێن لەشكری سەركەوتەدا بە پاشەنگی دەمكوتا و لە هەر جێوجانێك نيزيكەی پازدەهەزار و بگرە زياتريش ئەسپ و ماين و يەستر و وشتر دەوەستان و لەسەر ڕێوبانان خۆڕايی دەكران و ئەوانەی سەكەت دەبوون زگيان دەدڕين و هەركامەی نيزيكەی دوو مەنی خيز و تەنانەت پتريش لە ورگيدا

کـۆببـۆوە. لانیکەم سەدهەزار سەر چارەوا لە هەرێمی تەورێز بەجێمابوون و ئەگەرچی خەڵکی وڵاتەکە دەیانپاراستن، بەڵام تاقە سـەرێکیش بـە زینـدووی نەگەیشتە گیای بەهارێ. کاتێک سنانپاشا گەیشتە «وان» لە ئاستانەی بەرزی کۆشکی میریڕا حوکمێکی پوخت و پاراوی شایانی سەرکردایەتی بـۆ دەرچـوو. سنانپاشا بۆ ماوەی دوو مانگ جڵەوی سەرۆکایەتی هێزەکانی لە ئەستۆ بوو.

هەر لەم ساڵەدا عەولاخانی خاقانی خاوەنبڕشتی ئۆزبەک بە لەشـکرێکی بێئامان و بێژمار کە ئاقڵ نەیدەبـڕی چەندەیـە، لـە ڕووبـــاری جـەیحوون پەڕییەوە و تەشریفی لە بەلخی قوبەی ئیسلام دابەزی. دوای چەند ڕۆژان کەحێلی خۆشاژۆی بەرەو هەرێمی بەدەخشان ئاژاوت و تەواوی ئـەو وڵاتـەی لـە ژێـر دەستی کوڕانی شاسولەیمانی کوڕی یادگار محەممەدمیرزا کوڕی ناسـر کـوڕی میرزا عومەرشێخ کوڕی میرزا سوڵـتان ئەبووسـەعید کـوڕی مـیرزا سوڵـتان محەممەد کوڕی میرزا میرانشا کـوڕی مـیر تـەیمووری کوورەگـان دەرکێـشا. عەولاخان بە هێرشێک ئەو هەرێمەی کە زیاتر لە دووسەد و سی ساڵ بوو لە بن دەسەڵاتی بەبڕستی تۆرەمەی تەیمووری و تیرە و تایفەکانی جوغتایدا بوو بە هەڵمەتێک گرتی و کردی بە دارۆغەنشین و گەڕایەوە قەسری شکۆداری خۆی لە بوخارای دەروازەی بەخێروبێر.

## ساڵی ٩٩٤ / ١٥٨٥ ـ ٨٦

لەم ساڵەدا سوڵتان مرادخان بە مەبەسـتی بڕینـەوەی کێـشە و ئـاژاوەی قزڵباشان کە ماوەی پێنج مانگ جەعفەرپاشایان لە تـەورێز گـەمارۆ دابـوو، فەرهادپاشای کردە سەرکردەی قۆشەنی باڵادەسـتی مـیری و ناردییـە هانـا و یاریدەی. فەرهادپاشا لە قوستەنتەنییەوە ئاڵای سەرکەوتنی هەڵـدا و بـەپێی فەرمانی فەرمانڕەوا بەرەو خاکی عەجەمان بزووت. بەڵام بەرلەوەی هێزەکـانی سوڵتان بگەنە ئازەربایجان، محەممەدخانی تورکمـانـی حـاکمی کاشـان، وەلیخانی تەکەلووی حوکمڕانی هەمەدان، موسەییبخانی کوڕی شەرەفەددین

حاکمی ڕەی و ئەمەتسوڵتانی زولقەدری حوکمداری شیراز پێکەوە لە سەرەتای مانگی بەفرانبار لەشکری ئێراق و فارسیان بەرەو ئازەربایجان دەنگ دا. وەختایەک گەیشتنە دەوروبەری تەورێز پیاویان نارده لای شا سوڵتان محەممەد و شازادە هەمزەمیرزا و لێیان ڕاسپاردن کە ئەو کەسانەی بوونە هۆی کوژرانی ئەمیرخان، بەتایبەت عەلیقوڵیخانی فیج ئۆغلی، محەممەدی سارووسولاغ و ئیسمیخانی شاملوو بدەنە دەس ئێمە هەتا تۆڵەیان لێبکەینەوە. پاشان بە پشتیوانی خودای گەورە لە ماوەی هەفتەیەکدا شوورەی تەورێز دەگرین و هەرەسی پێدێنین و تەختی دەکەین.

هەمزەمیرزا بەم ڕاسپاردەیە دەماری ئازایەتی بزووت و چراخپێ ڕاوەستا و قسەی تاڵوتوونی ناردەوە بۆ سەرۆکان و تەنانەت چەند کەسێکی قزڵباش کە لەم بوارەدا هەڵدەسووڕان و پێیان لە بەڕەی خۆیان زیاتر ڕادەکێشا یەکەوجێ کوشتنی و ویستی نێردراوەکانیش تێدابەرێ بەڵام هەر چۆنێک بوو بە خەسارباری گەڕانەوە. میر دەستەیەک لە پیاوەکانی خۆی دانا بۆ گەمارۆی قەڵا و هەموو ڕۆژێ لەگەڵ تاقمێک لە مێرخاسانی پەنجە بە خوێن لە شەقامی تەورێز هەڵدەقوڵین و دەکەوتنە شەڕی ئەمیرانی لاساری سەربزێو. دوای تێپەڕینی چەند ڕۆژێکی ئاوا، میرانی بلەوەز پەنامەکی کاخەزێکیان نارد بۆ جەعفەرپاشا و نووسیان کە سەر وەبەر فەرمانی حکوومەتی عوسمانی دێنن. ئەگەرچی ئەم کار و هەنگاوە شتێکی تەواو پووچ و درۆ و بێخێر بوو، بەڵام جەعفەرپاشا زۆری پێگەشایەوە و دانیشتووانی قەڵا کەیفیان گوڵی کرد و ورەیان بەرز بۆوە. هەموو ڕۆژێ دەروازەی قەڵایان دەکردەوە و هرووژمیان دێنایەدەر و گەلێک ئازایەتی و دەستوبردیان دەنواند. تەنانەت جارێکیان پۆلە مێرێکی ڕۆم لە حەوشە دەرکەوتن و شاروخخانی زولقەدری مۆرداریان گرت کە ئەرکی پاراستنی خەندەک و سەنگەرانی لە ئەستۆ بوو و سێودوویان لێنەکرد و سی کەس لە ئەولادان و دەسوپێوەند و خواجەکانیان کوشت. تۆپی کەللەکوشی

بەناوبانگی میری کە لە سەردەمی شاتۆماسبی خوابەخشیوڕا لە قەڵای گۆکرەچینلیق مابۆوە و هێنابوویان و لە مەیدانی «وەرجوو» بۆ لێدانی قەڵا ئاگر دەدرا و خەساراتێکی زۆری لێدەکەوتەوە و دە جووت گا بۆیان نەدەکێشرا، کۆمەڵێک لە مەردازایانی عوسمانی لینگیان دایە سەری و لە چاوترووکانێکا پشتێند و مێزەری خۆیان لێ قڵفە کرد و چەشنی زنجیر دەستیان تێکگرت و بە ڕاکێشڕاکێش بزدیانە حەوشەی قەڵا.

لە جەغزی بەخت و بێبەختی چەرخی گەردوونی چەپگەرد
دەماری گیانی تەگبیر و ڕایان هەڵدەپسن داو داو
ئەگەر هاتت بێ بە تاڵەموویەک دەکرێ بیکێشی
کە هاتت نەهات لۆلۆی زنجیران دەپچڕێن تەواو

قوڵیبەگی قۆرچیباشی ئەفشار کە مایەفیتنەی دووڕوویی و دووبەرەکی قزڵباشان بوو، هەمزەمیرزا خۆی لێخۆش کرد کە بیتەزێنێ و هەقی خۆی بنێتە مستی. قوڵیبەگ پێیزانی و لەگەڵ جەبارقوڵی برازای هەڵات و پەنای بردە بەر جەعفەرپاشا لە نێو قەڵای تەورێز. جەعفەرپاشای لە فێڵوفرت و کێشەی سەرسووران وە ئاگا هێنایەوە و لێدرانی ئەو بوودڕەی لە قاو دا کە چەند ڕۆژێک بوو کەنکەنەچی بە هەزار کوێرەوەری لە نێو چاڵەبەفری حەسەنبەگەوە گەیاندبوویانە پەنا شوورەی قەڵا و دە دوازدە هەنگاوێکیان پتر نەمابوو کە لە ژووری دژ سەر وەدەربنێن. لە لای قەڵاوە سەری ڕەهەندەکەیان دیتەوە و پێیدا چوونە خوار و تەواوی کەرێزکەنەکانیان کوشتن و ئاویان بەردایە سەر بوودڕەکە و دایانڕووخاند.

وەختایەک میرانی تووڕەی سەربزێو هیچ ئومێدێکیان بە ڕەزامەندی هەمزەمیرزا نەما، تەهماسبمیرزای نۆ ساڵەی برایان هەڵفریواند کە مرادبەگی

تورکمانی بەهارلوو بە لەلەی داندرابوو. بە قسەی خۆش لە ژووری ماڵی شا دەریانکێشا و لەگەڵ خۆیان بردیان و بەرەو عێراق گەڕانەوە و لە قەزوێن دایاننایە سەر تەختی پادشایەتی. لە تەواوی ناوچە و مەڵبەندەکانی ئێراق و فارس سکەیان بە ناوی لێدا و خوتپەیان بە ناوی خوێندەوە. مەزن و میران پلە و پایە و هەرێمەکانیان بە چاکە و بەرژەوەندی یەکتر لە نێو خۆیان‌دا دابەش کرد و موسەییبخان پلەی وەزارەت و ڕاوێژکاری وەبەرکەوت. وەختایەک هەمزەمیرزا ئەو هەواڵانەی بیستەوە لەڕێوە ئیسمیخانی شاملووی حوکمڕانی قەزوێنی بە مەبەستی پاراستنی خاوخێزانی تیرەی شاملوو لە قەزوێن وەکوو پێشەنگ ناردەوە و خۆشی وێڕای عەلیقولیخانی ئۆستاجلوو و محەممەدی ساروو سولاغ بە دووی‌دا کشا. کاتێک گەیشتە ناوچەی سوڵتانییە میرانی سەربزێو پێیان زانی و تەهماسبمیرزایان هەڵگرت و لە سایینقەڵا بەرەوڕووی ڕاوەستان و لەشکریان لە سان دا. ئەگەرچی پیاوەکانی تەهماسبمیرزا زۆر و هاوڕێیانی هەمزەمیرزا دەستەیەکی کەم بوون، یاریدە و پشتیوانی بێسنووری یەزدانی باڵی گرتن و وەلیخانی تەکەلوو وێڕای عەلی پاکماڵی کوڕی لە گەرمەی شەڕدا کوژران و لەشکری تەهماسبمیرزا شکستی بە سەر شانی‌دا هات. خودی هەمزەمیرزا بەڕاستی لەو هەڵایەدا زۆر پیاوانە و ئازایانە دەستی کردەوە و بەرەوڕووی موسەییبخانی وەزیر و محەممەدخان و تۆماسبمیرزای برای ڕاوەستا و هەرسێکی گرتن و بە کەمەندی چارەنووس چۆڵەپێچی کردن. زۆربەی گەورەگەورەی ئەو ئاژاوەگێڕانە کوژران و پاشماوەیان بە شڕ و شپڕێوی هەڵاتن و هەزارەزیلەی تایفەی تەکەلوو و تورکمان بەرەو عێراق و هەمەدان تێیانتەقاند. لەوێش خۆیان بۆ نەگیرا و ترس وای هەڵپێچان کە هەتا بەغدای بردن و تێکڕا سەریان وەبەر دەرانەی بەختیاریی خانەدانی عوسمان هێنا.

سوڵتان هەمزە زاڵ و سەرکەوتە گەڕایەوە تەورێز. لەم جەنگەدا دەنگ و ئاوازەی هاتهاتی ڕۆمیٚ و داوەرینی فەرهادپاشای سپاسالار و لەشکری وەک

ڕۆژی ڕابوونەوەی لە تەورێز باڵی ئەنگاوت. شا سوڵتان محەممەد و هەمزەمیرزا لە تەورێز دەرکەوتن و بەرەو ئەردەوێڵ و قەرەباغ بزووتن. فەرهادپاشا تەواو بە سەربەستی گەیشتە ناوچەکانی تەورێز و سەرەتا لە دەوروبەری دزەی خواجەی ڕەشیدەددین محەممەد لە «خامەنە» شوورەیەکی هەڵچنی و لەوێوە ڕووی کردە شاری تەورێز. گەلێکی ئافەرین و دەسخۆشانە لە جەعفەرپاشا کرد و بە سۆزی میرانە بە سەری کردەوە و دەستی بە سەریدا هێنا و پووڵ و پاشەکەوتی پێویستی بۆ خەرجوبەرجی لەشکر دیاری کرد و بە وەزیری دانا و تەشریفی بایدایەوە زستانەهەواری عەرزەڕۆم.

سوڵتان محەممەد و هەمزەمیرزا بە نیازی زستانەهەواری قەرەئاغاج ڕۆیشتن و لەوێ بنەیان داگرت. «خوودی»ناوێکی کوڕە دەلاک کە فێرکار و ڕاهێنەری ئیسمیخان و خۆشەویستی میرزا بوو، نیوەشەوێکی ئەو سەروەی دارستانی فەرمانڕەوایەتی و گوڵی گوڵزاری سەیدایەتییەی لە نێو سەراپەردەی خۆیدا دایە بەر گوڕمی خەنجەری جەوهەردار و شەلاڵی دەریای خوێنی کرد و باریکەی دایە و تیژ ڕەوی بۆ لای ئیسمیخان. ئەگەرچی ڕووداوەکەیان بە سەر ئەودا هێنا، بەلام ئیسمیخان خوودی گرت و هێنایەوە لای پادشا و کوژرا. عەلیقوڵیخان و ئیسمیخان وێڕای تەواوی خان و بەگلەرانی قزڵباش، ئەبووتالبمیرزایان بە پادشا دانا و لە مێرگ و چیمەنی قەرەباغەوە بەرەو ئێراق بزووتن. کاتێک گەیشتنە قەزوێن میرانی عێراق و فارس بەم کاریان ڕازی نەبوون و دژیان ڕاوەستان. بەناچار ئەبووتالبمیرزایان هەڵگرت و بۆ لای کاشان و ئیسفەهان چوون. لە هیچ شوێنێک کەس لووتی پێدانەهێنان و هەر میر و حاکمێک بە مەیلی خۆی دەجووڵاوە و ئالای سەربەستی و زۆرەملی هەڵدابوو.

لە سەرەبەهاری ئەم ساڵدا بە فیتی شەیتان و شۆفاران مورشیدقوڵیخان و عەلیقوڵیخانی شاملوو نێوانیان شێوا و لە دۆستەوە بوونە دوژمن.

عەلیقولیخانی بە نیازی چزاندنی، هەباسمیرزای بە لەشکرەوە لە هیرات و خوراسانەوە هەلگرت و بە ڕێگای «قاین»دا بەرەو مەشەد پێینایە ڕکێف. کاتێک گەیشتە دەشتی «جەناباد»، مورشیدقولیخان بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی لە مەشەدەوە دەرکەوت و لە بیابانێکی نێوان جەناباد و موحەوەلات هێزەکانیان تێکهەلەنگووتن. مورشیدقولیخان لە پێشدا لەگەڵ عێلی ئۆستاجلوو کە مستەفاسولتانی کوڕی کوجەلی شاڕوودی سەرکردەیان بوو، تەگبیری لێکرد تا لە گەرمەی شەڕا هەباسمیرزا بڕفێنن و بیهێننە لای ئەو. چارەنووس وای هێنا کە ئەم نیازەی هاتەدی و لە جەنگەیەکا کە عەلیقولیخان بەڕاستی دەسەلاتی بە سەر مورشیدقولیخاندا شکابۆوە، لە پشتەسەریڕا خەبەر هات کە خێلی ئۆستاجلوو میرزایان ڕفاندووە و بردوویانەتە لای مورشیدقولیخان. بە بیستنی ئەم هەواڵە بۆسۆی لە دەروونی هەستا و هەناسەی ساردی هەلکێشا.

که پیاو ڕۆژگاری لێ تاریک دابێ
هەر کارێک بیکا بە مەیلی نابێ

عەلیقولیخان ڕووی لە مەیدانی شەڕ وەرگێڕا و ڕکێفکوت بەرەو هیرات ڕۆیی و زۆربەی سەرۆکان و سەردارانی ئەسیرکران. مورشیدقولیخان شاد و بەکەیف و کامەران و بە زرموکوتی دەهۆڵ و زوڕناوە کاروانی بەشەوکەتی بەرەو مەشەد کوتای و لەوێ هەباسمیرزای دانایە سەر تەختی دەسەلات و بۆخۆشی بوو بە هەمەکارەی حکوومەت.

سالی ٩٩٥ / ١٥٨٦ ـ ٨٧

لە سەرەتای ئەم سالەدا فەرهادپاشای سپاسالار بە مەبەستی گرتنی قەلەمڕەوی سەماعوون ڕووی کردە گورجستان و قەلای گۆڕخانەی دابەستەوە و

حەیدەرپاشای وەک بەگلەربەگ لێدانا و بە سلامەتی و بە دەسکەوتەوە گەڕایەوە.

هەر کە وەرزی بەهاری ئەم ساڵ داگیرسا و خاقانی ڕۆژهەڵات بە مەبەستی گرتنی هەرێمی چوارەم پێی بەختیارانەی نایە ڕکێفەوە و جەمشیدی خۆر سەراپەردەی پادشایەتی بە شوێن ڕەشەمەدا هەڵبوارد و گەیشتە خاکەلێوە و کەلووی ماسی و کاوڕ بە دوای یەکتردا سووڕان، خونکاری جیهانگیر عەولاخانی ئۆزبەک بە نیازی گرتنی ناوچە و مەڵبەندەکانی خوراسان قۆڵی هەڵماڵی و مەردانە وەدەرکەوت. وێڕای سەدهەزار سواری پەنجە بە خوێن لە ڕووباری ئاموویە پەڕییەوە. کاتێک ئالاکانی سەرکەوتن‌نیشانی سێبەری موبارەکیان هاویشتە سەر لێواری مورغاب، عەلیقوڵیخانی حاکمی هیرات پێی‌زانی و حوکمی لە جەماوەری دەوروپشتی کرد کە تێکڕا بخزێنە نێو قەلای شارەوە و ماتەی هەڵگرت. ڕۆژی پێنج‌شەممۆ ٢٧ی مانگی جیمادی دووەم دەشتی سەقسەلمان (سەقسین) و کەلاتەی کاشی بوونە خێوەتگای هێزە هەمیشە بالادەستەکانی خاقان. بۆ بوولێڵەی ئێوارێ لە پاڵەوانانی چاونەترس و پۆلێک لە ئۆزبەکانی بەجەرگ و ئازا هەتا دەروازەی مەلیک ئەسپیان تاو دا و گەلێک سەرسووریان لە خوێنی خۆیان وەردان. بۆ بەیانی لەشکری دنیاداگری لەم سەحرایەوە بنەی گواستەوە بۆ ئۆلەنگی کاروبار و ڕووکاری مەرقەدی تروسکەداری خواجە محەممەدی بۆران و زەوی‌وزاری ئاوایی عەلوار و لەوێ لەنگەریان گرت. دوو ڕۆژان لەو شوێنە زەنوێر و شادی‌هێنە مانەوە. چێشتانی ڕۆژی یەک‌شەممۆی سەرەتای مانگی ڕەجەب کە هەتاوی ڕووناکیدەری جیهان پێنج ڕۆژی لە جۆزەردان هەڵبڕیبوو، خوێندنگای میرزا بوو بە سەراپەردەی پیرۆزی خان. هەر ئەو کاتە داروغە و سەرکار و پاکار و گزیری ناردن بۆ کۆکردنەوە و دەس بە سەرداگرتنی دەغڵودان و بەرهەم و حاسلاتی گوندان. فەرمانی مسۆگەر و بەبڕشتی دەرچوو کە هیچ‌کەس هەقی نیە دەس بەرێ بۆو

هەژار و مسکێن و بەلەنگازانەی کە لەبەر دەسکورتی و بێهێزی لە شوێن و ماڵی خۆیان چورتەیان نەکردووە. بۆ بەیانی لەشکری بەرەو سەرکەوتنی بە دەورەی شار وەربوون و ئاڵقەیان دا و ڕێگای هاتوچۆیان لەسەر گەمارۆدراوان تەنی. ئەمیر قولبابای کۆکلتاش بوو بە بەرپرسی دانانی قەڵاقووچەی گەڕۆک و سەنگەر لێدان و لە بەرامبەر هەر قۆنگرەیەکی شاردا سیپەیان داکوتا و مەتەرێزیان لێدا و تێکڕایان دانە دەس سەرکردە پایەبەرزەکان. عەلیقوڵیخان کە بارودۆخەکەی ئاوا بینی، کاخەزی نووسین بۆ شاعەبباس و مورشیدقوڵیخان و بە تەتەری ئازای خۆشاژۆدا ناردنی بۆ مەشەد و داوای یارمەتی لێکردن. لەبەروەی ئەو کاتە شاعەبباس پتر لە شەشهەزار سواری بە دەستەوە نەبوو، نەیوێرا بچێ و تەمای گرت بەرەو عێراق بڕوا و تێگەڕێ و میران و سەرداران و لەشکرچییانی پرشوبلاوی ئەو هەرێمە کۆ بکاتەوە کە پاشاگەردانی و خانخانی باڵی بە سەرکێشابوون و ڕایانکێشێتە شەڕی عەولاخان و بەرەنگاربوونەوەی. نوورعەلی چگنی بە مەبەستی ڕاگەیاندنی ئەم هەواڵە نارده هیرات و خۆشی خێرا و بەپرتاو وێڕای مورشیدقوڵیخان و زۆربەی سەرۆکان و سالارانی خوراسان بەرەو ئێراق تێپەڕی. ئەمە هەواڵێکی ناخۆش بوو کە لە لایەن شاعەبباسەوە ئاسۆی بێهیوایی دەنواند. چونکە ئەگەر جڵەوی حکوومەتی عێراقی بە دەستەوە گرتبا، خۆ جارێ هەتا ماوەی سێ ساڵان کەس نەیدەتوانی بە دەنگ و هانایەوە بچێ. کاتێک شاعەبباس گەیشتە شانشینی قەزوێن و لەسەر تەختی خانەدانی پاڵی دایەوە، هەموو ڕۆژێ دەستەیەک لە میرانی مەزن و پۆلێک لە خانانی بەرزەجێ دەچوونە خزمەتی بۆ پیرۆزبایی بە دەستەوە گرتنی جڵەوی دەسەلات و خۆیان بە چووکەی دادەنا و نێوچاوانیان وەلاشیپانی تایبەتی حوکماتی دەکرد و لە ژێر سێبەری ئالای سەرکەوتننیشانی کۆدەبوونەوە و سەریان وەبەر فەرمانی دێنا و دەستیان بۆ دەنایە سەرچاوان. هەتا ڕۆژایەکی کە ئیسمیخان و عەلیقوڵیخان،

ئەبووتالبمیرزایان لەگەڵ خۆیان هەڵگرت و لە قەزوێن گەیشتنە ڕایەخڕامووسانی و شاعەبباس بە دنە و فیتی مورشیدقوڵیخان و محەممەدی ساروو سولاغ کوشتنی، تێکڕای سەرۆکان و سەرداران خۆیان دابوویە گەشە و نەشە و برەوی وڵات. بەڵام چونکە ڕێککەوتن لەسەر کوشتنی کەسێک دابی میرانی قزڵباشە و ئەوانیش بۆ نەهێشتنی مورشیدقوڵیخان لێبڕابوون، شاعەبباس بە مەبەستەکەی زانی و هەموو قزڵباشانی خڕکردنەوە و دەستووری دا کە هەرچی سەرۆکی غەیانەتکارە بیگرن. سەرسووران بە کۆمەڵ هێرشیان بردە سەر میرانی سەربزێو کە لەماڵی قورقەمێزبەگی شاملوو لێکهاڵابوون و لەڕێوە مەهدیقوڵیخان، عەلیقوڵیخانی زولقەدر، پیرغەیبخانی ئۆستاجلوو و ئەمیر ئەسلانسوڵتانی ئۆستاجلووی خولەفای ڕۆملوو گیران و بەپێی حوکمی پادشا سزا دران. پۆلێکی تر هەڵاتن بۆ لای خان ئەحمەدی حوکمداری گیلان و خۆیان هاویشتە پەنای.

## ساڵی ٩٩٦ / ١٥٨٧ ـ ٨٨

وەک پێشتر قەڵەمی ڕەوانبێژانە ئاماژەی پێکردووە، لەو ڕۆژیڕا کە عەولاخانی ئۆزبەک گەمارۆی شاری هیراتی دابوو، دەم بە دەم تەنگی زیاتر بە دەورەدراوان هەڵدەچنی و تەنگەی پتر لێ توند دەکردن. هەتا وای لێهات کە زۆربەی دانیشتووان لەبەر تەنینەوەی چلکوچڵیک و گەنیاوی و دەرد و پەتا بەرەو هەرێمی نەمان جەڵە بوون و لاقیان جووت کرد و دوایین هەناسەیان دا. هەر بۆیە پۆلپۆل دانیشتووانی چەند گەڕەک و کۆڵانێک و جەماوەری بازاڕی بە هەزار کوێرەوەری و چارەڕەشی شاریان چۆل کرد و لە ژێر سێبەری سەیوانی پارێزران و هێمنایەتی قاقانی بێوێنە و دادەواندا حەسانەوە. دوای تێپەڕینی نۆ مانگ و بیست و یەک ڕۆژ بە سەر ماوەی گەمارۆدا، بەیانەی هەژدەی مانگی ڕەبیعی دووەم بەرامبەری سەرەتای مانگی ڕەشەمە، پەلێک لە پیاوەکانی سوڵتانزادەی گەورە عەبدولموئمینخان بە مابەینی دەروازەی خۆش و پردی

ئابچەکان (پردی دلۆپان)دا سەرکەوتنە سەر کلاوقووچەیەکی کە چەکدارانی میرزا جانسوڵتان دەیانپاراست. لەو شوێنە دوو سێ سەرسووریان کوشتن و ئەوەندە ڕاوەستان هەتا نیزیکەی دووسێهەزار ئۆزبەکی دڕی خوێنخۆرەوە پێهەڵاچوون و خۆیان گەیاندە سەر شوورەی قەڵا و کردیانە قلیوبلی و چەپڵەڕێزان و کوتان و ژەنینی دەهۆڵ و زوڕنا و لێدانی ئەڵلاهووئەکبەر و لە کەڵەشاخ تووڕاندن. عەلیقوڵیخان کە هەمیشە بۆ یارمەتیدانی پارێزەرانی بورج و قۆنگران بە خۆی و هێزێکی ژێر فەرمانەوە ئامادە بوو، چوو بە هانایانەوە. بەڵام لەپڕ لە لای کلاوقووچەی بابامەحموودیشەوە شیڕەی کەڵەشاخ و قریوەقریو و نەڕەنەڕ و ئەڵلاهووئەکبەری ئۆزبەکان بەرز بۆوە. وەختایەک دیتیان تازە کار لە کار ترازاوە و تەگبیر بار و بواری نەماوە، عەلیقوڵیخان و چەند کەس لە هاوڕێیانی بە سەرلێشێواوی خۆیان هاویشتە نێو حەساری ئیختیارەددین. سپای ئۆزبەک لە هەموو بالانەوە ڕژانە شارەوە و دەستیان کرد بە تالانوبڕۆ و شیری خوێنخۆرەوەیان لە کالان هەڵکێشا و جووقەواریان لە تورک و تاجیک و کۆیلە و ئازاد و لاوەکی و شارەکی و پیر و لاو بڕی.

بۆ بەیانی کە هەتاوی ڕێنوێن و ڕووناکیدەری سەرکەوتن ئالای بەرزی گۆڕانی لە عاسمانی حەوتەمین تێپەڕاند، سوڵتانی جیهانگیری پەرەدەری دین عەبدولموئمینخان لە دەروازەی خۆشەوە بەوپەڕی شان و شەوکەتەوە پێینایە شار. سەرەتا ڕووی کردە مزگەوتی جامیع و ماوەیەک لەوێ لەنگەری گرت. پاشان بەرەو باغی شار بزووت و تۆزێکی پێداگەڕا و لەوێوە ڕووی کردە مزگەوتی جامیع و لەوێوە ڕووی کردە میرخانە کە ماڵی عەلیقوڵیخان بوو و تەشریفی دابەزی. دوای سێ ڕۆژان هاوارهاواری ئامانئامانی عەلیقوڵیخان و هاوڕێیانی گەیشتە پەرپەڕۆچکەی ئاسمان. پۆلێک لە مەزنەمیرانی تایبەتی وەک میر قولبابای کۆکلتاش، میر محەممەدباقیبەگ، میر جولتی و میر

شامحەممەدی هەڵۆچییان وێڕای مەولانای گەورە و سەرتۆپی بلیمەتانی گەلان و جڵەوکێشی فرەزانان مامۆستا ئەبولبەقا چوونە دەرگای حەوشە و عەلیقوڵیخان و هەشتا کەس لە میران و میرزادانی شاملوو هاتنە لایان. ئەم پۆلە پێکەوە ڕوویان کردە خزمەت بارگای عەبدولموئمینخان. لە مابەینی ڕێگادا چەکدارێکی ڕەشۆکی تەماحی کردە مێزەری برای قازی سوڵتانی شاملوو و غاری دایە کە لێیبڕفێنێ. قازی سوڵتان لەبەر چاونەترسی و ئازایەتی خەنجەرێکی لە گورچووی کابرای ئۆزبەک دا و پشووبڕی کرد. بوو بە هەراهەرا و گورەگوڕ و میر شامحەممەدی هەڵۆچییان دەماری بزووت و چاوی لە ئۆزبەکان هەڵتەکاند کە ئانگۆای شاملووان بن و بیانگرن و بیانکووژن. لە چاوترووکانێکا تێکڕای یاران و هاوڕێیانی عەلیقوڵیخان کوژران. ڕۆژی هەینی کە چوار ڕۆژ بە سەر گیرانی هیرات و کوشتار و تالانیدا تێپەڕیبوو، عەولاخان تەشریفی بردە شار و دەستووری فەرموو کە ئۆزبەکان و کارگێڕان و قۆشەنچی دەس لە خوێنڕێژی و داڕووتاندنی خەڵک هەڵگرن و کاریان بە جەماوەری شار و قزڵباشان نەبێ. مزگێنی دادپەروەری و لێخۆشبوون بلاو بۆوە و هەموو ناوچەکانی خوراسانی گرتەوە.

بۆ هەر لایەک بڕوانی سەرکەوتن خۆی دەنوێنێ
گوێ هەڵخەی بۆ هەر بالێ دەگاتێ موژدەی ئەمان
سینەی دەساوێتە خاک تەختی میر لەم بەزمەدا
پێهەڵاچوو پۆپەی تاج، تێپەڕی لە ئاسمان
کەمەندی بەردایەوە گەردوون لە دەوری شیری
زەمانە ژێی کردەوە لە پشتی کوری کەمان

بە کوتەی هێندێکیان فتوایان دا کە ڕەوایە ژن و منداڵی قزڵباشان وەکوو یەخسیری کافران بفرۆشرێن و بە گوتەی دەستەیەکی دیکە مەزنەمامۆستایان بە

کارێکی ناڕەوایان دانا. خانی پەرەدەری دادەوانی فتوای دووەمی وەبەر دڵی کەوت و قەدەغە و قۆرغی لەسەر کڕین و فرۆشتنی دیلانی قزڵباش دانا. خواجە محەممەدموئمین کە ناسراوە بە میرزا ئەرباب، بۆ بژاردنی کوژراوانی هیرات دیاری کرا و دەرکەوت کە لەم نۆ مانگەی گەمارۆدا چوارهەزار کەس تێداچوون. دوای دووسێ ڕۆژان خانی ڕووناکیدەری جیهان لە هیراتەوە هەستا و سەری جڵەوی بەرەو مەشەدی پیرۆز وەرسووڕاند و ماوەی دوو مانگ لە ڕووکاری ئەو شارە بنەی داکوتا. مێرگ و چیمەن و چێنک و دەغڵودان و باغ و باغاتی لێخۆڕایی کردن و بەری لەشکری بەردا. بە ڕێگای ڕووزاباد و سەرەخسدا دیسان چۆوە هیرات و جڵەوی کارسازییەکانی گرینگی حکوومەتی دایە دەستی لێوەشاوەی سەرۆکی پایەبەرز قولبابای کۆکڵتاش و پلەی بەرزەشانی شێخولئیسلامەتی بەخشی بە مامۆستای ڕێزدار ئەبولبەقا. ڕاپەڕاندنی کاروباری شەریعەتی خستە بەر دەنگی قازی محەممەدڕەزا. لە خوێندنگەی میرزایی نوێژی جێژنی ڕەمەزانی کرد و وێڕای تێکڕای سپای سەرکەوتەی تەشریفی گەڕایەوە ئەوبەرڕووبار و بوخارا.

لە ئاخری ساڵدا شاعەبباس لەشکرێکی وەک مار و مێرووی لە ئێراق کۆ کردەوە و بە مەبەستی لێدانی ئۆزبەکان پێی‌نایە ڕکێفی بەختەوە و ڕووی کردە خوراسان. کاتێک لەشکری زۆر و زەوەند و بێئامانی گەیشتە چیمەنی بەستام، لەگەڵ تاقمێک پیلانی دارشت و لە نیوەشەودا هەڵیکوتایە سەر مورشیدقولیخانی هەمەکارە و سەرۆکی تەواوی مەزنانی و کوشتی. پاشان بەرەو مەشەد ئەسپی لینگ دا و کە گەیشتێ لەبەر کەمبوونی خورد و خۆراک و تفاق هێزەکانی گیرۆدەی تەنگەژە و ڕۆژەڕەشی بوونەوە و هەموویان بەم لا و بەو لادا ڕۆیشتن. لەگەڵ ئەمەشدا دەسەلاتی مەشەدی باربووی ئەمەتخانی ئۆستاجلووی کۆشک ئۆغلی کرد و خێرایەکی بە ئامانجی گەڕانەوە لە شار دەرکەوت. پاش برینی ڕۆژەڕێیەک میرزا محەممەدی وەزیری کوشت و میرزا

لـوتفی لـە جێـی دانـا. لـەم باروهەوایـەدا محەممـەدخانی تورکمـان کـارە نالەبارەکانی خۆی لە بیر بردەوە و ویـستی کـە شـوێنی مورشیدقولـیخـان بگرێتەوە و ببێتە پێشەوا و ڕیشسپی قزڵباشـان. لـەم بـارەدا هێنـدەی شـوو لێهەڵکێشا و دایە دەری بێچاو و ڕوویی کە گڕی ئاگری دەرهەڵـبوونی میرانـە سەری کێشا و بە زەبرێکی شیری جەهەردار ئەو کابرا خائین و زاڵمەی لە خاکی نەمان گەوزاند. دەسەڵاتی ئەستەرابادی بەخشی بە مورتەزاقولیخانی پورناک و حکوومەتی قووچانی خەڵاتی بوداقخانی چگنـی کـرد و کۆچـاوکۆچ گەڕایـەوە قەزوێنی پایتەخت.

هەر لەم ساڵەدا فەرهادپاشای سەردار بە نیازی گرتنی گەنجـە و بـەردەع لەشکری دەنگ دا. پاش داگیرکردنـی هەرێمەکـە عێـل و عاشـیرەتی قاجـار و «ئیکرمی دەرەت»ی ڕەپاڵ نان و قەڵایەکی لە گەنجە دروست کرد و حەیدەرپاشای بۆ پاراستنی دانا و خۆی بە تەواوی لەشکری باڵادەستەوە هەڵمەتی بردە سـەر خێڵی قاجار لە «ئەرەسبار». بارگە و بنە و ماڵ و سامانی قاجـار و تێکـڕای هۆبە و هەوار و وەڵساتی قەرەباغی ڕادان و ساف لە ساف تاڵانی کردن. پـاشان حەسەنپاشای خادمی وەک خـاوەندەسـەڵات لـە شـیروان دانـا و گەڕایـەوە زستانەهەواری عەرزەڕۆم.

## ساڵی ۹۹۷ / ۱۵۸۸ ـ ۸۹

لەم ساڵەدا فەرهادپاشای سەردار خدرپاشای میریمیرانی ئێرەوانی لەسەر داوا و تکای خەڵکی ناوچەکە نارد بۆ گرتنـی مەڵـبەندی نەخجـەوان. کاتێـک خدرپاشا بەرەو ئەو باڵـە کـشا تێکـڕای جـەماوەری خـوار و ژوور سـەریان وەبەرهێنا و قەڵایەکی پتەوی لە کۆشکی بەلبان بنیات نا و ئـەو سـەرزەمینەی خستە ژێر چۆکی.

لە درێژەی ڕۆژگاردا عەبدولموئمینخان شاری بەلخی بە مەبەستی گرتنـی مەشەد بەجێهێشت و سەرەتای مانگی جیمادی دووەم لە ڕووکاری ئەو شـارەی

دەڵێي بەهەشتە ڕكێفي موبارەكي بەتاڵ كرد. هەر لەڕێوە فەرماني گەمارۆی دا و ئۆزبەكاني توورە و تۆسن و ڕقئەستوور كەمەنديان هاويشتە بەژني قەڵای و دوای چوارمانگان بە كەڵەزەڕی و دەستی زۆر گرتيان. تورك و تاجيك بە لەپەشيران قەڵتوبڕ كران و ئەمەتخاني حاكم وێڕای دەستەيەك لە سەيداني وەجاخزادە و ماقووڵ پەنايان بردە بەر مەرقەدی پاكي ئيمام ڕەزا و لەوێش دەستيان لە يەخەی نەكردنەوە و ڕوحميان پێنەكردن و هەموويان كوشتن. تەواوی كەلوپەل و شمەك و چراچلوورە و كتێب و نووسراوەكاني ئەو بارگا مەلائيكلانەيان تاڵان كرد و هەرچي ڕايەخ و مافوورە و قاپ و قاچاخە گەسكيان لێدا و برديان. گەلێكيان خاوخێزاني مسوڵمانان بە ديل گرت و عەبدولموئمينخان ڕاگرتن و پاراستني ئەو شوێنەی خستە سەر شاني يەكێك لە ميراني سەر بە خۆی و زاڵ و سەركەوتە گەڕايەوە بەلخي گومبەزی ئيسلامەتي.

## ساڵی ٩٩٨ / ١٥٨٩ ـ ٩٠

لەم ساڵەدا شاعەبباس كەيخودای ناردە لای فەرهادپاشای سپاسالار و تكای ئاشتي و پێكهاتني لێكرد. كاتێك ڕاسپاردەكەی گەيشتە خزمەت سەرداری چەشني گەردوون بەشان و شەوكەت، وايان قەرار دانا كە شاعەبباس، حەيدەرميرزای برازای بنێرێتە ئاستانەی بەهات و هەلي سوڵتان مرادخان و تازە لەوەی بەولاوە ساڵمەخەتەی نەكا و پێ لە جەغزی گوێڕايەڵي نەباتە دەرەوە هەتا دەرگا و دەروازەكاني ئاشتي بكرێنەوە. هەردك لا بەم قەرار و بڕييە ڕازی بوون و لەو ڕۆژەوە لەشكری عوسماني كەوشەني قەڵەمڕەوی عەبباسيي هەڵنەبواردووە. شاعەبباس بەم لانە حەسايەوە و ئۆخژني بە دەروونيدا گەڕا و سەبارەت بە بڕانەوەی دوژمنايەتي خونكاری ئەو وڵاتە سەنيری خاترجەمي وەژێر سەری دا.

پاشان شاهەباس خۆی خۆش كرد لە سەركوت و چزاندني ياقووبخاني زولقەدری حوكمڕاني شيراز كە ڕێگای لاڕێيي و سەربزێوی وەبەرداببوو. بە غار و ڕكێفكوت بەرەو شيراز ئەسپي تاو دا و كاتێك ياقووبخان بەم هەواڵەی زاني

خۆی هاویشتە نێو شوورەی قەڵاتی ئیستەخری شیراز و دەرگای گاڵە دان و ماتەی هەڵگرت. پادشا لە شیراز بنەی دانا و هەر خۆشی شلوێ نەکرد. دوای دوو مانگان فەرهادخانی میریمیرانی خۆی ناردە سەر یۆسفبەگی ئەفشاری حاکمی کرمان کە ئەویش هەدای نەدەدا و گرتی. یاقووبخانیشی بە دڵدانەوە و وەبەرهەڵخوێندن لە قەڵا دەرکێشا و هێنایە شیراز و ڕۆژێکی لەناکاو بە خۆی و سی کەس لە یاران و دەسوپێوەند و میرزادەکانی زولقەدرەوە تاقی لێبڕین. لاشەکانی لە مەیدانی شاری شیراز بە دارەوە هەڵواسین و چی کاروباری گرینگی شیراز و کرمانە هەمووی ڕێکخستن و بەرەو ئێراق بزووت. کاتێک گەیشتە ئیسفەهان تەهماسبمیرزا و ئەبووتالیبمیرزای کوێر کردن و ئەم دوو برایەی خۆی ناردنە قەڵای هەڵەمووت. پاشان پیاوی ناردە لای خان ئەحمەدی حاکمی گیلان و داوای ئەو سەرۆک و سەردارانەی کردەوە کە پێشتر لە ترسانی ڕەویبوون. خان ئەحمەد بەو مەرجەی پادشای خاوەنشکۆ لێیانخۆش بێ میرانی ناردە بەر دەرانەی دەسەلاتی فەرمانڕەوا. کاتێک کاروانی سەرداران لە قەزوێن نیزیک بۆوە، پیاوی بەرەوپیری ناردن و محەممەدشەریفی ئۆستاجلووی کچەزای مەعسوومبەگ و مەهدیقولیبەگی کوڕی تالش هەمزە کە سەرجەڵلەی ئەم تاقمە بوون وێڕای هاوڕێیانیان کوشتنی و کەلاکی هەردووکیانی لەسەر پشتی وشترێکەوە هەڵواسین و هێنانی بۆ نێو شار. خان ئەحمەد بەم ڕووداوە خەم و دەرد دایگرت و دڵی شکا و دەستی کرد بە ملانە و کەڵەوەکێشی لەگەڵ شاعەبباس. لە کلکەی ساڵدا شاهەباس فەرهادخانی بە مەبەستی ڕۆمرکاندنی ئاژاوەی ئۆزبەکان بەرەو خوراسان گاڵ دا و ئەویش بێئەوەی هیچی بۆ بکرێ هەتا کەوشەنی نەیشابوور ڕۆیی و گەڕایەوە.

## ساڵی ٩٩٩ / ١٥٩٠ ـ ٩١

سەرەتای ئەم ساڵ عەولاخان بە خۆی و بە لەشکرێکی وەک لێزمە بارانی هەوری مانگی نیسان، نەخێر چەشنی سێلاوی بەلرفە و هوولەی بەهاری لە

هەرێمی ئەوبەرڕووبارەوە بە نیازی گرتنی خاکی خوراسان مامزەی لە یەکسمی ئەنگاوت. لە ماوەی سێ مانگاندا ناوچە و مەڵبەندەکانی نەیشابوور، سەبزەوار، ئیسفەراین، موحەوەلات، توون، جەناباد، قاین، تەبەسی گیلەکی، فەرە، سیستان و هەزارەی گرتن و گەڕایەوە هیراتی شانشین. ماوەی مانگێک لەوێ بە خۆشی و شادی و کامەرانی ڕایبوارد و پاشان ئاڵای گەڕانەوەی بەرەو ئەوبەرڕووبار هەڵدا.

هەر لەم ساڵەدا فەرهادپاشای سپاسالاری ڕۆم، هەیدەرمیرزای کوڕی سوڵتان هەمزەمیرزا کە شاعەبباس وێڕای مەهدیقوڵیخانی چاوەشلی ئۆستاجلوو ناردبوویە بارەگای بەرزی سوڵتان مرادخانی جێگرەوەی «جەم»، لە ئەرزەڕۆمەوە هەڵیگرت و بردی بۆ ئیستانبووڵ و بە لوتفی میرانە و مەرحەمەتی پادشایانە لاوێندرایەوە و پلەی بەرزی وەزارەتی باربوو کرا. سوڵتان حەیدەرمیرزاشی خوێندەوە و بە گۆشەنیگای میرانە بە سەری کردەوە. گەلێکی دەستی ڕێز لێنا و فەرمووی هەرچی پێویستە بۆی دیاری بکرێ و مانگەومانگ بدرێ بە غولامانی و خۆشی بێپسانەوە هەر لە ژێر پێچکەی جێ پشت و پەنای پادشایەتیدا بحەسێتەوە. مەهدیقوڵیخانی زۆر چاک وەرگرت و بە کاوی دڵی خۆی ئیزنی گەڕانەوەی درا. دیارە گەیشتنەوەی مەهدیقوڵیخان بۆ خزمەت پاشا و کوژرانی یەک بوو.

شاعەبباس لە مەودای ساڵدا بەرەو یەزد و ئیسفەهان ڕۆیی. دوای سێ مانگان بە نیازی چوونە زیارەتی مەرقەدی باپیرەگەورەی جێبەرز و خانەدانی کە شێخ سەفییەددینی ئەردەوێڵییە تەشریفی ڕووی کردە ئازەربایجان. دوای ئەنجام دانی زیارەت و بەخشینەوەی نەزر و خێر و خێرات چەند ڕۆژێک لە قزڵئاغاجی تالش کەوتە ڕاو و سەیران و گەڕایەوە قەزوێن. لەوێ هەستی بە دژایەتی و کەلەوەکێشی خان ئەحمەدی گیلان کرد و بە ئامانجی هەڵکێشانی ڕیشەی خانەدانی پێی نایە ڕکێف. خان ئەحمەد بە بیستنی ئەم هەواڵە سامناکە

رووی کردە باڵی لەنگەروود و شالاوەکە وەختایەک گەیشتە سەری کە بە یارمەتی حیسامەددینی لەنگەروودی وێڕای چەند کەسێک و بڕێک هەوڕ و هاڵی زێوین و مافوورە سواری لۆتکەیەک کرا و بەرەو شیروان ڕۆیی. حەسەنپاشای وەزیر کە بۆ پاراستنی ئەو مەڵبەندە دیاری کرابوو، گەلێکی ڕێز بۆ دانا و بە خێری هێنا و بردی بۆ شەمماخی و چۆنیەتی ڕووداوەکانی بە پێچکەی بەرزی تەختی پیرۆزی فەرمانڕەوایەتی ڕاگەیاند و وڵام هاتەوە کە هەرچی زووە خان ئەحمەد بنێرنە بارگای بەهات و هەلی میر. خودی شاعەبباس چووە گیلان و ئەو مەڵبەندەی خستە ژێر دەسەڵاتی و جڵەوی پاراستنی دایە دەس پیاوانی باوەڕپێکراوی و گەڕایەوە ناوەندی شان و شکۆی.

## ساڵی ١٠٠٠/ ١٥٩١ـ ٩٢

سوڵتان مرادخان لەم ساڵەدا فەرهادپاشای لێخست و پلەی مەزنەوەزیرایەتی بەخشی بە سیاوەشپاشا.

لە بۆسنە حەسەنپاشای میریمیران بەپێچەوانەی بەڵێن و پەیمان لەگەڵ کافران جووڵایەوە و شەڕیان لە مابەینیدا هەڵگیرسا. سەرەتا کافر شکان، بەڵام دواتر نەوەستان و هێرشیان بردە سەری و وێڕای دەهەزار کەسی مسوڵمان قەڵاچۆیان کرد کە پێنجهەزاریان سپای ڕۆملی بوون. ئیتر لەو ڕۆژەوە ئاشتی و ئارامی لە خاک و هەرێمی ڕۆملی لە شەقەی باڵی دا و فڕی و گێرە و کێشە و ئاژاوە شاپەڕی هەڵدا.

شاعەبباس بە مەبەستی لێدانی عەبدولموئمینخانی کوڕی عەوڵاخان کە گەیبوویە سنووری جاجەرم لە قەزوێن دەرکەوت و گەیشتە چیمەنی بەستام. عەبدولموئمینخان خۆی لەبەر نەگرت و بەرەو نەیشابوور ڕۆیی. شاهەباس کەوتە شوێنی و هەتا سوڵتان مەیدانی دامغان کوتای، بەڵام دواتر لە رووی پارێزەوە گەڕایەوە و ئیسفەراین و سەبزەواری گرتن و کۆمەڵێک لە سەرکردەکانی بۆ پاراستنی دانان و هاتەوە قەزوێن. لەم جەنگەدا خاوەنشکۆ

بیستی کە کۆمەڵێک لە گێچەڵبازان و لاتەوپاتەی گیلان کەوتوونە سەربزێوی. هەربۆیە فەرهادخانی لەگەڵ حوسێنبەگی شاملووی سەرهێز بەرەو ئەو مەڵبەندە گاڵ دا. فەرهادخان شیری ڕووتی جەوهەرداری لێهەژاندن و دەستی لێنەپاراستن و کەتن و ئاژاوەی داکووژاند. میر هەمزەبەگی کوڕی بایندورخانی تالش حوکمڕانی ئاستارا بوو کە باوکی بە زیندیسەری خۆی جڵەوی حکوومەتی بنەماڵەی دابوویە دەستی. فەرهادخان لەبەر کۆنەقین و دوژمنایەتی سەردەمی دراوسێیەتی لەگەڵ بایوندورخان، هەلەکەی بە لەبار زانی و گەلێکی تۆمات بە هەمزەخانەوە هەڵبەست و بەپێی ئاماژەی شاعەبباس پەلاماری ئاستارای دا و باوک و کوڕ خۆیان لەبەر ڕانەگرت و هەڵاتن و وڵاتیان بەرەو بەغدا بەجێهێشت. فەرهادخان، ئیرەجخانی کوڕی هەمزەخانی لەگەڵ تەواوی براکانی وەچنگ هێنان و قەڵاچۆی کردن. باوک و کوڕیش لە تاوان لە خاکی ڕۆم گووجیان هەڵێنا و دڵیان تۆقی و سەریان نایەوە.

## ساڵی ١٠٠١ / ١٥٩٢ ـ ٩٣

عەولاخانی ئۆزبەک لەم ساڵەدا باسکی لەخۆڕادینی هەڵماڵی و بڕیاری پەلاماردانی خارەزمی دا و پێینایە ڕکێفی بەختەوە و تەواوی ئەو خاکەی داگیر کرد. زۆربەی شازادەکانی هەرێمەکەی گرتن و کوشتنی. حاجمخان و نوورمخانی کوڕی کە حوکمڕانی وێندەرێ بوون بە هەزار ناری عەلی خۆیان لە گیران و نەمان ڕزگار کرد و بە ڕێگای ئەستەرابادا ڕەوین و گەیشتنە خزمەت شاعەبباس. عەولاخان میرانی باوەڕپێکراوی خۆی لەوێ دانان و هەوساری دەسەڵاتی خستنە دەستی و گەڕایەوە.

هەر لەم ساڵەدا سوڵتان مرادخان، سیاوەشپاشای لە پلەی وەزارەتی باڵاوە سەرەوخوار کرد و سنانپاشای لە جێی دانا و فەرهادپاشای بە وەزیری دووەم دیاری کرد. سنانپاشای کردە سەرکردەی هێزە نەبەزەکانی و ناردی بۆ ڕۆملی و فەرهادپاشای وەک بریکار دانا کە لە بارگای بە هات و هەل خەریکی

ڕێکخستنی کاروباری جەماوەر و دابینکردنی نیاز و پێداویستییەکانی گەورە و گچکە بێ. سنانپاشا بەپێی فەرمانی بێسێودووی فەرمانڕەوا بە لەشکرێکی زۆر و زەوەندی زیاتر لە گەڵای داران و خیز و چەوی بیابان بەرەو سنووری بوودین بزووت و قەڵای سەخت و ئەستەمی «قومران»ی کافرانی بە هێزی شان و باهۆی چەکدارانی گرت. پۆلێک لە مسوڵمانانی دانا بۆ دژداری و پاراستنی وڵاتەکە و سەربەرز و سەرکەوتە تەشریفی گەڕایەوە لەشکرگا و زستانەهەواری بێلگراد.

ساڵ چی وای بە بەرەو نەمابوو کە شاعەبباس هرووژمی بردە سەر شاوێردیخانی حاکمی لوڕستان لە خوڕڕەمئاباد. حاکم باشاری نەکرد و تابشتی بەربەرەکانی نەهێنا و خاک و وڵاتی بەجێهێشت و بۆی دەرچوو. شاعەبباس، مەهدیقوڵیخانی شاملووی لە شوێنی دانا و دەسەڵاتی لوڕستانی دایە و خۆی گەڕایەوە پایتەخت.

## ساڵی ١٠٠٢ / ١٥٩٣ ـ ٩٤

لەم ساڵەدا عەبدولموئمینخان بە تووڕەیی و ڕق و قینەوە هەڵیکوتایە سەر قەڵای سەبزەوار کە شاعەبباس لە کاتی هێرش بۆ سەر خوراسان لێی داگیر کردبوون. میر لە ماوەیەکی کورتا بە چیڕەچیڕ قەڵاکەی گرتەوە و شیری ڕووتی بێبواری تێنان و گەورە و بچووک و ورد و درشتی قەڵتوبڕ کردن و نێرەوەز و مێیەوەزی لێبڕین و پاشان سەری جڵەوی گەڕانەوەی بەرەو بەلخ وەرسووڕاند.

هەر لەم ساڵەدا غازی گرایخانی تاتار و سنانپاشا لێیان بوو بە نێوانناخۆشی. پوختەی مەبەستەکەش ئاوایە کە گیرانی قەڵای قومران و هەڵبەسترانی پرد لەسەر ڕووباری «توونە» و بەزاندنی کافران و شکاندنی ورەیان دەگەڕایەوە سەر ئازایەتی و لەخۆبووردوویی سپای تاتار و گەلێک خزمەتی جێیپەسند و بەرچاویان ئەنجام دا. لەگەڵ ئەمەشدا بە دابی تاتاران هەڵیانکوتایە سەر وڵاتی ئەردەڵ و تاڵانیان کرد و دەسکەوت و پاشکەوتێکی

زۆریان هێنایە نێو قۆشەنی بێبەرگێڕەوە و لەشکری سەرکەوتە بە سەر تێری و تەسەلی و حەسانەوەدا کەوت. غازی گرایخان لە بەرامبەر ئەم خزمەتانەدا دەیهەویست سپاسالار بیخوێنێتەوە و بە سەری بکاتەوە، بەڵام بەپێچەوانە سنانپاشا کار و چالاکی و پیاوەتییەکانی خانی تاتاری خستە پشتگوێی و هەموو خزمەت و ئازایەتییەکانی ئەوانی بە ناوی محەممەدپاشای کوڕی خۆی کە میریمیرانی ڕۆملی بوو بە پێچکەی تەختی پێشەوای جێپشت و پەنای ڕاگەیاند. غازی گرایخان (گیرایخان) بەم هەڵوێستەی زانی و وێڕای دەستەیەک لە مەزن و ماقووڵان چۆنیەتی کەمتەرخەمی و سەرساردی سەرداریان لە کاروباری حکوومەتا بە خزمەت خاوەنشکۆ گەیاند و ئەویش لەڕێوە لە پلەی وەزارەت و سەرکردایەتی وەلای نا و فەرهادپاشای لە شوێنی دانا.

سەرەتای مانگی ڕەبیعی یەکەم شاعەبباس بە مەبەستی گەشت و گەڕان و ڕاو و شکار ڕووی کردە خاکی ئیسفەهان و ماوەی دوو مانگان بە کەیفی خۆی ڕایبوارد و پاشان تەشریفی بەرەو قەزوێن گەڕایەوە. لەوێوە بەرەو ناوچە و مەڵبەندەکانی گیلان بزووت و تەواوی سەربزێوانی زۆر چاک تەمێ کردن و عەلیبەگی حاکمی ڕەشتی گرت و ناردی بۆ قەڵای هەڵەمووت.

## ساڵی ١٠٠٣ / ١٥٩٤ – ٩٥

یەکێک لە ڕووداوە گەورە و کارەساتە ناخۆشەکانی ئەم ساڵە کۆچیدوایی بە داخ و دەردی سوڵتانی جیهان و خونکاری زەمان سوڵتان مرادخانە کە پێنووسی شیکەرەوەی نووسەران و زمانی نووسین و گێڕانەوەی باشقەڵەمانی دەم و ڕاوێژپاک لە خستنەڕووی چۆنیەتی بارستایی ژان و ئێش و نەهامەتییەکانی ئەم ڕووداوە، لەنگولۆر و تاساو و چەواشەن. بەڵێ یەزدانی بە توانای نەمرینی بانیسەر وای لە چارەی نووسیبوو کە دوای تێپەڕینی بیست و یەک ساڵ بە سەر فەرمانڕەوایەتی بێگرێ و لەمپەریدا، ڕۆژی سێشەممەی شازدەی مانگی جیمادی یەکەم لە قوستەنتەنییەی پایتەخت شابازی

ڕووحی بەهەشتەلانی ئەو پادشا جیهانپەنایە بەرەوپیری ئەم بانگاوازەوە بفڕێ کە گازی دەکا: «تۆش ئەی گیانی لە خەم ڕەخسیوا بــە دڵخۆشــی بچــۆوە لای پەروەرندەت؛ چون ئەوت لە خۆ ڕازی کرد.»[1] تیـشکەی ترووسـکەداری خــۆری بەشان و شەوکەتی کە دنیایەک لە ژێر گزینگی ڕووناکی بەخشندەیی ئــەوا بــە خاترجەمی و ئاسوودەیی پاڵیان دابۆوە، بەرەو کەلی ئــاوابوون تلــی و (ئــەم چارەنووسەی لێوەدیهات کە دەڵێ): «لە هەر کوێ بن، مردن دەتاندۆزێتەوە.»[2] جاڕنامەی ژیانی خونکارێکی خاوەنشکۆ کە جیهانێک لــە ســایەی نێــوەرۆکی دادپەروەرانەی‌دا ژیانی بە فەرعانی تێپەڕ دەکرد بە حوکمی ئەم فەرمانە داکووژا کــە نــووسی: «هەر کێ ژینی لەســەر زەمینــە، نامێنــێ.»[3] قرمــەقرمی تەپــڵی دەسەڵات و مەزنایەتی ئەو پادشایەی کە شانی لە شانی جەمشید دەدا و هەموو بوولێڵەی ئێواران و کازیوەی بەیانان مزگێنی سەرکەوتنی لە وڵات و هەرێمان‌دا دەنگی دەدایەوە، بەجارێ کپ بوو.

تەختی حوکمــاتی ئەگــەرچی ڕۆیــی هــەتا ئاسمــان
بەڵام سەرەنجام بەرەو گۆڕیچەی بــردن نــوێنوبــان
هێلانەی لەشــی ئەجــەل داماڵــی و ڕووحــی بــردەوە
لە بان تەختەوە بــۆ تەختەتــەرمێ شــۆڕی کــردەوە
یەکــەم جــار نیــە کــەوا ڕۆژگــار کــاری وا دەکــا

---

١ - « یا ایتها النفس المطمئنة ارجعی الی ربك راضیة مرضیه »، قورئانی پیرۆز، سوورەی فەجر، ئایەتی ٢٧- ٢٨، ل ٥٩٤، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار... .

٢ - « اینما تکونوا یدرککم الموت »، قورئانی پیرۆز، سوورەی نیساء، ئــایــەتی ٧٨، ل ٩٠، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار... .

٣ - « کل من علیها فان » ، قورئانی پیرۆز، سوورەی ڕەحمــان، ئایــەی ٢٦، ل ٥٣٢، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار... .

چەرخی دەسووڕێ و خەڵک دەهاڕێ و تۆز بە با دەکا
نە کـەس دەتوانـێ دمم بکاتـەوە و ورتـەی لێوەبـێ
نە خۆی لـە داوی خـەم پێـدەردەچێ کاتـێ پێوەبـێ

قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئەو سوڵتانە بەهەشتەلانە لە هـەرێمی حەبەشـەوە دەس پێدەکا و دەگاتەوە یەمەن، حیجاز، یەسریب، لێواری دەلیـای عومـان، بەسرە، لەحسا (ئەحسا)، بەغـدا، نەهاوەنـدی عێـراق، تـەورێز، زۆربـەی مەڵبەندەکانی ئازەربایجان، ئەرمەنستان هەتا کلکەی شـیروان کـە سـنووری دەربەندی دەموور قەپوویە. هەروەها وڵاتی گورجستان، باڵی باکووری قولزومی کەفە، ئەزاق، ئاقکرمان، ئەنکرووس، بوودین، تۆمشوار کە کەوتۆتە سـەری ئەوسەری خاکی ڕۆملی، قەرەبوغدان، لێهـ، چێهـ، ئەردەڵ و مەجاری سەرپاک بە دەستەوە بوون. بەڵام دیسانیش چاوی بەم وڵاتە بەرفرەوانە پڕ نەدەبوو کـە زیاتر لە هەزار فرسەخ درێژ و پتر لە شەشسەد فرسەخ بەرینی دەنواند. کەچی لەو جەنگەدا کە دەیهەویست خاکی مەجار (مەجارستان) و ئەردەڵ بگرێ و توند و تیژ هەڵدەزووڕا، دڵی لەم جیهانە بێدەرەتانە ئێشا و قنیاتی کرد بە سێ گەزە خاک و تاج و تەختی گەوهەربەندی وەلانا. کۆمەڵێک لەشکری تێـر و تـەیار و گەلێک خەزێنەی دارماڵی زێڕ و زێـوی کـە لـەوەتی ئیـسلام داهـاتووە هـیچ فەرمانڕەوایەکی بەشان و شکۆ بە خۆیەوە نەدیوە، هەمووی بەجێهێشتن.

بێ بڵێ کە فەرەیدوون لە مـاڵ و پلـەی دنیـا چـی بـرد؟
بێ بڵێ کە ئەسـکەندەر لـەم جیهانـە چـی وەبەرکـەوت؟
ئەویان بۆ کەسێکی تر هەوڵی دەدا و خەزێنـەی پـڕ کـرد
ئـەمیان وڵاتـی بـۆ یـەکی دی گـرتن و وەدەرکـەوت

پاش کۆچی‌دوایی پادشای خاوەن‌بەزیی و خاقانی بەسام و شەوکەت، میری هاوشانی ئەسکەندەر، ئەبولموزەففەر سولتان محەممەدخان کە یارەببی خودای مەزن لە دەرد و بەلای لابەلای ڕۆژگاری بپارێزێ، لە تەمەنی بیست و هەشت ساڵی‌دا بە پشتیوانی دایکی لە مەغنیساوە پێی‌نایە کەشتی و گەیشتە قوستەنتەنییە. ڕۆژی هەینی بیستی مانگی جیمادی یەکەم، بە پێ‌وقەدەمی پیرۆزەوە بەڕێزیان لە جێی باوکی ڕۆنیشتە سەر تەختی خونکاری. تەرمی باوکی بەرزەشانی کە چوار ڕۆژ بوو لە خەڵک شاردرابۆوە، وێڕای نۆزدە جەنەدەک و دارەمەیتی براکانی[1] کە هەر ئەو ڕۆژە کوژرابوون، هێنایاننەدەر و لەگەڵ تێکڕای مامۆستایان و زانایان و وەزیران و پیاوماقووڵان نوێژیان لەسەر کردن و لە پەنا مزگەوتی ئەیاسۆفییە، لە تەنیشت گۆڕی باوکی هێژای کە سولتان سەلیم‌خانە و یاخوا بارانی ڕەحمەتی بە سەردا ببارێ، ناشتیانن. سولتان مرادخانی بەهەشتی چل و دوو ساڵ ژیا و بیست و یەک ساڵی حکوومەت کرد.

بەرەبەری برانەوەی ساڵ سولتان محەممەدخان هەر بە داب و دەستووری سەردەمی بابی فەرهادپاشای لە پلەی بەرزی وەزارەت هێشتەوە و کردی بە سەرکردەی هێزە باڵادەستەکانی عوسمانی و ناردی بەرەو ڕۆملی. بەڵام چونکە لەوێ زۆری خۆ بە کاروباری سەرکردایەتی لەشکرەوە ماندوو نەکرد، کافر پەلاماری خاکی ئیسلامیان دا و قەڵای ئێستەرغوون[2] و چەند شوورە و حەسار و ناوچە و مەڵبەند و شارۆچکەی دیکەیان دایە بەر گوڕمی تاڵانوبرۆیان و هەتا شارەدێی ئوورسچووک تێڕاچوون و زۆریان سووکایەتی بە سەر شانی

---

١ - سولتان مرادی سێهەم بیست کوڕی لە پاش بەجێما کە محەممەدی سێهەم لە هەموویان گەورەتر بوو. بەپێی یاسا براکانی خنکێندران. (مێژووی عوسمانی، ب٣، ل٨٦).

٢ - اصطرغون = اسطاغیرا، ئێستەرگوون، «ئێستاورۆس»ی ئێستا.

مسوڵمانان هێنا. سوڵتان محەممەدخان لە مەزنەوەزیر غەزری و پیاوی نارد کە بیکووژن و لەڕێوە سنانپاشای لەجێی دانا. دۆستان و یارانی فەرهادپاشا هەواڵی دەرهەڵبوون و فەرمانی سوڵتانیان بە گوێی گەیاند و ئەویش بەرلەوەی سزادەران بگەنە سەری، رایکرد و هاتەوە ئیستانبووڵ. چەند رۆژێکی خۆ شاردەوە بەڵام سەرەنجام میر گرتی و لە بەندیخانەی پەستاوت و دوای چەند رۆژان کوشتی. سنانپاشاش بەرگەی کافرانی نەگرت و شکا و هەڵات و سوڵتان ئەویشی لێخست.

## ساڵی ١٠٠٤ / ١٥٩٥ ـ ٩٦

سوڵتان محەممەدخان لەم ساڵەدا بە هەموو هێز و توانا و ویست و ئاواتی بەرزەفڕانەوە شانی دایە بەر ئاوەدان کردنەوەی وڵات و گەشە و نەشە و ئیرۆیی و تەسەلی جەماوەر. گەلێکی نامەی دادەوانی بۆ ئەوسەرەوسەری دنیا بەڕێکرد و ناوبانگی دادپەروەرانەی جیهانی پڕ کرد. جڵەوی ئەرک و کاروباری قورس و گرانی وەزارەتی دایە دەستی لێوەشاوەی برایمپاشای وەزیر. ئەگەرچی تازە سەرەتای داگیرسانی دەسەڵاتی بەختیارانە و حکوومەتی دەڵەمە و نەبەگەی بوو، بەڵام میری خۆشفەڕ لەبەر پاڵەپەستۆی ئازایەتی و مەردایەتی خۆڕسکانەی سرشتی، بە مەبەستی چوونە خەزا و شەڕی پیرۆز هەنگاوی بەخێروبێری گەیاندە ئاوەزنگی دەسەڵاتی بەهاتی. شان و پیلی بە دۆعای چاووزار رازاندەوە و ئەگریجەی ئاڵای سەرکەوتننیشانی بە پەنجەی شانەی «خودا لە ئازاری ئەوان دەتپارێزێ»[1] داهێنا. لە کاتێکی باش و موبارەکدا کە هەڕەتی شنینەوەی شنەی بۆنخۆشی سەرکەوتن و یاریدەی یەزدانی بوو، لە کۆشکی فەرمانڕەوایەتی ئیستانبووڵ دەرکەوت و وەها فڕی کە بای شەماڵی

---

١ - « فسیکفیکهم اللهُ »، قورئانی پیرۆز، سوورەی بەقەرە، ئایەتی ١٣٧، ل ٢١، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار... .

تەتەری تیژبەز تۆزی ئەسپی خۆشاژۆی نەدەشکاند و مەلی تیژبال لەگەڵ کەحلانی شەماڵپای دنیاتەقێنەوەی جیهانگیری دەرنەدەچوو.

چەشنی سولەیمان زینی کرد شەماڵ
گەیشتە تەختی تیژ بە گاڵەگاڵ
وەکوو کێوی قاف وەکۆی کرد سپا
کە بەرد و ئاسن لەبەر پێی شکا

## ساڵی ١٠٠٥ / ١٥٩٦ ـ ٩٧

لەم ساڵەدا سوڵتانی بێهاوتا بە شان و شەوکەتەوە لە ڕووکاری قەڵای ئاگری (ئاگری ئۆرلاو) کە یەکێکە لە قەڵا قایمەکانی وڵاتی قەراڵی بەدئاکاری «بەچ» لەشکری خست و بنەی داکوتا. ئەو قەڵاتە ئەوەندە بەرزە کە سەری دەگاتە ئەستێران و هێندە سەخت و پتەوە کە لەگەڵ شوورەی گومبەزی پیرۆزەڕەنگی ئاسمان خۆی دادەنێ و ڕادەنێ.

کە بەرداوێژی وی بەردێکی هاویشت و پەڕاندی
لە دوای سەد ساڵ سەری کاروانکوژەی گرت و شکاندی

هێزەکانی ئیسلام بە سەرۆ وەرگرتن لە حکوومەتی خوداداد و پێ سەلمان لە لایەن سوڵتانی مەزنەوەجاخەوە، لە دەورەی ئاگری کۆ بوونەوە و قەڵفەی کەمەندی گەمارۆیان هاویشتە دامێنی. تاقمی تۆپچی و کەنکەنچی کە هەرکام لە کاری خۆیاندا بۆ دەستوبرد و چالاکی سەرتۆپ و تاقانەی ڕۆژگار بوون، سەنگەر و سیپەیان داکوتان و مەنجەنیق و بەرداوێژیان دابەستن و بە زەبری کوچک و تۆپەڵە ئاگری چەشنی هەورەبرووسکەی پەیتاپەیتا بوولەرزەیان

خستە کلاوقووچان و شوورە و دیواری ئەو قەڵا تۆکمە و پتەوەیان وەکوو شانە زەرگەتە و هێلانە مێروو دابێژدابێژ کرد. کافرانی بەدکاری ژووری حەوشە بەناچار دەستیان لە رووحی خۆیان شۆرد و بەوپەڕی تواناوە کەوتنە بەرەنگاربوونەوەی لەشکری بەرەو سەرکەوتن. بەڵام دوای تێپەڕینی بیست ڕۆژ بە سەر گەمارۆدا، سەربزێوانی کەللەڕەقی لاساری نەحاواوەی بێزراو، لە ڕێی وەزیرانی پایەبەرز و فەرماندە هێزەکانەوە کەوتنە لاڵانەوە و پاڕانەوە و پەنایان خواست. شنەی سەرکەوتن و باڵادەستی لە کونەبای خێروبێری پەروەردگارەوە هەڵیکرد و لە باخچۆڵەی دڵی خەزاکەرانی زاڵی سەرکەوتەدا بە تاسکەتاسک خۆی نواند. «دیارە خودا بە مەیلی خۆی هەر کەسێکی خۆی حەز بکا، سەری دەخا.»[1] ڕۆژگار بە ئارەزووی دڵی غازییەکان سووڕا و بەرەبەیانی بردنەوەی گرەوی شەڕ و دوژمنبەزێنی لە ئاسۆی مرادەوە سەری هەڵدا و نەمامی ئاواتی سوڵتانی دڵاوا بەری هێنا و نێوەرۆکی ئەم ئایەتەی کە دەڵێ: «هەر کاتی یارمەتی خودا گەیشتە ئێوە و سەرکەوتن»[2] ڕەنگی دایەوە.

لە ئاسۆوە بەیانەی ڕوونی سەرکەوتن درەوشاوە
شەوی ڕەش بۆ خەنیمان تێپەڕی و باڵی ترووسکاوە

نیزیکەی پێنجهەزار سوارە و پیادەی کافرانی سەر بە هەش بە کزی و لارەملی لە قەڵاتێ وەدەرکەوتن و ویستیان کە بەرەو ماڵ و باوانی خۆیان

---

١ - « والله یوید بنصره من یشاء »، قورئانی پیرۆز، سوورەی ئالی عیمران، ئایەی ١٣، ل ٥١، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار... .

٢ - « اذا جاء نصرالله والفتح »، قورئانی پیرۆز، سوورەی نەسر، ئایەتی یەکەم، ل٦٠٣، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار... .

باژوێن. بەڵام لەبەرووەی لەشکری هەمیشە باڵادەست چەند دیمەن و کار و کردارێکی پێچەوانە و دژی ڕەوت و ڕێبازی ئایینی ئیسلامیان لێ بەدی کردن، غیرەتی دینی ڕووناکیدەر و شەرعی سەرکاروانی پێغەمبەران خوێنی لە دەمارانیدا وەکوڵ هێنان. خۆیان بۆ ڕانەگیرا و لە ئەڵلاهوئەکبەریان دا و شیری دمنەپارێزیان لێهەژاندن و جگە لە چەند سەرکردە و مەزنەپیاوێک نەبێ کە خۆیان وە پەنا پەساری سۆز و سیلەچاوی برایمپاشای مەزنەوەزیر دابوو، هیچکەس لەو گێژاوی مەرگە ڕزگاری نەبوو. قەڵای ئاگری بە تەواوەتی لە ئاکاری چەپەڵ و بیری چەواشە و بڕوای بەراوەژووی جەماوەری پاک کرایەوە. ئەمجار ئایەتی «هەر کە ویستمان شارێک قڕ کەین، دەوڵەمەندە خۆشگوزەرانەکانی وان دنە دەدەین بۆ بەدفەڕی و خراپکاری و لە ئاکاما ئازاریان بۆ واجۆ دەبێ؛ ئەوساکە تێکیدەهاڕین»[1]، خۆی دەرخست و ڕەنگی دایەوە. پاشان سوڵتانی کامڕەوا فەرمانی کەڵتە و دابەسترانەوەی دەرکرد. سنانپاشای بۆسنەوی سپاسالاری تۆمشواری وێڕای دوازدەهەزار سوارە و پیادە دانا بۆ پاراستنی و هەرچی پێویستە لە پاشەکەوت و خورد و خۆراک و چەکوچۆڵ و ئامرازی قەڵاداری بۆی دابین کرد و خەزێنەی بۆ ئاخنی. پاشان سەری جڵەوی بەرەو ناوەندی دەسەڵات و کۆشکی شان و شەوکەتی وەرسووڕاند.

کاتێک هەواڵی هێرشی سوڵتانی دوژمنبەزێن بۆ سەر قەڵای ئاگری دەگاتەوە گوێی میران و پادشاهانی بەچ و ئیسپانیا و قەڕاڵی ڕیم بابا و ئەردەڵ و دووکی فەڕەنگ، لەڕێوە سێسەدهەزار سوارە و پیادە ساز دەکەن و دەیاننێرنە یاریدە و هانای گەمارۆدراوانی قەڵای ئاگری. وەختایەک کۆمەڵی چەپەڵان تەنیا دوو ڕۆژەڕێیان دەمێنێ بگەنە شوێنی ئامانج، بۆیان دەردەکەوێ کە قەڵا کەوتۆتە ژێر

---

١ - « و اذا اردنا ان نهلك قرية امرنا مترفيها ففسقوا فيها فحق عليها القول فدمرناها تدميرا »، قورئانی پیرۆز، سوورەی ئیسراء، ئایەتی ١٦، ل ٢٨٣، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار... .

دەسەلات و ڕکێفی خونکاری وڵاتئەستێن و هۆردووی جیهانپێوی بەرەو پایتەخت دەڕوا. ئەو بەدەوار و چارەڕەشانە دادەپەڕن و بەرەگە لە قۆشەنی خاوەنشکۆ دەگرن و لێی دادەمەزرێن. ڕۆژی هەینی کلکە و بنەبانی مانگی ڕەبیعی یەکەم، سوڵتانی پایەبەرز و سپاسالاری کامڕەوا هەڵدەکاتە سەر کافرانی خاکەسار و قارەمانان و دلاوەرانی شەڕکەر و شێرانی دڕی پەنجەوەشێنی هەردوولا دەگژ یەکتر ڕادەچن. کۆمەڵەی تۆپان کە دەتگوت هەژدیهان و ئاوریان لە زار دەردەپەڕێ لە هەردک سەرانەوە لەگوێن هەورەتریشقە گرماندیان. هەسارەی بارامی شیروەشێن لە سامی دیمەن و ڕووکاری ئەو شەڕگەیە شمشێری فڕێ دا. لەبەر دەسڕێژ و تەمتومانی تفەنگان، هەتاو سێڵەشینەی ئاسمانی چەشنی مەتاڵ بە بەرەوە گرت. هێندەی نەمابوو کە غەزاکەرانی مسوڵمان و دلێرانی تاقانەپەرست شکستیان بە سەر شانیدا بێ و چاووزار و پشووی بێفەڕی کافران بیانگرێتەوە. هێزی خەنیم نیوەی خێوەتەکانی هۆردووبەزیان وەبەر خۆیان دا و لافاوی پیادەی کافران دەورانپشتی تاوڵ و بارگای ئەو پادشا بە دیمەن خۆرەتاوەیان وەکی پۆلەهەسارەی بێفەڕ دەورە دا. بەڵام لەناکاو پارێزەری شەرەفی تەختی بەرزی فەرمانڕەوایەتی، ڕێکخەری کاروباری پلەی پێشەوایەتی، بەوری بێشەی مەیدانداری و شێری چیای بەرەنگاری، خەباتکاری دین سنانپاشای جوغالزادە وێڕای فاتح گیرایخانی برای غازی گیرایخانی تاتار لە باڵی ڕاستی میری نەبەزەوە گوڕمیان بەست و هەڵمەتیان برد. ئەسپی چەشنی برووسکەیان تاو دا و شیری جەوهەرداریان بە خوێنی کافران خستە سەر ڕەنگی یاقووتی دەنکەهەناری و زمڕووتی شمشێریان بە تریفەی سیوەیلی بەختەوەری چەشنی یاقیقی یەمانی سوور هەڵگێڕا. سوڵتانی بەرزەشانیش خەیاڵی پرینگانەوەی بە ناخیدا تێنەپەڕی و ڕکێفی سەرکەوتنی هێنایە جۆلانە و بە هەڵمەتێکی ڕۆستەمانە ئەو تاقمە گلاوەی وەبەر خۆی دا. بە مەزندەی کەسانی وریای چاوتیژ، لە قەننەیەکدا نیزیکەی سەد و بیستهەزار کافری لاپەرەسەن

بوونە چێشتەی شیری بڕندەی وا کە هەوریان دادێنا و بە دەس ئیماندارانی خەزاکەر تێداچوون. پاشماوە و هەزارەزیلەی لەشکری شکستەیان «دەتگوت کەرەکێوی سرک و ڕاکردوون، کە لە ترسی شێر هەڵاتوون».[1] سوڵتانی باڵادەست بە شوکرانەی ئەم سەرکەوتنە گەورە، کەوتە سپاس و پەسن و پێزانینی پەروەردگار. میران و وەزیران و مەزن و ماقووڵان لە ژێر پێچکەی تەختی فەرمانڕەوایەتی کە جێی هاوار و بانگی هەمووانە کۆبوونەوە. سنانپاشا کرایە وەزیری هەرەگەورە و چەند کەس لە خزمەتکاران و جارڕدەران و پاسەوانانی دەرانەی میری کە ناپیاوانە ڕەویبوون، گیران و کوژران. ئەوانەی ئازایانە جووڵابوونە و مەردانە دەستیان کردبۆوە میر هەمووی خەڵات کردن و کەوڵی شانازی بە شانی دادان و بوونە جێی ئێرەیی هاوشان و ئامپاکانیان. نووسەرانی بیروردی ناسک خەیاڵ و بوێژانی پەنجەنەخشینی شیرینکار، بە ڕەوتێکی پوخت و پاراو و لەبار کەوتنە هۆنینەوەی لیزگەی دوڕ و گەوهەری دانستەی سەرکەوتنەکانی و بە شێعر و پەخشان ڕەنگاندیان. کۆمەڵی تەتەری تیژباڵی چەشنی مانگ و ئەستێرەی گەڕۆک مزگانی ئەم هەواڵەیان بە گوێی گەورە و گچکەی دوور و نیزیکی هەموو وڵات و هەرێم و ناوچە و مەڵبەندان ڕاگەیاند و دەنگ و ئاوازەی خەزاکانی و پلە و پایەی شان و شەوکەتی سوڵتانی خاوەنبڕشت کە دەسەڵاتی بارتەقای هێزی چەرخی گەردوونە، ئەو سەرەوسەری دنیای تەنییەوە.

دنیا بە دەنگ و ئاوازەی فەرمانڕەوا ڕازایەوە
سەرکەوتنی ساڵەڕێیەک ڕۆیشت و دەنگی دایەوە

---

[1] - « کانهم حمر مستنفرة ، فرت من قسورە»، قورئانی پیرۆز، سووڕەی مووددەسسیر، ئایەتی ٥٠- ٥١.

شادی شابالّی ئەنگاوت لـە نێـو کـۆڕی مـسولّمانان
داتــەپی دلّــی کــافران ســام و تــرس خۆیــان ڕانــان

شوکرانەی خودا دەبژێرم کە پێنووسی نووسینم لە گێڕانەوەی سەربوردەی میران و مەزنانی کوردستان بۆوە و توانی ڕووداوەکانی مەودای سێسەد و شازدە سالّ فەرمانڕەوایەتی خونکارانی خاوەنشکۆی خانەدانی عوسمانیشی بە کورتی بخاتە سەر. قەلّەم ویستی لە کاتێکا پشوو بدا کە هەوالّی داگیرسانی خۆشفەڕی دەسەلاّت و یەکەم گەشت و گەڕانی پادشای چواریەکی جیهانی ژینگەی ئــاوەدان بۆتە تاجی شانازی و بە سەریەوە دەدرەوشێتەوە. بنووس وای بە بــاش زانــی هەتا بەپێی گفت و پەیمانی سەرەتای بەشی دووەم، زۆری لەسەر نــەڕوا و لــە کورتی ببڕێتەوە و وسکوت بە خۆی بێنێ و مۆری بێدەنگی لە دەم بدا. ویستی بە پاڕانەوە بۆ مانەوە و گەشە و نەشەی دەسەلاّتی پادشای جیهانپەنا کە مەبەست لە نووسینی ئەم کتێبە خستنەڕووی باسوخواسی بنە و بنەچەکــەی ڕەســەنی بەرزەوەجاخیانە، کر و نەخشی داکووژێنێ.

ڕەبی خودایا هەر بەختەوەر بــێ ئــەم پادشــایە
لە تاج و تەختی قەت کەم نــەهێنێ هەتاهەتایــە
بە کامــەرانی و بــە شــادمانی تەمــەن باتەســەر
بە تینی تاوی، داری هومێــدی خەلّــک بێتەبــەر
بە تیشکەی خودا سەرسەرای دلّی دەدرەوشێتەوە
تەواوی جیهــان لــە ژێــر نــەقیمی دەحاوێتــەوە

سپاسێکی دوور لە چاونەزێری و چنۆکی بۆ پادشایەکی کە منی خاکــەڕای هەژاری یاریدە دا و سەرەڕای دەسکورتی و بڕنەکردنی بــیری ئالّــۆز و مێــشکی

